# وەڵام بۆ مێژوو

## بیرەوەریەکانی شای ئێران



دەقی تەواو

نوسینی:

**محمد ڕەزا شا پەهلەوی**

وەرگێڕانی: سەعید سەیدی




- **پێناسی کتێب**
- **ناوی کتێب: وەڵام بۆ مێژوو**
- **نوسەر: محمد رەزا شا**
- **وەرگێرانی: سعید سیدی**
- **پیتچن: شاناز موحەمەد**
- **دیزاین: فازیل کەوڵۆسی**
- **ساڵی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٣**
- **شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات**
- **نرخ: ٧٠٠٠ دینار**
- **تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٨٥١) ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە.**

**ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی سایە**




هەر کتێبێک، دەرفەتێکە بۆ ژیانێکی نوێ

ناونیشان: سلێمانی- پشت پاسەکانی تووی مەلیک

تەلاری وشیار قەفتان- نهۆمی ژێر زەمینی - بازاری کتێب

/!#https://www.facebook.com/XanaySaya

Emll:nawandy.saya@yahoo.com

## پێرست

# پێشەکی وەرگێڕ

موحەممەد ڕەزا پەهلەوی لەڕۆژی ٢٦ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٩ لە دایک دەبێت، ساڵی ١٩٣٦ خوێندنی خۆی لە سویسرا تەواو دەکات و بۆماوەی دووساڵیش لەکۆلیژی ئەفسەری لە ئێران درێژە بە خوێندن دەدات، سێ جار ژیانی هاوبەش پێکدێنێت و هاوسەری یەکەمی خوشکی مەلیك فارۆق پاشای میسر دەبێت. دووجار ناچار دەبێت ولات بەجێبێڵێت.

جاری یەکەم پاش ڕووخانی دەسەڵاتی موسەدیق بەهۆی کوودەتایەکەوە کەلە لایەن ئەمریکاوە پشتیوانی لێکرا تاج و تەختەکەی بەدەست دێنێتەوە، جاری دووەم لەئاکامی شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ی گەلانی ئێراندا ، ڕۆژی ١٦ی جەنیوەری ساڵی ١٩٧٩ ئێران بەجێ دێڵێت و پاش ٣٦ ساڵ هەر لەو ڕۆژو مانگەی کە باوکی لە ئەفریقای باشوور کۆچی دوایی دەکات ، ئەویش بەهۆی نەخۆشی شێرپەنجەوە لە تەمەنی ٦١ ساڵیدا و لە ڕۆژی ٢٧ی جوولای ١٩٨٠ دەمرێت و لەمیسر داو لەتەنیشت باوکی بەخاك دەسپێردرێت.

شا پەرتووکی وەلام بۆ مێژووی پاش ڕووخانی دەسەڵاتەکەی نووسیوە. ئەم پەرتووکە یەکەمجار لە ساڵی ١٩٧٩دا بەزمانی فەرەنسی بلاو کراوەتەوە.

شا ئەم پەرتووکەی بە یارمەتی نووسەرێکی فەرەنسی نووسیوە کە ناوی کریستیان می یار- ە وتەنیا ئەو ڕووداوانەی تێدایە کە تا مانگی سپتەمبری ١٩٧٩ بۆ شا پێش هاتووە . بەلام بۆچی شای ئێران ئەم پەرتووکەی بەزمانی فەرەنسی نووسی؟

**ماوەیەك دواتر لەساڵی ١٩٨٠ وەرگێڕاوی زمانی ئینگلیزی ئەم پەرتووكە بەهۆی نووسەری بریتانی (Teresa Waugh) لە لەندەندا بە ناوی بەسەرهاتی شا و لە نیویوركدا بەناوی وەڵام بۆ مێژوو بڵاودەكرێتەوە . لەم دوو پەرتووكەدا فەسڵی پاشكۆیش بەرچاو دەكەوێت و بەسەرهاتەكانی شای تا سێ مانگ پێش مردنی تێدایە.**

**ئەم پەرتووكەی كەلەبەردەست دایە لە وەرگێڕاوی ئەو پەرتووكەوەیە كە لە لەندەندا بڵاوكراوەتەوە. چونكە وڵام بۆ مێژوو لەزمانی فەرەنسیشەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی ، بەڵام لەم وەرگێڕاوەدا وەرگێڕ شتی لێ زیادوكەم كردووە . هەربۆیە خاوەن رایان بەسەرچاوەیەكی جێی متمانە بۆ لێكۆڵینەوەی نازانن.**

**بۆنموونە لەو شوێنەیدا كە شا باسی ئیمامی عەلی و ئیمامی زەمان دەكات ، وەرگێڕی یەكەم خۆی لە وەرگێڕانی بابەتەكە بواردووە.**

**ئەگەر هەمووبەڵگەنامەكان و نووسراوەكان و بیرەوەرییەكانی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی موحەممەد رەزاشا و كاربەدەستانی رژیمەكەی كۆبكرێتەوە، هەمووی ئەمانە بەبێ بوونی وتراو نووسراوەكانی شا نا تەواوە و هەرگیز بەو جۆرەی كە پێویستە نەوەی دوارۆژ سوودی لێنابینێت. لەبەرئەوەی كە زۆركەس شابەسەرچاوەی هەوموونەو شتانەی دەزانێت كە پێشهات و دەڵێن ئەگەر ئەو بەو جۆرەی كە وتی و نووسی وئیشی كرد نەدەبوو، بێگومان مێژووی هاوچەرخی ئێران بە جۆرێكی تر دەنووسرا. هەڵبەت شا جۆرێكی دیكە بیردەكاتەوە و لەدوو تۆی ئەم پەرتووكەدا كۆمەڵێك لە سیفاتە تایبەتیەكانی دەكەوێتەروو . لەهەركوێ باسی دەسكەوت و سەركەوتن و شانازی دەكات ئەوا خۆی بەهۆكاری سەرەكی دەزانیت، بەڵام لەهەر كوێ باسی گرفت وشكست و پێشێلكاری دەكرێت هۆكاری سەرەكی لەدەرەوەو دەور وبەرەكەیدایە. بۆشا گرنگە ئەوانی دیكە ستایشی بكەن، لەگەڵ گەورەپیاوان و سیاسەتمەدارانی جیهان وتوویژبكات و وڵاتانی رۆژئاوا پشتیوانی لێبكەن و خۆیشی بەپەسەندی خوا بزانێت.**

گرنگی ئەم پەرتووکە لەوەدایە کە شا پاش سی وحەوت ساڵ دەسەڵاتداریو رووخانی ڕژێمەکەی نووسیویەتیو دەتوانێت بەرینایی ڕوانگەکانی ئەو سەبارەت بە پرسێن ناوخۆییو دەرەکی دەربخات. لەم نووسینەدا لەهەندێ لەئیشەکانی خۆی رەخنەی گرتووەو پێی لە هەندێ لە هەڵەکانی خۆی ناوە.

لە وەڵام بۆ مێژوودا جگەلەوەی کە هەندێ هەڵەبەم هێمایە(...-و.) لەلایەن وەرگێڕەوە راستکراوەتەوە، هەندێ جاریش راستییەکان وەك خۆی باسنەکراوە، یان رووداوەکان پێشو پاش خراوە بەئەنقەست بووبێت یان نا ، شا خۆی دەزانێت. مێژوو بەشا نانووسرێتو ئەویش میوانی مێژوو بوو. بۆنموونە، سەبارەت بەچاپکردنی پارە لەسەردەمی کابینەی قەوام دا، پەرلەمان سێ جار ڕێگا بە دەوڵەت دەدات کە بۆ پێداویستی ماڵی هاوپەیمانان پارە چاپوبڵاوبکاتەوەو هەرسێ جاریش شا بڕیارەکانی پەرلەمان پەسەند دەکات ، کەچی شا جۆرێکی تر دەینووسێت. یان کاتێك دەیهەوێت باسی کوردستانو ئازەربایجان بکات ، خودموختاری ئەو ناوچانە بە پێشنیاری ئەمریکاو بریتانیا بۆستالین دەزانێت. بەڵام سێر ریدێربولارد ، باڵوێزی ئەوکاتی بریتانیا لە ئێران کە بۆخۆی ئامادەی دانیشتنەکەبووە لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: " بە رەزامەندی ئێران، کومیسیۆنێکی هاوبەش لە ئەمریکاوبریتانیاو سۆڤیەت پێکبێت بۆئەوەی لە پێکهێنانی ئەنجومەنی ویلایەتەکاندا کەلە یاسای بنەڕەتی دا هاتووە ، یارمەتی ئێران بدات". شا نەیدەویست دەنگی گەلانی ئێران ببیسێتو ئەوکاتەیش و یستی زۆر درەنگ بوو.

دڵنیام ئەم پەرتووکە بەسوود دەبێت بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە لە مێژوو دەکۆڵنەوە و دەیانەوێت قووڵتر لە پرسەکانو گۆڕانکارییەکان بڕوانن.

وەرگێڕ

"سەعید سەیدی"

٢٠١٣

## پێشەکی

ئێستا زیاتر لەساڵێك بەسەر بڵاوبوونەوەی دوایین کتێبم دا لەتاران تێدەپەڕێت. کتێبێك لێوان لێو لەهیوا، کەلەودا بڕواو بۆچوون وئامانجەکانی خۆم دەربارەی داهاتووی خەڵکی ئێران دەربڕی بوو. داهاتوویێك کە هیوادار بووم تائەو جێگای کەدەکرێ بەختەوەرو دوارۆژ روون و پرشنگداربێت و شیاوی وڵاتێك بێت کەبە رابردووی چەند هەزارساڵەیەوە،بەردەوام یەکێك لەبنیاتنەرانی سەرەکی شارستانیەتی جیهانی بووە.

پێم خۆشبوو لەبەرەبەری چوونەناو هەزارەی سێیەمدا ئێران ببێت بەوڵاتێکی بەتەواوەتی مۆدێرن، بەمیللەتێکی پێشکەوتوو وکۆمەڵگایەکی گۆڕاوەوە. خەڵکەکەی لەئاستێکی پێشکەوتووی خوێندن بەهرەمەند بن، ئابوورییان پڕ رەونەق بێت و بنەمای دەسەڵاتداریەتیان لە سەردیمۆکراسیێکی راستەقینەو پایەداربێت.

هیواداربووم نەوەکانی داهاتووی گەلی ئێران بەسەربەرزییەوە بتوانن ئەو شوێن و جێگای کەلەناو بنەماڵەی مەزنی مرۆییدا شیاوی ئەوانە بەدەستی بێنن و بتوانن بەشانازییەوە ئەرك و بەرپرسایەتیەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن.

هیواداربووم ئەوسێبەرانەی سەدەکانی ناوەراست کەنیوسەدە پێش لەئاسمانی ئێران وەلانرابوو، بۆهەمیشە لەوڵات دوور بن و رووناکییێك لەئێران بدات کەلەشارستانیەت و فەرهەنگی ئێرانییەوە سەرچاوەی گرتبێت.

لەتەواوی ماوەی پاشایەتیم دا، بەردەوام بۆگەیشتن بەم هیوایە ژیاوم و، دەبێت بڵێم کەئەم هیوایەش لەکۆتاییەکانی دەسەڵاتداریمدا بەرەو بەدی هاتن دەچوو.

بۆگەیشتن بەم ئامانجە، هەوڵی زۆرم داو لەگەڵ کۆسپ و گرفتی زۆر بەرەو روو بوومەوە. ناچار بووم لەگەڵ پیلانگێڕی جۆراوجۆردا– چ لەناوخۆوچ لەدەرەوەی وڵات– بەرەو روو ببمەوە. لەگەڵ کومپانیا زەبەلاحە نێونەتەوەیەکاندا لەکاتێکدا بەرەو ڕوو دەبوومەوە کە زۆرێك لە راوێژکارانم دەیانگوت ئەم کارە نەکەم.
هەڵبەت پێدەچێت لەم ماوەیەدا هەڵە گەلێکم کردبێت، بەلام دڵنیام کەخەباتی دوورو درێژی من هەرگیز لەریزی هەڵەکانم دا نەبووە.
لەم پەرتووکەدا دەمەوێت ئەوە نیشان بدەم کە بۆچی لەڕێگای گەیشتن بەئامانجەکانمدا پێداگریم دەکردو، بۆچی دەمویست کۆمەڵگایەك لەسەربنەمای دادپەروەری کۆمەلایەتی و، نەخەبات وململانێی چینایەتی، بنیات بنێم. کۆمەڵگایەك کەهەمووان لەودا یەکگرتوو ویەکانگیر بن. پێویستە بوترێ کەلەبەرئەوەی لەگەڵ هەموو ولاتانی جیهاندا – چ دونیای رۆژئاوا وچ ولاتانی بلۆکی رۆژهەلات و چ جیهانی سێیەمیش – رێکەوتن و باش لێك گەیشتنم هەبوو، ئەو دەرفەتەم بۆ رەخسا کەبتوانم لەکەش و هەوایەکی پڕلەئاشتی و پێکەوە ژیاندا، هەوڵی خۆم بۆگەیاندنی ئێران بە"شارستانیەتی مەزن" درێژە پێبدەم. لەکۆتاییدا، بەئەرکی خۆم دەزانی کە ئەوەی بخەمەروو کەچۆن میللەتێك دەتوانێت بەرەو نشێوی نەمان بڕوات و چۆن ئەوەی کە بەلوتفی خواوەند و بەهیمەت و هەوڵ و زەحمەتی زۆری میللەتێك بەدی هاتبوو، فەوتا و لەناو چوو، بۆئەوەی شایەتێك بێت لەهەمبەر مێژوودا.

# فەسڵی ١

## وانەگەلێک لەرابردوو

بۆئەوەی مێژوو بەدروستی داوەری بکات پێویستە سەرەتا مێژووی وڵاتەکەمان بناسین و بەتەواوەتی لێی تێبگەین.

ئێران کە وڵاتێکی دێرینە بەرابردووی سێ هەزارساڵ حکوومەتی پاشایەتیەوە، لەماوەی مێژووی خۆیدا هەورازو نشێوی زۆری هەبوەو گەلێك رووداوی خۆش و ناخۆشی دیوە. وەك بڵێیت کەبەرەو روو بوونەوە لەگەڵ مەترسیەگەورەکاندا بەردەوام بەشێك لەژیانی ئەم میللەتەبووە.

هیچ گەلێك ناتوانێت تەنیا لەبەر رابردووی خۆی بژیت و هەروەها ئەگەر گەلێك پەیوەندی لەگەڵ رابردووی خۆیدا نەبێت بێ گومان لەبەریەك هەڵدەوەشێت. ئێران کەلەسەردەمی دەسەڵاتی پەهلەویدا ناوەکەی لە"پێرشیا" وە گۆڕا بۆئێران، مێژوویەکی کەیل لەشانازی و شێواوی و ترس و هیوای هەیە. ئەم بارودۆخە — ئەگەرخوابیهەوێت — دەتوانێت وانەگەلی بەنرخ بێت بۆ نەوەکانی دوارۆژ، تابەکەڵك وەرگرتن لەرابردوو، باشترین رێ نیشاندەریان لەبەردەستدا بێت. هەنوکەمن دەمهەوێت پێش هەموو شتێك ئاورێك لەرابردووی ئێران — کە کەس ناتوانێت خەتی راست و چەپی بەسەردابکێشێت — بدەمەوە.

## لاوازی و بەهێزی پێگەی جۆگرافیایی ئێمە:

ئێران وڵاتێکی دێرینە کەمێژوویێکی دوور ودرێژی هەیە. ئەم وڵاتە لەناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەڵکەوتووە کە لانکی شارستانیەتە مەزنەکانی ڕۆژئاوا بووە و، وەك چوارڕێیانێ بووە کەرێگاکانی پەیوەندی نێوان ئاسیاو ئەورووپا و هەروەها نیمچە وشکاڕۆی هیندو ئەفریقای پێدا تێپەڕبووە.

ئێران لەگەڵ سێ دەریادا هاوسنوورە: دەریای خەزەر لەباکوور، کەنداوی فارس لەباشووری ڕۆژئاوا، کەنداوی عەممان لەباشوور. هەروەها لە دەریای ناوەڕاستیش کەبۆ ماوەی چەندین سەدە ناوەندی دونیای خاوەن شارستانیەت بووە تەنیا بەپانی دوو وڵاتی ئێراق و سوریا دوورە.

هەرلەبەر ئەم پێگە جۆگرافیاییە تایبەتەیەکە ئێران توانی بووی لەقۆناغ گەلێك لەمێژوویدا بەشێوەی دەسەڵاتێکی مەزن دەربکەوێت و لەسەر دراوسێ کانی خۆی لەڕووی فراوانکردنی سنووری وڵات و گەشەی بازرگانی و پەرەبەشارستانیەت کاریگەری دابنێت.

هەروەها لەبەر هەڵکەوتەی لەم شوێنە جۆگرافیاییە تایبەتیەدایە کەئێران تووشی لاوازی بووە. لەبەرئەوە لەدەشتێکی پان و بەریندا هەڵکەوتووە کەلە بەشەکانی باکوور وڕۆژئاوا و باشوور وڕۆژهەڵاتەوە بەدەشتی پان و بەرین و دەشتی خوێیش داپۆشراوە. هەروەها دەشتەکانی لەهەمولایەکەوە بەزنجیرەیەك لەکێوەگەورەکان دەور دراوە: چیاکانی ئەلبورز باکووری وڵاتی داپۆشیوە، چیاکانی زاگرۆس ڕۆژئاوای وڵات و چیاکانی بەلووچستان لەباشووری ڕۆژهەڵاتدا درێژ بووەتەوە.

جگەلە چەند شاری گەورەی (وەك ئیسفەهان و کرمان)، ناوچەکانی ناوەڕاستی ئێران دانیشتوانی کەمەو چۆڵە. زۆربەی دانیشتوان و چالاکی و سامان و فەرهەنگ لەناوچە کەنارییەکانی وڵاتدا چڕبووەتەوە. هەربۆیە، بەدرێژایی سەدەکان پایتەختەکانی ئێران بەزۆری لەوشارانەی دا بووە کەلەناوچەکەنارییەکانی وڵاتدا

هەڵکەوتوون. پێش لەتاران، پایتەختی پاشایەتی ئێران لەناوچە جۆراوجۆرەکانی وەك : شووش، ئەکباتان، تەختی جەمشید، ئیسفەهان و ئەردەبیل (سەردەمی دەسەلاّتی سەفەویەلە ئازەربایجان ) دابووە.

ئێران هەتائێستا چەند جارێك لەلایەن دراوسێکانیەوە پەلامار دراوە و،هەرکام – بەناو دەسەلاّتی خۆیانەوە– بۆماوەیەك ولاّتیان داگیر کردووە. بەلاّم لەو کاتانەیدا کەسەردەمی شکۆ وگەورەیی ئێران بووە، یەکیەتی نەتەوەیی بەردەوام لەپەنای توانایی و تێگەیشتوویی و ئیرادەی قایم و– هەندێ جار– ژێری رێبەرێکدا دابین بووە. لەوسەردەمانەشدا کەولاّت لاواز بووە هەمیشە هێرشی بەردەوامی دەرەکی بە هاوکاری ئاشکراو نهێنی دەستانێك لەناوخۆی ئێراندا رووی داوەو، تاقمێك لەرووی زانین و نەزانینەوە ورێکخراو هاوکاری هێزەپەلاماردەرەکانیان کردووە.

تێڕوانینێکی خێرابەسەر ئەم رووداوانەدا– کەرەنگە ئەمڕۆ وەك، ئەفسانەی لێهاتبێت– دەتوانێت بەتێگەیشتنی مانای قۆناغەجیاوازەکانی مێژوو و رەنگدانەوەی لەسەردەمی ئێستادا، کەبەزۆری بەنەناسراوی ماوەتەوە، یارمەتی بدات .

## پاشایانی بەناوبانگ: لەهەستانەوەی سەردەمی ساسانییەوە تا هێرشی عەرەب:

بەهۆی غیرەتی مادەکان و پارسەکانەوە – کەدووقەومی هێندوئەورووپایی بوون– ئێرانییەکان توانییان دوای دووهەزارساڵ شەڕو تێکۆشان، بەسەرئەو قەومانەدا سەربکەون کەلەسەر دەست بەسەراگرتنی ناوچەی بین النهرین دەجەنگان و،لەوەوە بنەماڵەی هەخامەنشی(٥٥٩تا ٣٣٠پێش زایین) سەری هەڵدا، کەگەورەترین ئیمپراتۆریەتی دونیایان تائەو سەردەمە لە نێوان دەریای رەش تا ئاسیای ناوەراست و هندستان تا لیبیا دامەزراند.

ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی یەکەمین ئیمپراتۆریەتی راستەقینە بوو لەجیهاندا کە لــــەودا تاکێــــك بەســــەرقەومەکان ونەتەوەجیاوازەکاندا حکوومــــەتی دەکــــرد. هەخامەنــشییەکان بۆئــەوەی دەســەڵاتی فــەرمانڕەوایی خۆیــان دابــین ببێــت، بۆهەربەشێك لە وڵات.

کەسێکیان لە ژێرناوی " سا تراپ " دا دانابوو کەدەسەڵاتی پارێزگاری ویلایەتی هەبوو. هەروەها لەشێوازی نوێش بۆپەیوەندی گرتن کەڵکیان وەردەگرت کەجۆرێ تەلگرافی رووناکی بوو کە پەیامەکانی لە وێستگەکانەوە دەگەیاندو لەودا بەهۆی هەڵکردنی ئاگر لەسەر دوندی کێوەکان نیشانە تەلگرافیە کانیان دەگواستەوە بۆ یەکترو پەیامەکانیان بەخێرایی لەم سەر بۆئەو سەری وڵات بەرێ دەکرد.

ئەوان هەروەها سیستەمێکی دراویی رێكوپێك یان دانا ولەکاروباری ژمێریاری‌و سیــستەمی کــێش‌و پێوەرەکانــدا نموونــەوپێوەری نــەگۆڕو جێگیریــان پێکهێنــا. بەمجۆرە بوو کەئێرانییەکان شانشینەکانی سەردەمی دێرینیان فێرکرد کە چۆن وڵاتێکی بەرین بەرێوە ببەن . رۆمییەکان کەسانێکن کە بەشی هەرەزۆری شێوازی حکوومەت کردنیان لە ئیمپراتۆریەتی خۆیاندا لەئێرانییەکانەوە وەرگرت‌و لەزۆر بواردا شێوازی ئێمە یان پەیرەو کرد.

کورش دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشییە، کەبەهەق نازناوی "کبیر" یان لێنــاوە. چــونکە کــورش بنــەڕەتی ئیمپراتۆریــەتی خــۆی لەســەردادپەروەری و تەحەمولی بیرو باوڕی خەڵکانیتر دانا. گەرچی ئەو بەداگیرکردنی وڵاتانیتر سنووری وڵاتەکەی خۆی فراوان دەکرد، بەڵام دەتوانرێت وەك بناغەدانەری پاراستنی مافی مــرۆڤ بناســرێت.چــونکە کــورش یەکــەمین فەرمانڕەوایــە لەســەردەمی دێرینــدا کەجارنامەی ئازادی مرۆڤەکانی دانا و رایگەیاند. ئەو بووبە هۆکاری ئەوەی کە دیلەکانی شەڕ ئازاد بکرێن‌و بۆ نیشتمانی خۆیان بگەڕێنەوە، هەرناوچەیەکی خستەژێر دەســەڵاتی خــۆی رێگــای بەخەڵکەکــەی دا کەلــەداب‌و نــەریتی خۆیــان پەیڕەوی بکەن‌و رێزی بۆ ماف‌و یاساکان‌و باوڕی مەزهەبی ئەوان دانا.

کورش نەتەنیا لە دوژمنانی خۆی خۆش دەبوو بەڵکو هەندێ جاریش متمانەی پێیان دەکردو کارە هەستیارەکانی بەوان دەسپارد. بەمجۆرەش دەردەکەوێت کە بۆچی نازناوی " رزگارکەری قەومەکان " یان بەکورش بەخشیوە. هەڵبەت ئەمە شێوازێکە کەلەگەڵ سیفەتی ئێرانییەکاندا گونجاوەو، هەمووپاشاکانی ئێران وەها سیاسەتێك یان هەبووە. بەتایبەت لەهەلومەرجی پێکهێنانی کەش‌و هەوای ئاشتی خوازانەدا . هاوکات دەبێت بوترێت کە ئێران بەردەوام ولاتێك بووە کە وەك " پەناگە " ناسراوە و،کەسانی هەلاتوو وداواکراو لەولاتانی ترەوە پەنایان بۆ دەهێنا.

کورشی کبیرو داریوش‌و خەشایارشا لەپاشا بەناوبانگەکانی مێژووی ئێرانن، کەلە ئەدەب‌و هونەری ولاتی ئێمەدا پلەیەکی بەرزیان هەیە. ئەورووپییەکان لە پەرتووکەکانی خۆیاندا خوێندویانەتەوە کە داریوش لە " ماراتۆن" و خەشایارشا لە " سالامیس" دا (سالی ٤٨٠ پ.ز) لەلایەن یۆنانییەکانەوە شکستیان خوارد. بەلام بەدەست هێنانی ئەمجۆرە سەرکەوتنە کاتیانە لەلایەن ولاتێکی بچووکەوە لەهەمبەر دەسەلاتێکی مەزن دا نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە ئەورووپییەکان لەبیربکەن کە ئێران لە سالی ٣٩٤ ی پێش زایینەوە تا سالانێکی دوورو درێژ بەسەر ناوچەی دەریای ئێژەدا فەرمانڕەوایی کردووە.

لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی سەرئەنجام بەدیاردەیەکی سەرسوڕهێنەر کۆتایی هات‌و، ئەویش سەرهەلدانی " ئەسکەندەری مەقدوونی " ( لە ٣٥٦تا٣٢٣پ.ز) بوو کەدەستیگرت بەسەر تەواوی ناوچەی ژێردەسەلاتی داریوش دا (جگەلە رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك‌و خوارەزم) و سنووری ناوچەی ژێردەسەلاتی خۆی تانزیك رووباری سەیحون فراوان کرد. ئەسکەندەر جگەلە پێشێلکردنی هەندێ ماف‌و ئەوکارانەی کە بۆ دابین بوونی بەرژەوەندی یۆنان ئەنجامی دان، بەگشتی لەشێوازی داریوش بۆبەرێوەبردنی ولات کەلکی وەرگرت‌و بەدانیشتن لە جێگای ئەو، دەستی بەسەر ئێراندا گرت.

دوای مردنی ئەسکەندەر (١٣ی جونی ساڵی ٣٢٣ پ.ن) ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئەو پارچەپارچە بوو، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوشتەی کە ئێمە لەزۆربەی پەرتووکە مێژووییەکانی رۆژئاوادا دەیخوێنینەوە، ئێران هەرگیز لەرووی فەرهەنگییەوە نەچووە ژێرکاریگەری یۆنان. هەڵبەت ئەمە راستە کەئێمە پەیکەرە سەرنجراکێشەکانی یۆنانمان لەمۆزەخانەکانی خۆماندا دیوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە ئەسکەندەر بوو کە کەوتە ژێرکاریگەری شارستانیەتی ئێرانەوە .

ئەم دیاردەیە گەلێك جار لەمێژووی ئێراندا دووپات بووەتەوە. زۆرجار کە کەسانی تر بەسەرماندا زاڵ دەبوونو دەستیان بەسەرماندا دەگرت، ئەگەرچی ئێرانییەکان پەیڕەوی یان لێدەکردن، بەڵام بەردەوام رەسەنایەتی فەرهەنگی خۆیان دەپاراستو لەرووی فەرهەنگییەوە کاریگەرییان لەسەر هێرشبەران دادەنا.

٢٥٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح پارتەکان دەسەڵاتی ئەشکانییەکانیان دامەزراند، کەنزیکەی پێنج سەدە بەردەوام بوونو سەرئەنجام بەسەرکەوتنی " ئەردەشێر " بەسەر " ئەردەوان " دا سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئەشکانییەکان کۆتایی پێهات. دوای ئەوە ئەردەشێر – کەلەخزمەتکارانی پەرستگەی زەردەشت بوو– دەسەڵاتی ساسانییەکانی پێکهێنا (کەلەساڵی ٢٢٤ تا ٦٥١ ی زایینی بەردەوام بوو) و توانی رووبەری ئیمپراتۆرێتەکەی خۆی لەکەنارەکانی رووباری سێندو سەیحونەوە تا کەنارەکانی باشووری کەنداوی فارس بەرین بکاتەوە. ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان دوو رۆڵی گرنگیان لەمێژووی جیهاندا نواندوە: یەکەمیان سیاسیو دووهەم فەرهەنگی.

بوونی ساسانییەکان وەك پاسەوانانی ئارییایی لەسەر دەروازەی ئاسیا، یەکەمین رێگر بوو کەنەیدەهێشت خێڵە وەحشییەکان یان نیمچە وەحشییەکان لەدەشتو کوێستانەکانی ئاسیاوە پەلاماری رۆژئاوا بدەنو، بەمجۆرە بۆماوەی چەندین سەدە ژیانو سەروماڵی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی وەك: سکاکان، هوونەسپییەکان، سەلجووقییەکانو عوسمانییەکان بەهێزو خوێنی ئێرانییەکان پارێزرا. بەپێچەوانەی ئەم هەڵوێستە هیچکام لەنەتەوە هێندو ئەورووپییەکانی نیشتەجێی

قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەڵاتی ڕۆم قەدرو بەهای ئێرانیان نەزانی و تەنیا لەبیری ئەوەدا بوون لەگرفتەکانی نێوان ئێمەو وڵاتانی ڕۆژهەڵات – کەهەزاران ساڵ بوو لەنێوان ئێران و هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەراستدا هەبوو– سوود وەرگرن.

کاتێکە کۆسپی ئێران هەڵگیرا، لەم ناوچەدا کەشوێنی بەیەك گەیشتنی دووجیهان بوو بۆشاییێك دروستبوو کەسەرەتا لەلایەن عەرەبەکانەوە پڕکرایەوەو دوای ماوەیەك تورکەکان و مەغۆلەکان دەستیان بەسەرداگرت. ئەمجۆرە ڕووداوانە ئاراستەی مێژووی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەورووپا، ڕوسیا، باکووری ئەفریقاو هیندی بەتەواوی گۆڕی.

بەڵام لەرووی فەرهەنگییەوە دەبێت بوترێت کە ڕێنێسانسی ئێران لەسەردەمی ساسانییەکاندا، ڕاست وەك ئەو ڕێنێسانسەی کە ١٢٠٠ ساڵ دواتر لە ئەورووپا رووی دا، جۆرێك گرێدانی فەرهەنگی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو. چونکە بەپێی قسەی باو، شاپووری یەکەم ( ٢٤١ تا ٢٧٢ زایینی) فەرمانیدا ئەو دەقە مەزهەبی و فەلسەفی و پزیشکی و گەردووناسیانەی کەلە ئیمپراتۆریەتی بیزانس و هێندا هەبووە، کۆبکرێنەوەو وەرگێڕدرێن. بەسەرنجدان بەوەی کە دواتر وەرگێڕاوی عەرەبی هەرئەم دەقانەبوو کەلەسەدەی دوازدەیەم بەدوا زانست و فەرهەنگی یۆنانی بە ئەورووپییەکان ناساند. بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە: ئەگەر وەها هەنگاوێك لەئێراندا هەڵنەگیرایێت و ئەو دەقانە نەکراێن بە عەرەبی، ڕەنگە هیچکات لەئەورووپادا ڕێنێسانسێ رووی نەدەدا یان ئەوەی کە ڕێنێسانسی ئەورووپا بەشێوەیەکی بەتەواوی جیاواز رووی دەدا.

## سەردەمی زێڕینی نوێ لە ئێراندا:

لەساڵی ٦٥٢ی زایینیدا ئێران لەلایەن عەرەبەکانەوە داگیرکراو لەدوای ئەوەدەسەڵاتی دەرەکی بەشێوەی حکوومەتکردنی خەلیفەکانی بەغدا بەسەرئێراندا

بۆچەند سەدە یەك بەردەوام بوو. بەڵام ئەمجارەش وەك سەردەمی فەرمانرەوایی یۆنانییەکان بەسەر ئێراندا، هێزی سەرکەوتوو کەوتە ژێرکاریگەری هێزی بەزیو وئێرانییەکان توانییان عەرەبەکان بخەنە ژێر کاریگەری خۆیان.

یەکەم هەنگاوی ئێرانییەکان ئەوەبوو کە رەسەنایەتی و سەربەخۆیی خۆیان لە عەرەبەکان بەشێوەی رەتکردنەوەی مەزهەبی "سوننە" وپەرەدان بەمەزهەبی "شیعە" نیشاندا. وەها هەنگاوێك لەرووی سیاسییەوە ماناکەی ئەوەبووە کە ئێران نەیدەویست بالأدەستی بیروباوری دەسەڵاتی میراتی خەلیفەکانی بەغدا قەبووڵ بکات. یان بەواتایەکی باشتر، ئێرانییەکان نەیان دەویست لەرووی ژیانی مەعنەویشەوە تێکشکاو بێنە ئەژمار.

لەرووی سیاسییەوە، ئەوشتەی کەبەدڵنیاییەوە بەهۆکاری سەرەکی بەدەستهێنانەوەی سەربەخۆیی ئێران دێتەئەژمار، راپەرینی سەرکەوتووانەی یەکێك لەپیاوەکانی بنەماڵەی عەباسی( کە ئەم بنەماڵەیە خۆیان بە نەوەی عەباس مامی پێغەمبەری ئیسلام دەزانی) بوو بەناوی" ئەبوومو‌سلیمی خوراسانی".

ئەبوومو‌سلیم لەماوەی ساڵەکانی ٧٤٥ تا ٧٥٠ی زایینی بەفەرماندەیی سوپایەك کەبەزۆری لە ئێرانییەکان پێکهاتبوو، توانی خوراسان رزگار بکات ودەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرێت کە ئەمرۆ پێی دەڵێن " ئێراق ". بنەماڵەی عەباسی لە راستیدا بەکەڵك وەرگرتن لە دەرئەنجامی سەرکەوتنی ئەبوومو‌سلیمی خوراسانی بوو کە توانی لەجێگای " ئومەوییەکان " لەبەغدا لەسەر تەختی خەلیفایەتی دانیشێت.

لەوکاتەوە بوو کەخوراسان وەك لانکی زانست وهونەری ئێرانی لێهات وشکۆ وتوانایێك لەوێ سەری هەڵدا کەپێشتر هەرگیز نەناسراو بوو. نەیشاپوور لەسەردەمی دەسەڵاتی تاهێرییەکان و سەمەرقەندو بوخارا لەکاتی دەسەڵاتی سامانییەکاندا ببون بە ناوەندە گەورەکانی دەرکەوتنی فەرهەنگی ئێرانی و ئیسلامی . ئەوسەردەمە دەکرێت بەسەردەمی زێرینی ئەدەبی فارسیش ناوببرێت و،لەناو شاعیرە دیارو بەرچاوەکانیشدا بە: فردەوسی شاعیری ناوداری

پاڵەوانیەتیەکان ( ٩٣٥ تا ١٠٢٠ زایینی)، سەنایی غەزنەوی و جەلالەدین رۆمی ( کۆچکردوی ساڵی ١٢٧٣ زایینی) ئاماژە بکرێت. پزیشکی وفەلسەفەش بە هیمەتی رازی وئیبنی سینا لەگەشەکردنێکی تایبەت بەهرەمەندبوو.

قوناغەکانی بەرەو لاوازچوونی رۆژ لەدوای رۆژی ئێران لەوکاتەوە دەستی پێکرد کەخولامەکان بەسەرولاتدا فەرمانرەواییان دەکرد. دواتریش دەسەلاتی مەغۆلەکانیش، گەرچی لەچەند قوناغێکدابە شێوەی دەسەلاتدارییێکی بەهێزی لێهات، بەلأم لەبەر یەك هەلوەشانی ئێرانی گەیاندە ئەوپەری خۆی وئێرانی تووشی لەت لەت بوون وشێواوییێکی زۆر کرد.

تائاستێکە بەراستی هیچ شتێك نەیتوانی شوێنەواری کاولکاری مەغۆلەکان وکردەوەی وەحشیانە ودژی مرۆیی ئەوان پاك بکاتەوە. جەنگیزخان و هۆلاکۆ بەشی زۆری شارەکانی ئێرانیان – بەتایبەت لەخوراسان دا– وێران کردو، ژمارەیەکی زۆر لەخەلکی ئێرانیان سەربری. دەسەلاتی مەغۆلەکان بووە هۆی لەناوچوونی زۆربەی داب ونەریتی فەرهەنگی ئێرانی وئیسلامی و،لەجیاتی ئەوەشێوازی ژیانی خێلەکی لە ولاتداپەرەی ئەستاند، لەگەل رۆحی راستەقینەی ئێرانییەکان بەهیچ جۆر یەکی نەدەگرتەوە. ئەوبەشە لەفەرهەنگی ئێرانیش کەلەشارە جۆراوجۆرەکاندامابووەوە لەساڵی ١٣٨٣زایینی بەدوا لەلایەن تەیمووری لەنگەوە لەناوچوو. ناوبراوچەند کەسێك لەهونەرمەندانی ئێرانیی کەهێشتبوویانیەوە لەگەل خۆی دەیبات بۆ سەمەرقەند بۆئەوەی لەبوونیان بۆ جوانکردنی ناوەندی حوکمرانی خۆی کەلك وەربگرێت. هاوکات مێژوونووسان ئاماژە بەبوونی منارەیەك دەکەن لەبەغدا کەبەفەرمانی تەیمووری لەنگ لەکەللەی سەری ٩٠ هەزار لەکوژراوەکان دروستکرابوو.

# فەسڵی ٢

## لە باڵادەستی تا ژێردەستی

ڕەنگە لە گێڕانەوەی کردەوە دڕەندانەکانی تەیمووری لەنگ دا زێدەرەوی زۆرکرابێت، بەڵام هەرگیز ناکرێ حاشای لێ بکرێت کە سەردەمی دەسەڵاتی تەیموور پڕبوو لە تۆقاندن وتیرۆر.

بەڵام بەپێچەوانەی ئەم بارودۆخە، لەکاتێکدا کە شتێکی نەمابوو ئێران بەتەواوی لەناوبچێت وبسپێردرێت بەمێژوو، جارێکی تر بەهاتنی بنەماڵەی سەفەوییەکان،ئێران سەرلەنوێ لەدایك بووەوە و هەستانەوەیەکی دیکەی دەستپێکرد کەلەساڵی ١٥٠١ تا ١٧٣٦ زایینی درێژەی کێشا.

شا ئیساعیل (١٥٢٤ _١٤٨٧ ) یەکەم پاشای سەفەوییەکان توانی خەڵکی ئێران لەدژی مەترسییەکانی ئوزبەکەکان لە ڕۆژهەلاّت و عوسمانییەکان لە ڕۆژئاوادا ڕێکبخاتو، بەڕاگەیاندنی مەزهەبی ڕەسمی وڵات، لە ڕاستیدا هۆکاری یەك پارچەیی مەعنەوی بۆ زۆرینەی خەڵك پێکهێنا. بەڵام شا ئیسماعیل نەیتوانی لەبەرامبەر هێرشی پورتۆگالییەکاندا بەفەرماندەیی "ئالفۆسۆئالبۆکرك" خۆڕاگری بکات وهێزە پورتۆگالییەکان توانییان دوورگەی هورموز ودەورووبەری داگیربکەن.

دوای رووخانی ئیمراتۆریەتی رۆم ئەمە یەکەم جاربوو کەرۆژئاواییەکان پەلاماری ئێران بدەن. وە ئەنجامەکەی، کەسەردەمێکی نوێی دیاری کرد،بزاڤێکی دروست کردکەکوتایی بە ئینتیمای ئێرانییەکان بەرەو رۆژهەلاَت هێناو لاپەڕەیەکی نویی لەگۆڕینی ئاراستەی ئێرانییەکان بەرەو رۆژئاوا پێکهێنا.

یەکێك لەنەوەکانی شائیسماعیل بەناوی "شاعەباسی کەبیر" (١٥٨٧ تا ١٦٢٩) ئێرانی کردەوە بە وڵاتێکی بەهێز و،سەردەمی شکۆ وگەورەیی رابردوویی گێڕایەوە. گەرچی ئەو نەیتوانی ناوچەی بین النهرین-کەلەساڵی١٥٣٤ زایینی بەهۆی ئیمپراتوری عوسمانی لەئێران جیاکرابووە وە- بگێڕێتەوە بۆمان، بەلاَم توانی لە ئیسفەهان -کەکردبووی بە پایتەختی خۆی- بەکۆکردنەوەی ئەدیبان وهونەرمەندان، شارێك کەدیمەنێکی سەرنجراکێشی هەبێت، وبەژمارەی دانیشتوانی نزیك ٦٠٠ هەزارکەسەوە بە "نیوەی جیهان" ناوبانگ دەربکات وبەرهەمەکانی دەربڕی سەردەمی زێڕینی هونەری ئیرانی بێت لەوێنەکێشان ومێعماری دا.

هەر ئەم شاعەباسە بووکەپێی کومپانیاکانی رۆژهەلاَتی هیند وهۆڵەندا وبریتانیای بۆ ئێران کردەوە ورێگای بەوان دا نووسینگەی بازرگانی بکەنەوە. ئەگەرچی کومپانیای هیندی رۆژهەلاَت یارمەتی شاعەباسی دا بۆ ئەوەی بتوانێت پورتۆگالییەکان لەدوورگەی هورموز دەربکات (١٦٢٢)، بەلاَم دەبێت دان بەوەیدا بنرێت کەئێران لەم مامەڵەیەدا قازانجێکی ئەوتۆی نەکرد.

لەساڵی ١٦٢٩ تا ١٧٣٦ دەبێت بەسەدەیەك چاولێبکرێت کەقۆناغێکی دیکەی بەرەو لاوازی چوون لە مێژووی ئێران دانیشان دەدات ولەوماوەیەدا ئێران زۆرجار لە لایەن تورکەکان و رووسەکانەوە پە لاماردرا. لەساڵی ١٧٢٤ یشدا رووسیا وعوسمانی پێکەوە ، ویلایەکانی باشووری ئێرانیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد، وئەشرەفی ئەفغان بەشی زوری ناوچەی رۆژهەلاَتی ئێرانی داگیرکرد ودەستی کردبە تالاَن کردنی ئیسفەهان. بەمجۆرە ئێران جارێکی تر تووشی لێك هەڵوەشان هات و، ولاَت بەرەو مەرگ ونەمان برا.

من پێشتر لەپەرتووکەکانی خۆمدا چارەنووسی دڵتەزێنی "شاسوڵتان حوسەین" دوایین پاشای سەفەوییەکانم بەبیرهێناوەتەوە، کەلەچ بارودۆخێکی سەخت وناخۆشدا لەپایتەختەکەی خۆیدا لەلایەن چەتەکانەوە گەمارۆدراو، بوو بە پێکهێنەری سەردەمێك کە واپێدەچوو چارەنووسی ئێران بۆهەمیشە بە هەمان شێوە دەمێنێتەوە.

بارودۆخی ئێران بە هەمان شێوە بەردەوام بوو تا ئەوەی کە "نادرشا" هات و،لەسەردەمی ئەودا کە مێژوونووسان نازناوی "ناپێلئونی ئێران" یان لێ ناوە، جارێی تر سەردەمی شکۆ وبەهێزی ئێران گەڕایەوە.

نادرشا یاخی بووانی لە مەشهەد وهەرات دا لەناوبرد: ئەشرەفی ئەفغانی تێکشکان وئیسفەهانی داگیرکرد (لەساڵی ١٧٢٩)،بە خێرایی پەلاماردەرانی عوسمانی لە وڵات دەرکردو،سەرئەنجام پەلاماری رووسەکانی دا (کەتەنانەت لەبەرئەوەی رووسەکان وایان بەباش زانی کە لەگەڵ نادردا بەرەو ڕوونەبنەوە، هەر بۆیە ناوچە داگیر کراوەکانیان چۆڵ کرد).

هەنگاوی دواتری نادرشا داگیرکردنی قەندەهار وکابول بوو، دوای ئەویش بە تێپەرین لەملەی خەیبەر راستەوخۆ لە پشتی سوپای هیندەوە سەری دەرهێنا و، توانی دوژمن تێك بشکێنێت، لە حاڵێکدا هەموو دیلەکانیشی لەگەڵ دابوو، لەمانگی مارسی ١٧٣٩ داشاری دێهلی داگیرکرد. یەکێك لە مێژوونووسانی هێندی لەم بارەوە وتوویەتی:" سامانێکی زۆرو زەبەند کەلەماوەی ٣٤٨ ساڵ دا بەهۆی پاشاکانی هیندەوە کۆکرابووە وە،لە چاوتروکاندنێك داکەوتە دەستی نادرشا."

نادرشا دوای ئەوەی کە کچێك لە نەوەکانی "ئورنگ زیب" ی لەکوڕی دووەمی خۆی مارەبڕی وتاج وتەختی هیندستانی دووبارە دایەوەدەست "موحەمەدشا گورگان"، گەڕایەوە بۆ ئێران. ئەو لەم لەشکرکێشیەدا توانی سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ئێران بگەیەنێتە کەناری رووباری سێند وهەمان ئەو جێگای کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی دا هەیبوو.

دەربارەی نادرشا چیرۆکی زۆر وتراوە، بەلام من لەناویاندا هۆگریم بەم چیرۆکەیان زیاترە:

رۆژێــک لەشــەڕ لەگــەڵ ســوپای هینــددا، نادرشــا لــەناو لەشــکرەکەی خۆیــدا پیرەسەربازێکی ڕیش سپی بینی کە وەك شێر شەڕی دەکرد. نادر ئەم پیاوەی بانگ کردو پرسیاری لێکرد:" باشە پێم بڵێ،١٣ ساڵ پێش مەگەر تۆ لە ئیسفەهان دا نەبوویت کە دوژمنان توانییان ئیسفەهان داگیر بکەن؟"

پیرەپیاو ولام دەداتەوە:" ئەو رۆژە من لە ئیسفەهان دا بووم، بەلام تۆ نەبوویت."

نادرشایان لەبەر ئەوە لەگەڵ ناپیلئۆن بەراورد کردووە کە ئەویش بەردەوام سەردەکەوت وچالاکی سەربازی جێی شانازی ئەنجام دەدا. بەلام دەبێت بوترێت کە: ناپێلئۆن بەدەستی هێزی یەکگرتووی دوژمن تالاوی شکستی چێشت، لە حاڵێکدا کە نادرشا هیچکات لەگۆرەپانی شەڕدا شکستی نەخوارد. خاڵێکی تر ئەوەی کە: ناپێلئۆن سیاسەتمەدار وحوکمڕانێکی دوارۆژبین بوو، بەلام نادر لەم رووە وە لە ئیمپراتۆری فەرەنسا نەدەچوو و، بەهۆی رق ئەستووری ودڵڕەقی تەنانەت جارێك بڕیاری دامنداڵەکەی خۆی کوێر بکەن .

## فەتحعەلی شا وناپێلئۆن:

بنەماڵەی ئەفشارییەکان کەبەهۆی نادرشاوە بنیات نرابوو، دوای ماوەیەك بە هۆی بنەماڵەی زەندیەکانەوە (کەلە١٧٥٧ تا١٧٩٤ زایینی فەرمانرەوای ئێران بوون) لەناوچوو. بەناوبانگ ترین پاشای زەندیە، کەریم خان بوو (لە١٧٥٧ تا١٧٧٩) کەخۆی بە "وکیل الرعایا" ناودەبرد. دەسەلات داریەتی بنەماڵەی زەندیەکانیش لەئاکامی شەڕێکی ناخۆیی دیکەدا کۆتایی پێهات کەئەنجامەکەی بە دەسەلات گەیشتنی بنەماڵەی قاجارەکان بوو لە ئێراندا (لە١٧٩٤ تا١٩٢٥).

دواتر سەردەمی شێواوی وناسەقامگیری ولێك هەڵوەشانی ئێران لەکاتێکدا دەستی پێکرد کەبە پێشکەوتنی وڵاتانی رۆژئاوا بەرەو سەردەمی پیشەسازی وهەڵکشانی ئابووری، زەمینەی سەرهەڵدانی سەردەمی داگیرکاری فەراهەم دەبوو.

هەرلەوکاتەدا کە زلهێزەکانی رۆژئاوا هێرشی سیاسی وئابووری ونیزامی خۆیان لە چوارگۆشەی جیهاندا پەرەپێدەدا، ئێرانیش یەك لەدوای یەك ویلایەتەکانی خۆی لەدەست دەدا: ویلایەتی قەفقاز بەرێکەوتننامەی گولستان (لەساڵی١٨١٣) وتورکمانچای (لەساڵی١٨٢٨دا) کەوتە دەستی رووسەکان. ویلایەتی هەرات لەژێر کاریگەری ئیمپراتۆریەتی بریتانیادا لەدوای رێکەوتن نامەی پاریس (لەساڵی ١٨٥٧دا) کەوتە ناو خاکی ئەفغانستان. ویلایەتی مەرڤ لەباکووری رۆژهەڵاتی ئێراندا بەهۆی رووسەکانەوە داگیرکرا و،سەرئەنجام لەساڵی ١٨٢٧دا ویلایەتی سیستان لەنێوان ئێران وئەفغانستان دا دابەش بوو.

فەتحعەلی شای قاجار کە ساڵی ١٧٩٧ تا١٨٣٤ فەرمانڕەوای ئێران بوو، هەوڵیدا سەر لەنوێ جۆرجیا داگیربکاتەوە ، هەر بۆیە بیری لە یارمەتی وەرگرتن لەفەرنسا کردەوە. فەتحعەلی شا کەیەکێك لە ستایشکارانی ناپیلئۆن بوو، پێشوازییێکی گەرمی لە جەنراڵ "گاردان" ووەفدی سیاسی-نیزامی هاوڕێی کرد کەلە ساڵی ١٨٠٧ دا لەلایەن ئیمپراتۆری فەرەنساوە ڕەوانەی ئێران کرابوون. ئەم وەفدە راسپێردرابوون بۆ ئەوەی کە لێکۆڵینەوە لەرێگاکانی گواستنەوە و هاتووچۆی ئێران بکەن هەتا زەمینەی لەشکرکێشی ناپیلئۆن بۆ هیندستان فەراهەم بکەن.

ناپیلئۆن پێشتر لە میسردا لێکۆڵینەوەی لە چۆنیەتی لەشکرکێشی سەرکەوتووانەی ساڵی١٧٣٩ ی نادرشا بۆ هێندستان کردبوو. پلانی ئەو گەرچی ئەمڕۆ زیاتر وەك ئامانجیکی دوور لە راستی دێتە بەرچاو، بەڵام بە سەرنجدان لەو بەڵگەنامانەی کەلە نێوان فەتحعەلی شا و "عەباس میرزا" ی کوڕی و جەنەڕاڵ گاردان لەگەڵ ناپیلئۆن و "شامپانی" ( وەزیری دەرەوی فەرەنسا) دا، بەروونی دەری دەخات کە ناپیلئۆن بەراستی چ ئامانجێکی هەبووە.

ناپیلئۆن پێی وابوو کە ئێران قەڵای سروشتیی نێوان رۆژهەلاتو رۆژئاوایە. لەروانگەی ئەوەوە ئێران بایەخی ستراتیجی پلەی یەکەمی هەبووە، باوڕی وابوو کەئەم ولاتە دەتوانێت هەم بۆ هێرش بردن وهەم بۆ بەرگری کردن کەڵکی لێ وەربگیرێت. ناپیلئۆن بەتایبەتی ئیرانی بەناوچەیەکی گرنگ دەزانی بۆ دەست بەسەرداگرتنی رووسەکان ودەیگوت:" ئەگەر ئێرانییەکان ٢٠ هەزار چەك وسیستەمێکی تۆپخانەی باشیان هەبێت، بەباشی دەتوانن لەدەست درێژی رووسەکان رێگری بکەن." هەروەها باوڕی وابووکە :" پێویستە لەئێراندا پرۆژەی راهێنانی ١٤٤ هەزار سەربازی سوارە بەشێوەیەکی جیدی لەبەرچاو بگیرێت و، ئەم سوپایە کە هێزێکی لێهاتوو وپێشەنگە، بۆلەشکرکێشی بۆهێندستان کەڵکی لێ وەربگیرێت." جەنراڵ گاردانیش لەراپۆرتی بەرواری ٢٦ جەنیوەری١٨٠٨ ی خۆیدا نووسیویەتی :"پلانی لەشکرکێشی بۆهێندستان، بیری هەموو کەسی لەتاران بۆلای خۆی راکێشا".

**بەپێی نووسینەکانی گاردان:**

بارەگاکانی فەرەنسا لەتاران وئیسفەهان و شیراز لەهەڵسەنگاندنەکانی خۆیاندا بەو ئاکامە گەیشتبوون کە:" شەڕ لەدەورووبەری رووباری سێند دا لەنێوان ٥ بۆ٧ مانگ زیاتر ناخایەنێت و،هەڵبەت ئەم ماوەش پەیوەندی بەوەوە هەیە کەسوپای مەزنی فەرەنسا لە رێگای وشکایەوە بەتێپەرین لەشارەکانی حەلەب ، بەغدا، بەسرە، شیراز و یەزد پەلاماری هیند بدات ؛ یان لە رێگای دەریای رەش وتێپەرین لە شاری ترابۆزان ودواتر دابەش بوون بۆ دووبەش (یەکەمیان لە رێگای : ئەرزرۆم ، هەمەدان، یەزد، هەرات. وئەوی تریان لە رێگای: تەورێز، تاران، خوراسان، هەرات)..."

ژەنراڵ گاردان لەدرێژەی راپۆرتەکەی خۆیدانووسیبووی:" هەردوو سەرباز وئەسپێکیان پێویستە...دەکرێ لەئێراندا تۆپ وگوللە وباررووت دروست بکرێت. باشترین جۆری نیتراتی پوتاسیوم لە ئێراندا پەیدا دەبێت...سیکەکانی ویلایەتی

سێند کەلەگەڵ بریتانیاییەکان دا دوژمنایەتیان هەیە، دەتوانن نزیکەی ٥٠ هەزار سەربازی سوارەمان پێ بدەن ..."

بەداخەوە فەتحعەلی شا لەیەکگرتنی لەگەڵ فەرەنسا بەو ئەنجامەی کە دەیویست نەگەیشت. چونکە لەوکاتەیدا کە ڕووسەکان پەلاماری باکووری ئێرانیان دا، ناپیلئۆن لەئیسپانیا سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ بریتانیاییەکاندا بوو ودەیویست " جۆزف " ی برای لە سەر کورسی پاشایەتی دابنێت. هەرلەو کاتەدا جەنراڵ گاردان لەراپۆرتێکیدا بۆ ناپێلئۆن دەنووسێت:" بریتانیاییەکان شاندێکیان بەسەرۆکایەتی بەرێز هارفۆرد جۆنز لەرێگای کەنداوی فارسەوە ڕەوانەی تاران کردوە، گەرچی ناوبراو کەسێکی بەدفەڕو زمان پیسە، بەڵام هەمبانی پڕە لەزێڕ..."

سەرئەنجام ناپێلئۆن لە کاتێکدا پلانی هێرش کردن بۆ سەر هێندی لەرێگای ئێرانەوە بەلاوەنا کەهێزەکانی تووشی شەڕی ساڵی ١٨٠٩ لە ناوچەی " دانووب" هاتن و،سێ ساڵ دواتریش پەلاماری مسکۆیان دا.

# فەسڵی ٣

## ڕێگایەک بەرەو هیند ونەوت

لەسەردەمی جێنشینەکانی فەتحعەلی شادا (موحەمەدشا، ناسرەدین شا، موزەفەرەدین شا) بێهێزی ولاوازی ئێران بووبە هۆی پەرێشانی وبێ لایەنی ئێرانییەکان.
لەسەرەتای دەسەلاّتی موحەمەدشا دا ئەگەرچی ئێران هێشتا لەحالّی شەڕدا بوو بۆ گرتنەوەی هەرات -کەبەهی خۆمان دەزانی-، بەلاّم زۆری پێنەچوو کەسەرئەنجام ناچاربووین دەست لە هەرات هەڵبگرین ولەژێرپەستان وهەرەشەی بریتانییەکاندا ناچارکراین دان بەفەرمانڕەوایی ئەفغانستان بەسەر ویلایەتی هەرات دابنین. لەبەر ئەوەی بەپێی وتەی بریتانییەکان:" دەسەلاّتی بریتانیا، داگیرکردنی هەرات بە هۆی ئێرانییەکانەوە بە کردەوەیەکی دوژمنکارانە لەدژی خۆی دەزانێت"...هەڵبەت نەلەبەر ئەوەی کە ئێمەی ئێرانی مەترسێیکمان بۆ سەر هندستان هەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ڕووسەکان بەنیازبوون لە هەرات دا کونسوولخانە بکەنەوە.
لە سەردەمی بەستنی پەیمانی پاریسەوە لەساڵی ١٨٥٧ تا١٩٢١ لە ئێران داهیچ دەوڵەتێك نەهاتە سەرکار کە بوێرێت سەربازێك بجوولێنێت، یاسایەك تێپەڕێنێت

یان مۆڵەتی کارکردنێك بدات، مەگەر ئەوەی کە رەزامەندی باڵوێزەکانی رووسیا یان بریتانیا یان هەردوولایان بەدەست هێنابێت یان لانیکەم ئەوان لارییان لەشتەکە نەبووبێت.

سیاسەتی وڵاتی ئێمە- ئەگەر بکرێت ناوی سیاسەتی لێ بنرێت- لە باڵوێزخانەکانی رووسیا وبریتانیا دادەرێژرا و، ئەم دوو وڵاتەش هیچکات نکوڵییان لەوە نەدەکرد کە ئێران بەچاوی نۆکەر وخولامی گوێڕایەڵ سەیردەکەن. نووسینە سیاسیەکانیان وەك بڕیار وفەرمان وابوو و،بێگومان گورج لەلایەن ئێمەیشەوە جێبەجێ دەکرا. بە لام ئەگەر لەبەجێ گەیاندنی فەرمانەکاندا تۆزێ بیانوومان بگرتایێت ئەوا خێرا نووسینەسیاسیەکانیان دەگۆڕا بۆ هەڕەشە وگوڕەشە و،دواتریش بۆ وێنە چەند سەد سەربازی بریتانیایی بەرەو کەنارەکانی کەنداوی فارس دەکەوتنەڕێ.

لەوەها بارودۆخێکدا خێرا هەمووشتێك بەوجۆرەی لێدەهات کەبریتانیاییەکان پێیان خۆش بوو، مەگەر ئەوەی کەهەندێ لە ویلایەتەکانی وەك "چاکووتاهی" یا " تەنگستانی " بەدەسپێشخەری خۆیان لە هەمبەر بریتانییەکاندا ڕادەوەستان و هێزەکانی پەلاماردەریان ناچار بەپاشەکشێ دەکرد. بەڵام بەهەرحاڵ بریتانییەکان هەموو کارێکیان دەکرد بۆئەوەی ڕێگای خۆیان بەرەو هندستان هەمیشە ئاوەڵابێت.

## نەوت:

هەرلەو سەردەمەدابوو کە دوو زانای فەرەنسی، یەکیان زەوی ناس وبەناوی " کۆت " وئەوی تریان شوێنەوارناس و بەناوی " ژاك دوومۆرگان " لەمیانەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا نیشانەگەلێکیان لە هەبوونی سەرچاوەی نەوت لەئێراندا بەدەست هێنا، کە هەڵبەت ئەم ماددەیە لەرابردوودا لەئێراندا ناسرابوو ولەساڵانی

پێشتریشەوە هەمووکەس دەیزانی کەئێران – بەتایبەت لەناوچەی باشووری ڕۆژهەلآتدا– لەرووی سەرچاوەکانی نەوتی ژێرزەوییەوە زۆر دەوڵەمەندە.
لە ساڵی١٨٧٢ داخانەدانێکی بریتانیایی بەناوی " جولیوس فۆن رۆیتێر " مۆڵەتی دەرهێنانی نەوتی لە سەرتاسەری ئێراندا وەرگرت. بەلآم لەبەر ئەوە هەوڵەکانی بۆ سوودوەرگرتن لەم مۆڵەتە سەری نەگرت، ناچاربوو بەر لەوەی کە هەموو سەروەت وسامانەکەی خۆی بۆ دۆزینەوەی نەوت لە ئێراندا لەدەست بچێت، واز لەم مافەی کارکردن بهێنێت. (رویتێر دواتر ئاژانسێکی هەواڵنێری دامەزراند و، ئەم ئاژانسە زۆری پێنەچوو ناوبانگێکی زۆری بەدەست هێنا وناوبانگی " رویتێر "ی تا بە ئەمرۆ بەرز راگرتووە).
سەرکەوتنی سەرەکی لە بواری سوودوەرگرتن لە نەوتی ئێران بەنسیوی هەمان ئەو دووفەرەنسییە بوو کەنەوتی ئێرانیان دۆزیەوە ودواتریش دەوڵەمەندێکیان پەیداکرد کە ئامادەیی هەبوو سەروەت وسامانەکەی خۆی بۆ سوودوەرگرتن لەوشتەی کە دۆزی بوویانەوە، وەگەڕبخات. ئەم کەسەی کەلەلایەن سێرهێنری درۆمۆندوڵف –ە وە (باڵوێزی بریتانیا لە ئێران) بە فەرنسییەکان ناسرا، خاوەن بانکێکی بەرەگەز ئوسترالیایی دانیشتووی لەندەن بوو بەناوی " ویلیام ناکسی دارسی ".
دارسی کە سەروەتێکی زۆری لە کانە زێڕێکی سەر بە ویلایەتی " کوئینزلەند "ی ئوسترالیا بەدەست هێنابوو، لەبەر ئەوەی کە حەزی لە ریسککردن و بەدەست هێنانی داهاتی زیاتربوو، بەو هیوایەی کەلەگەڵ ئەوەشدا سەروەت وسامانەکەی خۆی دووهێندەبکات، بە رەو ئەوە راکێشرا کە سامانەکەی خۆی لەبواری دەرهێنانی نەوتی ئێراندا وەگەڕبخات.
سەرئەنجام لە رۆژی ٢٨ ی مای ١٩٠١ دوای زنجیرەیەك وتووێژی دوور ودرێژ (کەبە هۆی ڕێگری کردن لە ئەنجامی کارەکەو داواکاری تێکەل بە هەڕەشەی رووسەکان، زۆریش ئاڵۆزبوو) شا مافی " دۆزینەوە ودەرهێنان وگواستنەوە وفرۆشتنی نەوت وگاز وقیر وبەرهەمەنەوتییەکانی دیکەی لەسەرتاسەری ئێراندا "

(جگە لە ناوچەکانی نزیک لە سنووری رووسیای تزاری) بۆ ماوەی ٦٠ ساڵ بە تایبەتی بەخشی بە ویلیام ناکسی دارسی.

بەڵام دارسی لەبەرامبەر قەبوول کردنی مۆڵەتی کارکردنەکە گەش بینییکی یەکجار زۆری نیشاندابوو، لەبەر ئەوە دوای ماوەیەك تێگەیشت کەبڕی پارەی پێویست بۆ سەرمایەگوزاری لە توانای ئەو بەدەرە. هەر بۆیە کاتێ نەیتوانی کارەکە درێژە پێبدا، مۆڵەتی کارکردنەکەی خۆی دابە " کومپانیای نەوتی بریتانیا وئێران،".

دوای ئەوە زۆری نەخایاند کەلە رۆژی ٢٦ مای ١٩٠٨ دا بۆ یەکەمین جار لە چاڵێك لە مەسجد سلێمان نەوت هەڵقوڵا، لەو ڕۆژە بەدوا ناوی " ناکس دارسی " تێکەڵ بەمێژووی نەوت بووە. لە حاڵێکدا کە ئەو هەرگیز نە پێی نایە ئێران ونەپێدەچێت لەتەواوی ماوەی ژیانیشی دا بەرمیلێك نەوتی خاوی دیبێت.

پێش لە هەڵقوڵانی نەوت لە ئێراندا، رۆژی ٣١ ی ئاگۆستی١٩٠٧ " نیکل سۆن " و " ئیزوولسکی " ریکەوتننامەیەکیان واژۆکردبوو کەبە پێی ئەو رێکەوتننامەیە وڵاتی ئێران لە نێوان دوو هێزی رووسیا وبریتانیادا دابەش دەبوو.

رۆژێك هەروا بۆ گەڕان بەناو فەرهەنگی " بریتانیکا " لەژێر وشەی " ئێران "دا بابەتێکم بەرچاوکەوت کە بە هۆی بەرێز " لارنس لاکهارت "ە وە دەربارەی مێژووی ئێران نووسرابوو، راڤەکەی ئەو سەبارەت بە رێکەوتنی ١٩٠٧ ی رووس وبریتانیا – کە پێکەنیناوی بوو– بەم جۆرە نووسرابوو:

"...لەم گرێبەستەدا، دوو وڵاتی رووسیا وبریتانیا جەختیان لە سەر ئەوە کردبوو کەبۆ سەربەخۆیی ویەکپارچەیی ئێران رێزیان هەیە و، لە نێوان خۆیاندا رێکەوتبوون کەهەرکامیان لەهوڵدان بۆ بەدەست هێنانی مافی کارکردن لەناوچەی نزیک بەسنووری ئەوی تردووری بکات.... بەستنی وەها گرێبەستێك بۆ ئێرانییەکان زۆر جێگای دڵناخۆشی بوو، بە تایبەت دوای ئاشکرابوونی نێوەڕۆکەکەی، وا هەست کرا کە دەوڵەتی بریتانیا دوای ئەو هەمووە لایەنگری کردنەی لە مەشروتەخوازی، ئێستا ڕێگەی خەیانەتی هەڵبژاردووە. بەڵام ئێرانییەکان لەو راستییە بێ ئاگابوون کەبریتانیا ورووسیا تەنیا لەبەر ترسی

هاوبەشیان لەهێز ودەسەلأتی ڕوو لە گەشەی ئەڵمانیا، چوونەتە ژێر باری وەها ڕێکەوتنێك. هەر بۆیە ڕاگەیەنراوی هاوبەشی بریتانیا و ڕووسیا و ڕوون کردنەوەیان لەم بارەوە کە ئامانجی ئەوان بەرگری کردنە لەدەستێوەردانی دەرەکی – نەهاندان بۆدەستێوەردان–، نەیتوانی هیچ کاریگەرییێك لەسەر دامرکاندنەوەی گومانی ئەوان دابنێت..."

بەڵام ئەوەی کە چۆن دەبوو هەم ڕێز بۆ یەکپارچەیی وسەربەخۆیی ئێران دابنرێت وهەم خاکەکەی لە نێوان خۆتا دابەش بکەیت؟ وەلأمی ئەم پرسیارە لە فەرهەنگی بریتانیکا بەرچاونەکەوت.

## ئێران، ولأتی مۆتەکە:

دوابەدوای ڕاپەرینی شۆڕشگێڕانەی ساڵی ١٩٠٥ی ڕووسیا ودەرئەنجامەکانی ئەو ڕاپەڕینە لە هاندانی خەڵکی تفلیس وباکو، بزوتنەوەیەکی سیاسی– مەزهەبی لە تارانیشدا سەری هەڵدا کەلەلایەن بریتانییەکانەوە پشتیوانی لێکرا و، موزەفەرەدین شای ناچارکرد یاسایەکی بنەڕەتی قەبووڵ بکات کە ڕواڵەتێکی فریودەرانەی هەبوو (٣٠ دیسامبری١٩٠٦ ) کە هەڵبەت چەندرۆژ دوای واژۆکرنی ئەم یاسایە، کۆچی دوایی کرد.

دەسەلأتی مەشروتەی ئێران جگە لە پارلمانێکی یاسادانان– کە ئەویش بەتەواوی لەژێر دەسەلأتی دەرەبەگی خاوەن موڵکدابوو– چاکسازییێکی بنەڕەتی ئەوتۆی بۆ ولأت ئەنجام نەدا.

لەو سەردەمەدا کەش وهەوای سیاسی وکۆمەلأیەتی ئێران زیاتر لە مۆتەکەیەکی ترسناك دەچوو. دەسەلأتی ناوەندی ئەوەندە لاوازبوو کە تەنانەت نەیدەتوانی بالأدەستی خۆی بەسەر پایتەختی ولأتدا بسەپێنێت وسوپا وئاسایشێك لەگۆڕێدا نەبوو، ژمارەیەکی کەم سەرباز هەبوو کەلە بەر ئەوەی وەك پێویست ولەکاتی خۆیدا مووچەیان پێنەدەدرا ویان هەندێ جارمووچەیان نەدەگرت، ناچاربوون

بۆبەرێ کردنی ژیان ڕوو لەکاری دیکە بنێن. پێویستە بزانین کە سەربازەکانی ئێران لە باکووردا لە ئەفسەرانی ڕووسی ولەباشووری ولاتدا لەئەفسەرانی بریتانیایی فەرمانیان وەر دەگرت.

لە ولاتدا تەنیا " زۆر " حکومەتی دەکرد و، "زۆر"یش تەنیا لەدەستی موڵکداری گەورە وسەرۆك ویلایەتەکاندا بوو. کەئەم تاقمە- لەناوچەی ژێردەسەلاتی بریتانیاییەکاندا- پاراستنی ئاسایشی کاروباری تایبەت بەکەندنی چاڵە نەوتییەکانیشیان لەئەستۆدابوو. لە زۆربەی شاروگوندەکاندا دەسەلاتی ڕاستەقینە بەلای دز وچەتەکانەوە بوو.

لەوسەردەمەدا ئێران یەکێك لە ولاتە هەرە هەژارەکانی جیهان بوو، هەژار تا ئەوئاستەی کە دەولەت بەزۆری دەبوو بۆ نموونە لە بازرگانێك پارە قەرزبکات هەتا بتوانێت تێچووی پێشوازی لە میوانێکی دەرەکی بدات. لەناو خەڵکی ئاسایی دا تەنیا کەسانێك دەیانتوانی خۆش بژیۆبن کە خەریکی مامەڵەو بازرگانی لەگەڵ ولاتە دەرەکییەکاندا بوون.

بیانییەکان مافی کارکردن وسوودبردن لە زۆربەی سەرچاوە نەتەوەییەکان وکارە خزمەتگوزاریەکانیان بۆ خۆیان هێشتبووە وە. بۆ نموونە: نەوت، ڕاوەماسی، تەلەگراف، گومریك وهتد. کشت وکاڵ وپیشەسازی وبازرگانی ئێران لەهەل ومەرجی سەدەکانی ناوەراستدا بوو و، بارودۆخی کۆیلایەتی هێشتا لەناو ڕەعیەتەکاندا بەرچاو دەکەوت.

بارودۆخی تەندروستی ولات ترسناك بوو. نەتەنیا ئاماری " هیوابەژیان " گەیشتبووە تەمەنی سی ساڵ، بەڵکو ڕێژەی مردنی مندالانی ئێران یەکێك لە هەڵکشاوترین ئامارەکانی دونیابوو. بەدخۆراکی وهەل ومەرجی ناتەندروستی ژیان وای کردبوو کەئێرانییەکان - کەبەردەوام بە نموونەی خەڵکێکی تەندروست وبەهێز دەهاتنە ئەژمار- ببن بە خەڵکێکی چارەرەش وهەژار. نەبوونی هەل ومەرجی تەندروستی، ببووە هۆی زۆربوونی کارەساتاویی زۆرێك لەنەخۆشییەکانی وەك کەفتەیی ومەلاریا ونەخۆشیەکانی چاو. هەڵبەت هاوکات

بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە گشت گیرەکانی وەك تاعون وكۆلێرا شتێکی نائاسایی نەبوو، هەروا کەسەرهەڵدانی قات وقڕی لە ئەنجامی وشکەساڵی دا بۆ خەڵك شتێکی ئاسایی بوو.

نەزانین ودواکەوتوویی لەگەڵ هەژاری ونەخۆشی دا سەرانسەری وڵاتی داگرتبوو. کەمتر لە سەدا یەکی خەڵك لە نێعمەتی خوێندەواری سوودمەند بوون و، لەتاران تەنیا قوتابخانەیەکی دواناوەندی هەبوو. ژنان نەدەچوون بۆ قوتابخانە و لە تەواوی مافە کۆمەڵایەتیەکان بێبەش بوون.

لە هەموو ماف ونێعمەتێکی شارستانیەتی رۆژئاوا، کە وڵاتەکانی وەك ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وهندستان وباقی دراوسێ کانمان بەجۆرێ لێی سوودمەندبوون، ئێرانیەکان لێی بێبەش بوون وکەسێك شتێکی دەربارەیان نەدەزانی. لە ئێراندا نەرێگای شەمەندەفەر هەبوو، نەجادەیەکی گونجاو، نەئۆتۆمبیل،نەکارەبا ونە تەلەفوون. ئەگەر بە رێکەوتیش یەکێك لەو دیاردانە پەیدابیبوایێت، ئەوا هەمووکەس وەك شتێك لە بۆ رازاندنەوە وجوانکاری سەیریان دەکرد.

هەژاری ماددی ومەعنەوی خەڵك، شان بەشانی گەندەڵی ودووروویی وگیرودەبوون بە ماددەی هۆشبەر وباوڕ بەشتی بێهودە وپڕوپووچ، دەچووە پێش. وەها دابەزینێك گەرچی تا ئاستێك ڕەگی لەلاوازی ونەزانین ودواکەوتوویی جەماوەری خەڵکدا هەبوو، بەڵام حاشا لەوەی ناکرێت کە: نەشیاوی وبێ توانایی بەرپرسانی حکوومەتی، خۆپەرستی خانەدان ودەرەبەگەکان و، هەروەها ئەو کارانەی کە هێزە دەرەکییەکان بۆبندەست کردن وداگیرکاری ئەنجامیان دەدا، لەودا کاریگەرییێکی بەرچاوی هەبوو.

زۆرێك لەبریتانیاییەکان کەداگیرکارییەکانی نادرشایان لەهندستاندابە بیردەهێنا یەوە ولە ئێرانییەکان دەترسان، لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەسیاسەتی " ناوچەی مردوو " لە ماوەی نێوان رووسیا وهێندستان دا جێ بە جێ بکەن.

ئێرانیش وەك تاوانبارێکی سزادراو بەمەرگ- کە ئیتر هیچ هیوایەکی بۆ مانەوەی خۆی نییە- چاوەڕێی دەکرد تا دوایین تێسرەواندنی بەربکەوێت وبۆهەمیشە لەمەیدان دەرکرێت. ئەم تێسرەواندنەش جیاوازی نەبوو کە لە باکوورەوە ئاراستەی بکرێت یان لەباشوورەوە....بەلاّم هەر لەو سەردەمەدا بوو کە پیاوێك پێی نایە مەیدان ودەرکوت: باوکم رەزا شای مەزن.

# فەسڵی ٤

# باوکم، ڕەزاشای مەزن

لەساڵی ١٩٠٧، لەکاتێکدا کە ڕێکەوتننامەی بریتانیاو رووسیا واژۆدەکرا، بابم نزیکەی سی ساڵ تەمەنی بووو فەرماندەی گرووپێك لە قەزاقە ئێرانییەکان بوو. ئەو پیاوێکی کەڵەگەت بوو کەکەسانی ژێردەستی تائاستی پەرستن ئۆگری بوون. هەڵبەت ئەوچەتانەی کەبە زۆری خزمەتیان بەبنەماڵەی دەرەبەگەکان دەکرد وبەسەر وڵات دا زاڵ بوون، لێی دەترسان.

دیمەنێك لە باوکم کەبەهۆی نووسەرانو وێنەکێشانو پەیکەر سازانەوە کێشراوە وهەوڵی وێنەگران وفیلم سازان ورۆژنامەنووسان لەماوەی زیاتر لەنیوسەدەدا بۆنیشاندانیان بەخەڵك، بەگشتی سیمایەکی ناسراویان لەباوکم دروست کردوە.

لەسەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانیدا باوکم یان بە " ڕەزاماکزیم " ناودەبرد، لەبەرئەوەی کەناوبراو بە ڕەشاشێکی " ماکزیم " کاری دەکرد. وێنەیەك لەبابم هەیە کە ئەو لەپشتی ڕەشاشێکی ماکزیمداو لەحاڵی تیرهاویشتندا نیشاندەدات. لەوسەردەمەدا زیاتر لە ٥ یا٦ ڕەشاشی ماکزیم لەئێراندا نەبوو ولەم ڕووەشەوە بابم لەڕووی کارامەیی لە تیرهاوێژی دا لەگەڵ ماکزیم ناوبانگی تێکەڵ بوو. بەڵام

هاوکات ناوبراو لەماوەی ساڵی ١٩١٥ دا بەتووڕەیی ونیگەرانییەکی زۆرەوە چاودێری ئەو بارودۆخەی دەکرد کە ئێرانی پێدا تێپەردەبوو ودەیدیت کە وڵات لە هەموولایەکەوە پەلاماردراوە وبووە بە شوێنی تەراتێڵی هێزەسەربازییەکانی بیانی: تورکەکان وئەڵمانییەکان لەلایەکەوە و رووسەکان وبریتانییەکانیش لەلایەکی تردوە.

لەپاش پەیماننامەی " ڤەرسای " لەساڵی١٩١٩دا ئێران کەم وزۆر وەك وڵاتێکی لێهات کەلەلایەن بریتانیاییەکانەوە پشتیوانی لێدەکرا. بەڵام هەر لەو کاتەدا، لەهەندێك لەپارێزگاکانی باکووری وڵاتدا ئاگری شۆرشی کۆمۆنیستی بڵێسەی دەکێشا وهەمووکات پێدەچوو کەلە بەشێك لە باکووری ئێراندا کۆمارێکی بەستراوە بەسۆڤیەت رابگەیەنرێت.

من لەوەها سەردەمێکی شێواودا بوو کەرۆژی ٢٦ ی ئوکتوبەری ساڵی١٩١٩ لە تاراندا چاوم بە جیهان پشکووت. بابم کەلە شەڕێکی سەرکەوتووانە لەباکووری وڵاتدا گەڕابووە وەتاران، لەوەی کەبووە بەخاوەن کوڕێك ومیراتگرێك، زۆرخوشحاڵ بوو.

## رەزاخانی میرپێنج، دەبێت بەشا:

باوکم بەزۆری لەکاتی گێرانەوەی بارودۆخی ئەو کاتی وڵاتدا، ئامارژەی بەبارودۆخی شێواو ودڵساردکەرەوی ئێران دەکرد ودەیگوت: دەتگوت دەسەڵاتی ناوەندی هەرنییە، ملهوڕان وچەتەبەناوبانگەکان سەرانسەر ئێرانیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کردبوو.

نەیاسایەك هەبوو، نەرێکوپێکی وتەکووزییێك، نەسوپایەك ونە پۆلیسێك. کاروباری دادوەری بەهۆی مامۆستایانێکی ئایینیەوە چارەسەردەکرا کە زۆربەیان نەزان وهەندێکیان لایەنگربوون. خراپەکارانی چەکدار دادگای سەرپێیی تایبەت بەخۆیان هەبوو و دادپەروەرییان بەمەیلی خۆیان جێبەجێ دەکرد. لەبەر رێکەوتنی

کاپیتولاسیون لەنێوان دەوڵەت وزلهێزەکاندا، نەدەبوو هاووڵاتیانی بیانی کەتاوانێکیان ئەنجام دەدا بدرێنە دادگاکانی ناوخۆ. تەنانەت لە شاری تارانیش دا شەوانە کەس لە ماڵ نەدەچووە دەرەوە، مەگەر زۆر پێویستی بکردایەت، وەك پێویستی خێرا بە پزیشك (کە هەڵبەت ئەگەر کاری واش بکرایێت، جیاوازییێکی نەبوو)، ئەگەری ئەوە هەبوو کە لە هەر شوینێکی شاردا دز وخراپەکاران پەلاماری خەڵك بدەن. بارودۆخی ئەمن وئاسایشی رێگاکانی هاتووچۆی وڵات ئەوەندە خراپ بوو، کەلە ترسی چەتەکان ئەگەر کەسێك دەیویست لە تارانەوە بروات بۆ مەشهەد دەبوو لە ڕێگای خاکی رووسیاوە گەشت بکات. یان بۆ رۆشتن بۆ خووزستان دەبوو بەخاکی عوسمانی وبین النهرین دا تێپەرێت.

پێش لە دایك بوونی من، باوکم کەبە گرفتی زۆرەوە لەگەڵ خراپەکارانی چەکدار دەجەنگا، جارێك ئەوەندە لە وەزعی خۆی وهەل ومەرجی وڵات ناڕەحەت بوو وهەستی بە بێزاری کرد کە بڕیاری دا لەکاتی شەڕێکدا بەئەنقەست خۆی بە کوشت بدات.

دوابەدوای ئەم بڕیارە، باوکم ئەسپەسپییەکەی بەرەو پێشەوە تاوداو دوای تێپەرین لە کەسانی ریزی پێشەوەی خۆی، خۆی گەیاندە دوژمن. هێزی دوژمن کەلەسەرەتادا لەم کارەی باوکم سەریان سووڕمابوو، بەپەلە دایانەبەردەسرێژ. بەلآم بەوپەری سەرسووڕمانەوە هەرچی گوللەیان بۆ هاویشت بەری نەکەوت وباوکم بۆ درێژەدان بە خزمەتکردن وەك موعجیزەیەك لەمەرگ رزگاری بوو.

رەزاخان لەکاتی شۆڕشی کۆمۆنیستی رووسیادا، ئەو ئەفسەرە رووسانەی دەرکرد کە بەزۆری واخۆیان نیشان دەدا کەنەیاری کۆمۆنیستەکانن، بەلآم نەدەبوو متمانەیان پێبکەیت. بۆ خۆیشی فەرماندەیی قەزاقە ئێرانییەکانی لە ئەستۆگرت.

بەم جۆرە ڕەزاخان پێگەیەکی بەدەستهێنا ولەشاری قەزوین دا (یەکێك لەو شارەستراتیجیانەی کەلە لایەن بریتانیاییەکانەوە داگیرکرابوو) بوو بەفەرماندەی هێزێکی سوارەی ٢٥٠٠ کەسی لە قەزاقەکان. هەر لەم پلەوپایەیەدا بوو کەلە

ماوەی مانگی ئاگۆست ساڵی ١٩٢٠ دابۆی دەرکەوت کەکاتی مەرگ وژیانی وڵاتەکەی گەیشتووە و بڕیاری دا بێتەمەیدان.
رەزاخان شەوێك بە نهێنی قەزوینی بەجێ هێشت وهێزەکەی بەرەو تاران برد. دواترکەگەیشتە تاران شارەکەی گەماڕۆداو ئەحمەدشای ناچارکرد دەوڵەتەکەی بگۆڕێت -٢٣ ی فیبریوەری١٩٢١- ئەم کوودتا بەپەلەیە بەکەمترین زیانەوە بەئەنجام گەیشت. جەنراڵ ئایرونساید کەئەو سەردەمە فەرماندەی هێزە بریتانییەکان بوو لە ئێراندا، سەبارەت بەکارەکەی باوکم وتبووی: " رەزاخان تەنیا پیاوێکە کەدەتوانێت ئێران رزگاربکات."
یەکێك لەو کەسانەی کەلەم کوودتایەدا یارمەتی باوکمی دا، گەنجێك بوو بەناوی (سەید زیاالدینی تەباتەبایی) کەهەمووکەس ئەوی وەك سیاسەتمەدارێکی رۆژنامەنووسی لایەنگری بریتانیا دەناسی. هەر ئەویش بوو کەلەدوای کوودتاکە کرابە سەرۆکی وەزیران وماوەی سێ مانگیش لەم پۆستەدا مایەوە، تا سەرئەنجام باوکم – کە لە کابینەیکەی ئەودا وەزارەتی جەنگی لەئەستۆدابوو- بوو بەهۆکاری ئەوەی کەسەید زیا وازلەپۆستەکەی خۆی بهێنێت ووڵات بە جێ بێلێت (سەیدزیا، لەساڵی ١٩٤١ دا دوای ئەوەی کەباوکم ئێرانی بەجێ هێشت،دووبارە گەرایەوە ئێران وحیزبێکی سیاسی دامەزراند کە زۆریش لەگەڵ من هاوڕا نەبوو. بەڵام ئەم کارە دواتریش نەیتوانی پەیوەندی دۆستانەی نێوان من وسەیدزیا تێك بدات).
ئامانجی باوکم لە دوورخستنەوەی سەیدزیا ئەوەبوو کەئازادی کارکردنێکی زیاتری هەبێت بۆئەوەی ئامانجەکانی خۆی جێبەجێ بکات. کە یەکێك لەوانە پێکهێنانی سەربەخۆیی وڵات بوو لەبەرامبەر هێزەدەرکییەکاندا.
ئەحمەد شا بەم داوایەی باوکم رازی بوو ولەدوای سەیدزیا، دەوڵەتێکی نوێی پێکهێنا، کەلەودا دیسان وەزارەتی جەنگ لە ئەستۆی باوکم دابوو. ئەحمەد شایش دوای پێکهێنانی دەوڵەتە نوێکە- بەپێی نەخشەیەکی لەپێش دا دارێژراو- بەرەو ئەورووپا سەفەری کرد.

لەوکاتەدا رەزاخان فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکان بوو (سەرداری سوپا) بەڵام بەهیچ جۆر لەهەوڵی ئەوەدانەبوو کە ئەحمەد شا لەسەرتەختی پاشایەتی لاببات. بەڵکو راست بەپێچەوانە، زۆرجار داوای لە ئەحمەد شا کرد کەلەئەورووپا بگەرێتەوە بۆئێران. دواتریش کاتێکە ئەحمەد شا سەرئەنجام رازی بوو بگەرێتەوە بۆ ئێران، رەزاخان بۆ پێشوازی لێکردنی رۆشت تابەندەری بوشێهر. بەڵام زۆری پێی نەچوو کە ئەحمەد شا دیسان بەرەو فەرەنسا سەفەری کرد و، بەمجۆرە رەزاخان هاتە سەر ئەو قەناعەتەی کە:

ئامادەنەبوونی سەرۆکی وڵات ونەبوونی دەسەڵاتێك بۆ بەرێوەبردنی کارەکان ناتوانێت جێگای پەسەندبێت و،پێویستە هەوڵ بۆ دامەزراندنی رژیمێکی نوێ بدرێت.

لەوسەردەمەدا چاوەکان هەموو برابوونە " مستەفا کەمال " کەدەیویست تورکیا بکات بەوڵاتێکی مودێرن. باوکیشم لەریزی ئەوکەسانەدا بوو کەستایشی ئەویان دەکرد و واپێدەچوو کە سەرۆکی حکوومەتی نوێی تورکیاش بەم هۆگریەی باوکمی دەزانی ونرخی بۆئەودادەنا. تائەو جێگای کە دەیگێرنەوە: چەند ساڵ دواتر کاتێکە باوکم وەك شای ئێران سەردانێکی رەسمی بۆ تورکیا کرد، مستەفا کەمال لەکاتی پێشوازی لێکردنی دا داوا لەئالاهەڵگری گاردی رێزلێنان دەکات لە هەمبەر باوکمدا چۆك دابدات.

باوکم سەرەتا لەبیری ئەوەدابوو کە رژیمێکی کۆماری لە ئێراندا دروست بکات، دەقاودەق بەو شێوەی کە مستەفا کەمال لە تورکیا پێکی هێنا. بەڵام پێشەوایانی ئاینی شێعە وزۆربەی سیاسەت وانان وبازرگانانی ئێران دژایەتی ئەم بیرۆکەیان کردبوو وپێیان وابوو کە: لەبەر ئەوەی ئێران – بەپێچەوانەی تورکیا– وڵاتێکە پێکهاتووە لەچەند قەوم وویلایەتێك بەزمانی جیاوازەوە، هەربۆیە بۆ پاراستنی یەکیەتی ویەکگرتوویی وڵات پێویستە دەسەڵاتێکی پاشایەتی بەسەریا حکوومەت بکات. هەرلەدرێژەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەدابوو کەسەرئەنجام لەرۆژی ٣١ ی

ئوکتۆبری ساڵی ١٩٢٥ دا بە دەنگی پەرلمانی ئێران، بنەماڵەی قاجارەکان لە پاشایەتی کردن لادرا.
سەرئەنجام دوای پێکهێنانی ئەنجومەنی بناغەدانان، هەموو ئەندامەکانی – جگەلەچوارکەس– بە هەڵبژاردنی رەزاخان فەرماندەی گشتی هێزەکان، بۆ پاشایەتی کردنی ئێران رەزامەندییان دەربڕی.
رێوڕەسمی تاج لەسەرنانیش لەرۆژی ٢٥ ئاپریلی ١٩٢٦ دابەرێوەچوو وهاوکات من لە حالێکدا کە تەمەنم لەحەوت ساڵ زیاترنەبوو، بەفەرمی وەك جێگرەوەی شا دانرام.
باوکم یازدە منداڵی هەبوو وگشتیانی لەناخی دڵەوە خۆش دەویست. ئێمەش بەچاوی خۆشەویستی وستایشەوە سەیری باوکمان دەکرد. لەبەر ئەوەی کە پێمان وابوو پیاوێکی بە توانا وبەتاقەتە. زۆر رێزمان لێدەگرت .
من زوو تێگەیشتم کە لەپشتەوەی رواڵەتی توند وتووڕەی باوکم دا، پیاوێکی میهربان ودڵپاك هەیە و، دوژمنانیشی ئەم راستیەیان بۆ دەرکەوت کە: ئەو لەو کەسانەیە کە خواوەند لەماوەی چەند سەدەدا جاروبار دەیان نێرێت بۆ ئەوەی نەهێلن میللەتێك بکەوێتە ناو تاریکی وبێئاگایی. لەراستیدا، ئەو شتەی کە یارمەتی باوکمی دا بۆ ئەوەی بتوانێت بەسەر گیروگرفتی تاقەت پروکێنی سەردەمی پاشایەتیدا سەربکەوێت، کەسایەتی ئازا ونەترسی ئەوبوو. هەڵبەت هەرئەم تایبەتمەندیەش بوو بەهۆکاری دەست لەکارکێشانەوە وددوورخستنەوەیشی لەوڵات.
باوکم لە شێوازی بەرێوەبردنی وڵات وکاروبارەکاندا هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ پاشاکانی دیکەی رۆژهەڵات دا نەبوو. بەردەوام هەوڵی دەدا ئەرکەکانی پاشایەتی خۆی وەك خزمەت وئەرکی سەربازی ئەنجام بدات. ئەو شەوانە لەسەر دۆشەکەیەك دەنووست کەلە سەرزەوی راخرابوو. کاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو هەڵدەسا. تەنیا رۆژێك دووجار خواردنێکی سادەی دەخوارد وباقی رۆژەکەی بەکاروچالاکی دەبردەسەر.

**خەبات بۆ یەکگرتوویی وسەربەخۆیی وڵات:**

ماوەیەکی کەم پاش کوودەتاکە لە نێوان ئێران و رووسیای سۆڤیەتدا رێکەوتنێکی دۆستانەو دوری کردن لەدەسدرێژی واژۆکرا کە هەموو مافەتایبەتیەکانی رابردوو وهەل ومەرجی نالەباری رێکەوتنەکانی پێشتری هەڵدەوەشاندەوە. دواتریش رێکەوتنی ١٩١٩ی نێوان ئێران وبریتانیاش –کە هەڵبەت هیچکات لەلایەن پەرلمانەوە پەسەند نەکرابوو– بەفەرمی هەڵوەشایەوە.

یەکێك لە کارەکانی باوکم یەکخستنەوەی ناوخۆیی وڵات بوو. سەرۆکی هەندێ لە خێڵەکان بەوەرگرتنی برێك لەپشکی کومپانیای نەوتی ئێران وبریتانیا، پاراستنی ئاسایشی کێڵگە نەوتیەکانیان لەئەستۆگرتبوو، هەرئەم کارەش دەبووە هۆی ئەوەی کەبریتانییەکان ئەوانە بخەنە خزمەتی خۆیانەوە. بەڵام باوکم هەموو پشکەکانی ئێیان وەرگرتەوە وهەمووخێڵەکانی ناوەراست و باشوور وروژئاوای ئێرانی نیشتەجێ کرد وخستیانیە ژێر رکێفی دەوڵەتەوە.

دوای هێرش بۆسەر تاران و کوودەتا، باوکم بە دەنگەوازێکی تێکەڵ بەسکاڵاوە دەیگوت:" خۆزگە هەزاردانە چەکی یەکجۆرم لەبەردەستدا دەبوو." هەربۆیە هەرکە دەرفەتێکی دەسکەوت، هەوڵەکانی بۆ پێکهێنانی هێزێکی سەربازی گونجاو وەگەرخست ولەسەرەتادا سوپایەکی بەمجۆرەی پێکهێنا: لەشکرێکی پیادە، تیپێکی ئازاد وسەربەخۆ وچەند یەکەیەکی تایبەت بۆ پاراستنی پەیوەندیەکان. هەروەها لەشوێنەهەستیار وستراتژیەکانی جادەکانی وڵاتدا، پێگەگەلی سەربازی گچکەی دانا ودواتریش هێزی هەوایی وهێزی دەریایی ئێرانی دامەزراند.

لەسەرەتادا بربرەی پشتی فەرماندەکانی سوپای نوێی ئێران لە ئەفسەرانی فەرەنسی پێك دەهات وئەو ئەفسەرە ئێرانیانەش کەدەبوو لەداهاتوودا فەرماندەیی سوپا لەئەستۆبگرن، بۆدرێژەدان بەخوێندن رەوانەی فەرەنساکران بۆ ئەوەی لە قوتابخانە سەربازییەکانی وەك "سێن سیر "، "سومۆر " یان "سێن مێگزان"ی ئەو

ولآتـەدا فێـری کارامـەیی وهونـەری سـەربازی بـبن. مـن بۆ خـۆم دواتـر لەلایـەن ئـەو ئەفسەرانەوە راهێنرام کەلە قوتابخانەی " سین سیر "دا خوێندنیان تەواوکردبوو.
هـەر لـەو سـەردەمەدا بـوو کەکۆشـش بـۆ دروسـتکردنی بنەمایـەك بـۆ پیـشەسازی لەئێراندا دەستی پێکرد، تا لەوە بەدوا خەڵك بتوانێت، ئەگەرکرا بەگوڕیش بەرەو بەرهەمهێنانی ئەو شتومەکانەی کە پێویستیانە هەنگاوهەڵبگرن. لەگەڵ ئەوەشدا بـاوکم پێـی خـۆش بـوو هاوکـات لەگـەڵ کاروبـاری پیـشەسازیدا، هـەنگاو بـەرەو باشـتربوونی بـارودۆخی جووتیـاران هـەڵبگرێت، بـەڵام لـەم رێگـادا سـەرکەوتنی بەدەسـت نـەهێنا و، مـن لەبەشـەکانی داهـاتووی ئـەم پەرتووکـەدا ئـەو بارودۆخـەی روون دەکەمەوە کەشۆڕشی سپی ئێمە سەبارەت بەجووتیارانی ئێرانی پێکی هێنا.
یـەکێکی تـر لـەکارەکانی بـاوکم هەڵوەشـاندنەوەی بـەردەوامو هەنگاوبەهـەنگاو وتـەواوی ئەومافەتایبەتیانـەی بـوو کـە بیانییـەکان لـە ئێرانـدا هـەیانبوو. داهـاتی گومرکەکانی ئێران کەبەکرێ درابوو بە بەلجیکاییەکان، بەگشتی تەرخان کرابوو بۆ دانـی بەشـێك لـە قەرزەدەرەکییـەکانی وڵات. هێـزی پـۆلیس لەژێرفەرمانـدەیی ئەفسەرانی سـویدی دا بـوو. تـەنیا ئـەو بانکانـەی لـە وڵاتـدا هـەبوون، بانکـەکانی رووسیو بریتانیاییو عوسمانی بوو. مافی چاپو بڵاوکردنـەوەی پـارە، تـەلگرافو هەندێ شتی دیکەش لە دەستی بریتانیاییەکاندا بوو.
هـەمووی ئەمانـە هەڵوەشـێنرایەوەو بـەپاڵ پـشتی زێـڕو گەوهـەری پاشـایەتی پارەیـەکی نـوێ کەوتـە بەردەسـتی خـەڵك. گەوهـەرو بەردێن گرانبـەها کـە زۆربـەیان نادرشا لە هندەوە هێنابووی.
پێدەچێت کۆشکی بریتانیا خاوەنی ئەڵماسی " کێوی نوور " بێت. بەڵام ئێمە لەئێراندا ئەڵماسی " دەریای نوور "مان هەیە کەڕەنگە لەویش جوانتربێت. ئەم ئەڵماسە بەنرخە لەگەڵ گەوهەرو جەواهێری پاشایەتیو گەنجینە نەتەوەییەکاندا لە خەزێنەی بانکی ناوەندی ئێراندا پارێزراوە.
لە ژێرزەمینی بانکی ناوەندیدا خەزێنەگەلێکی پڕلە جۆرەکانی مرواریو ئەڵماس هەیە. تەواوی ئەو بەردە بەنرخانەش کەلە ماوەی پاشایەتی ئێمەدا کڕیمان یان

وەك خەلأت وەرمان گرت، هەر لەم خەزێنانەدایە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەئێمە هەمیشە وەها گەنجینەیەکمان بەهی خەڵکی ئێران زانیوە.
ئەو تازە لاوە ئاژاوەگێڕانەی کەلەتەمەنی١٥ و١٦ ساڵی دان و لەم دوایانەدا پەیکەرەکانی رەزاشایان لەشارەکانی ئێران داهێنایە خوارەوە، بەدڵنیایەوە لە هەوڵەکانی ئەو بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەی ئێران بێئاگا بوون و نەیاندەزانی کە باوکم چ زەحمەت و رەنجێکی کێشا تاتوانی وڵات لەهیچەوە دروست بکات. ئەو هەنگاوەکانی لەسەر لەنوێ دروستکردنەوەی شارەکانەوە دەسپێکرد و، دواتریش بە دروستکردنی یەکەمین زانکۆ، قوتابخانەی جۆراوجۆر، نەخۆشخانەکان، کارگەکان، رێگاکان، بەندەرەکان و یەکەمین وێزگەی کارەبا درێژەی بەکارەکانی دا. هەموو ئەمانەشی لە بارودۆخێکدا ئەنجامدا کە وڵات هیچ جۆرە پاشەکەوت و پارەیەکی نەختی نەبوو.
لە ساڵی١٩٢٧دا باوکم دروستکردنی هێڵی شەمەندەفەری سەرانسەریی ئێرانی دەسپێکرد وئەم پرۆژەیە لەساڵی ١٩٣٩دا بەئەنجام گەیاند. ئەم رێگایە کەزیاتر لە١٥٠٠ کیلومەتر درێژایی هەبوو و ٤١٠٠ پرد و ٢٤ تونێلی (بەکۆی درێژی٨٦ کیلومەتر) لەخۆدەگرت، کەنارەکانی دەریای خەزەری دەگەیاندە کەنداوی فارس.
باوکم هەموو هەوڵەکانی خۆی وەگەرخست بۆئەوەی سامانە سروشتیەکانی وڵات ببن بە سامانی نەتەوەیی. هەرلەم راستایەدا بوو لە دیسامبری١٩٢٣ دا رێکەوتننامەی دانی ماف کارکردنی لەبواری نەوت دا –کەلەساڵی١٩٠١ دا بە " دارسی " درابوو و دواتریش گوێزرابووە وە بۆ کومپانیای نەوتی بریتانیا وئێران – هەڵوەشاندەوە. چونکە بەرهەمی نەوت لەساڵی١٩٢٣ دا لە دوومليۆن و سێسەدوشەست وپێنج هەزارتەن تێپەری نەدەکرد. بەلأم دوای هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتنەکە، برەکەی لەساڵی١٩٣٨ دا لە دەملیۆن وسێ سەدهەزارتەن تێپەری.
هاوکات دەبێت ئەم خاڵەی لێ زیادبکەین کە بەرهەمی نەوتی ئێران لەساڵی١٩٧٧دا گەیشتە نزیکەی سێسەد ملیۆن تەن و، بەرهەمی گازی سروشتیش لەچل مليارمەتری سێجا تێپەری.

**ئامادەبوون لە سەدەی بیستەمدا:**

لەماوەی ساڵەکانی١٩٢٦ و١٩٢٧ دا سیستەمی دادوەری وڵات گۆڕاو سیستەمێکی نوێ کەلە سەربناغەی نموونەکانی فەرەنسا دامەزرابوو، وەك سیستەمێ نوێی دادوەری ئێران کەوتە بواری جێبەجێ کردنەوە. پێگەیاندنی زۆرەملی بەمەبەستی فێرکردنی سەرەتایی بۆ نەخوێندەواران – سەرەرای کەمی مامۆستای پێویست – چووە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە.

هەنگاوی لەم جۆرە بوو بە هۆی ئەوەی کە هێزو دەسەڵاتی مامۆستایانی ئایینی تائاستێکی زۆر بەرتەسك ببێتەوە. پێویستە بوترێت کە شان بەشانی پێشکەوتنی ئەم هەنگاوانە، نیشانەکانی لەوڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراستا دەردەکەوت.

سەقامگیرکردنی سیستەمێکی سیاسی نوێ لەلایەن باوکمەوە – کەتارادەیەکی زۆر لەنموونەکانی رۆژئاوا سەرچاوەی دەگرت – و پەرەپێدان و قایم کردنی لەلایەن منەوە بەشی زۆری ئەم مافانەی کە پێشتر لەدەسەڵاتی مامۆستایانی ئایینی دا بوو، لەوانی وەرگرت. هەر بۆیە هەندێ لەمەلاشیعەکان دەستیان کرد بەدژایەتی کردنی و بەم کارەش گەرانەوە بۆ روانگەی سیاسی رابردووی خۆیان کە: هەرچەشنە دەسەڵاتێکی دونیاییان لەدەستی جگە لەکەسانی ئایینی دا، وەك کردەوەیەکی داگیرکەرانە دەناسی. لە کاتێکدا کە باشتروابوو ئەوان لەو بارودۆخەی کە هەبوو کەڵك وەربگرن و بەپێشخستنی کاروباری ئایینی خۆیان، پەرە بەکاریگەری مەعنەوی و ئایینی خۆیان بدەن.

مارکسیستەکانیش بەکەڵك وەرگرتن لەو هەلومەرجەی کەپێش هاتبوو، رەوتێکیان لەژێرناوی " مارکسیزمی ئیسلامی "دا داهێنا. کە ناکرێ بە شتێکی جیا لە کۆکردنەوەی دژەکان دابنرێت.

دەبێت ئەو راستییە قبول بکەین کەئەگەر باوکم لەدژی دەستێوەردانەکانی هەندێ لە ئاخوندەکان لە کاروباری سیاسی دا رانەدەوەستا، بێ گومان لە بەجێ گەیاندنی

ئەو ئەرکانەی کەلە ئەستۆی گرتبوو لەگەڵ گیروگرفتی زۆر بەرەو روو دەبووەو، سالانێکی زۆری دەخایاند تائێران بڕواتە ناو بازنەی وڵاتانی پێشکەوتووو مۆدێرن.

باوکم لەبەر ئەوەی تەنیا ڕێزی بۆ کۆلکە مەلایانی شێعە دانەدەنا، بەهەڵە لەبارەیەوە وتویانە کەبڕوایەکی بە مەزهەب نەبووە. لە حاڵێکدا کەئەو ئیمانداریکی راستەقینە بوو، هەروەکە منیش هەم. وە ئەمە ئیمانی باوکم بوو کەلەو پیاوێکی ئازاو دەسپاکی دروستکرد. لە سەردەمی باوکم دا زیانێك بە دەسەڵاتی مامۆستایانی ئایینی نەگەیشت و، ئەوان بەردەوام توانییان لەگرنگی و پایەخی مەلایی بەهرە مەندبن.بەڵام هاوکاتیش دەبوو ئێران شیاوی‌و هێژایی وڵاتێکی سەدەی بیستەمی پەیدابکات. لە کاتێکدا ئەمڕو هەوڵدەدرێت ئێران بە پێچەوانەی ئاراستەی، بەرەو رابردوو ببەن.

رەزاشا باوڕی وابوو کە هیچ میللەتێك ناتوانێت لە سەدەی بیستەمدا درێژە بەژیانی خۆی بدات مەگەر ئەوەی کەلە تاریکی رزگاری بێت. ئەو بەراستی دەیگوت: مەعنەویەتی راستەقینە زۆر گرنگترو سەرترە لە ئابووری و سیاسەت، هەرلەم رووە وە بوو کە ئیمان وبێ ریایی تائەوئاستە بوو کەتەنانەت خوای وەك چاودێرێکی کاروباری هەڵبژاردن یان ئەندازیاری سەرەکی چاڵە نەوتێك دەزانی.

رەزاشا بۆ هەموو کوڕەکانی ناوی ئیمام رەزای بەشێوەی لێکدراو لەگەڵ ناوەکانی تردا دەسنیشان کرد، وەئەمە هیچ هۆکارێکی نەبوو جگە لەوەی کە باوکم بۆئەم کوڕەی ئیمامی عەلی ڕێزێکی تایبەتی دادەناو زۆرجار سەردانی بارەگای ئەم ئیمامە پایەبەرزەی لە مەشهەددا دەکرد. کاتێکە رەزاشا گەیشت بە دەسەڵات، دامەزراوەکانی تایبەت بە بارەگای ئیمام رەزا لەبارودۆخێکی نالەباردا بوون، پارەیەکی زۆر قەرزاربوون، بیناکانی وەك کەلاوەیان لێهاتبوو. بەڵام رەزاشا هەمووشتێکی سەرلەنوێ دروست کردەوە و کردی بە شوێنێکی شیاو.

لە سەردەمی پاشایەتی مندا دامەزراوەکانی بارەگای ئیمام رەزا بە تروپکی شکۆو گەورەیی گەیشت‌و بووبە یەکێك لە ناوەندە پڕبایەخەکانی دونیای ئیسلام. ئەم

بارودۆخە بە هۆی بەخشینی ئەوسامانو ماڵەوە بوو کە لەلایەن ئۆگرانی ئیمام رەزاوە – لەوانە خودی من – بۆبارەگای ئیمام رەزا تەرخانکراو دامەزراوەکانی والێکرد کەجگە لە دامەزراوەی جۆراجۆری مەزهەبی، بوو بەخاوەن چەندین یەکەی پیشەسازی،و کارگەو کۆجێی چاندنو پیشەو نەخوشخانەو دامەزراوەی خێرخوازی دیکە. هەروەها پێویستە بوترێت کەمن بۆخۆم زۆرێك لە شوێنە مەزهەبیو مزگەوتەکانم لەئێران و دەرەوەی وڵاتدا نوێژنکردوتەوە.

هەمووکەس دەزانێت ئەوپارەو یارمەتیانەی کە دەبەخشرێن بەدامەزراوە مەزهەبیەکان ناکرێ بە هیچ جۆر دەسکاری بکرێت، بەڵام بابوترێت کەدەسەڵاتی نوێی ئێران خۆسەرانە فەرمانی دەسبەسەراگرتنی ئەو یارمەتیانەی داوە.

یەکێك لە هەنگاوەکانی باوکم بەرگری کردن بوو لە باوەڕە مەزهبیەکانی ئێمە لە بەرامبەر شاڵاوی ڕاگەیاندنی ئەو ماتریالیستانەی کە دەیان ویست مزگەوتەکان " لەگەڵ خاکدا یەکسان کرێت " بەڵام ئەم کارەی باوکم هیچکات بەمانای قەبوولی بانگەشەی ئەو تاقمە مەزهەبیانە نەبوو کەبیرو بۆچوونی کۆنەپەرستانەیان هەبوو. هەر لەم بوارەدا بوو کەباوکم بڕیاریدا کەڵك وەرگرتنی پیاوان لەجل وبەرگە سوننەتیەکانی رۆژهەڵات وەك پانتۆڵی دەڵپو کەواو مێزەرە قەدەغەبکات. هەڵبەت ئەم کارەی باوکم بوو بە هۆی ناڕەزایەتی هەندێ کەس. بەتایبەت کاتێکە باوکم فەرمانی دا ژنان کەڵك لە چارشێوی رەش وەرنەگرن، کۆمەڵێك لە ئاخوندەکان بۆ دژایەتی کردن لەگەڵ ئەم فەرمانە، هەروەك بڵێیت دەیان ویست لەیەکتری ببەنەوە، هەستی گشتییان بەتوندی ورووژاند. بەڵام من کە کەمتر لەبابم پێداگربووم، دواتر لەماوەی پاشایەتیم دا،کچانو ژنانم ئازادهێشتەوە کە لە کەڵك وەرگرتن یان وەرنەگرتنیان دا لە چارشێو سەربەست بن.

ڕاستیەکەی ئەوەبوو کەلە ساڵی ١٩٢٦بە دوا، کۆمەڵێك لە ئاخوندەکانی ڕێکخراوی (روحانیت) بەئاشکرا دژایەتی خۆیان لەگەڵ چاکسازییەکانی باوکم بۆ گۆڕینی ئێران بۆ گەلێکی مودێرن، دەسپێکرد. ئەم کومەڵەیە هەرئەوانەن کە دواتر لەکاتی ڕاپەڕینی ساڵەکانی١٩٢٥ و١٩٥٣ ،١٩٦٣ و١٩٧٨ تا١٩٧٩ خۆیان نیشاندا.

لێرەدا دەبێت دان بەوەدابنێم کەبە پەیڕەوی کردن لە باوکم، من هەر لەسەرەتای ژیانمەوە توانیم لەبایەخی دوعاو پاڕانەوە تێبگەم. ئەمە تەنانەت بە پێچەوانەی فێربوونەکانی سەردەمی منداڵی – کە زۆرتر بە شێوەی لە بەرکردنی سەری بابەتەکەیە – بەشێوەیەکی قووڵ و لە ناخی دڵەوەبوو. هەروەها کەژمارەیەك لەنووسەران دەربارەی هەستی من لەسەردەمی منداڵی دا بابەتی کەم وزۆر هاوجێ لەگەڵ ڕاستیبان نووسیوە.

ماوەیەکی کورت دوای تاج لەسەرنانی باوکم، من تووشی نەخۆشی کەفتەیی هاتم و ڕۆژلەدوای ڕۆژ حاڵم بەرەو خراپی دەچوو، تا ئەوەی شەوێك " علی " ئیمامی یەکەمی خۆمانم لەخەودا بینی. هەر بەزانیاریەکانی سەردەمی منداڵیم دا خێرا بۆم دەرکەوت کە ئەو کەسێکی جگە لە " علی " نییە،لەبەر ئەوە بەدەستی ڕاستیەوە شمشێری زوالفقار – هەرئەوەی کە لە وێنەکەدا دەیبینن – هەبوو. ئەو بە دەستی دیکەی لە قاپێکدا شلەیەکی پێمداو ، بەیانی ئەوشەوە تای من دابەزی و بەخێرایی حاڵم بەرەو باشی چوو.

ماوەیەك دوای ئەوە، لەهاویندا، لەکاتێکدا بۆسەردانی " ئیمام زادە داود " بە کێوێدا دەرۆشتم، لەبان ئەسپەکەوە داکەوتمە سەر تەختەبەردێك و لەسەرخۆچووم. هامڕاکانم پێیان وابوو کەمردووم، بەڵام من تەنانەت ڕووشانێکیشم پێوە نەبوو. ئەمەش هیچ هۆکارێکی نەبوو جگەلەوەی کەلەکاتی بەربوونەوەم لەئەسپەکە دیتم کە یەکێك لە کەسە پیرۆزەکانی ئێمە بەناوی " عەباس " منی گرتەوە ولەسەرزەوییەکەی دانام.

دیتنی ئەوخەوەو ئەورووداوە دواتر دیمەنێکی دیکە تەواوی کرد و، ئەویش بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ئیمامی نەهاتوودابوو لەنزیك کۆشکی هاوینەی شەمێران دا. ئەم ئیمامە بەپێی باوڕی مەزهەبی ئێمە دەبێت ڕۆژێك سەرهەڵبدات و دونیا ڕزگاربکات.

ئەم جۆرە خەون و دەسکەوتە ڕۆحیانەتە بۆئەوکەسانەی کەباوڕی مەزهەبییان نییە دۆخێکی پڕلەنهێنی هەیەو جێگای تێگەیشتن نییە. بەڵام هەرئەم بارودۆخەو ئەو

چـوار ڕووداوەی کـەدواتر بـۆم پـێش هـات، بەتـەواوی بـۆمنی سـەلماند کـەباوڕی قووڵی مەزهەبی گرنگترین پشتیوانی من دەبن لەهەمبەر ڕووداوە تاڵەکاندا. تائەو جێگـای کـە دووجـار بەشـێوەیەکی زۆرسـەرنجراکێش لەمەترسـی ڕووداوەکـان بـە سەلامەتی دەربازبوومەو دووجاریش لەمەترسی نیازخراپی ڕزگارم بووە.

یەکەمین ڕووداوی هەواییم لەکاتێکدا ئەزموون کرد کە سەرقاڵی فڕین بەفڕۆکـەی " تایگێرمات " بـووم لـەنزیکی ئیسفەهان‌و بەسـەرئاسمانی ناوچـەیەکەدا کـەدەیان ویـست ئاراسـتەی ڕووبارێـك بگـۆڕن. جـەنراڵێك کەفەرمانـدەی لەشـکری ئیسفەهان بوو لەئەفسەرانی هێزی سوارەش دەهاتە ئەژمار لەم گەشتەدا هـاوڕێم بـوو. لـەکاتی فـڕین دا، لـەناکاو بزوێنـەری فڕۆکەکـە لـەکار کـەوت‌و دەسـتی کـرد بـە تەپەتـەپ، بەسـەرنجدان بـەم پێـشهاتە لەبەرئـەوە هـیچ ڕێگـە چـارەیەکم جگـە لەنیـشتنەوەی فڕۆکەکە نـەبوو، خێراسـەیرێکی سـەرزەویم کـرد تابەشـك و شـوێنێکی گونجـاو بـۆ نیـشتنەوە پەیدابکـەم. لـەو چرکەدا کەلەسـەر ئاسمـانی گونـدێکیش بـووین، لـەلای ڕاستەوە کێوێك هەبوو ولەلای چەپیشەوە کێڵگەیەکی شێف بڕاو دەبینرا کەبە هیچ جۆرنەدەکرا لەوێدا بنیشیتەوە.

سـەرئەنجام بڕیـارم دا ئاراسـتەکەم بـەلای ڕاسـتدا بگـۆڕم‌و خێرایـی فڕۆکەکـەش لەئاسـتێکدا ڕابگـرم تالـە کەوتنـەخوارەوە ڕێگـری بکـەم. بـەڵام خێراشـوێنێك لـە کێوەکە سـەرەنجی ڕاکێشام کـە دەچـووە وە سـەردۆڵێکی پـان‌و بـەرین، هەرکـەدیتم سۆکانەکەم بەرەو دۆڵەکە سووڕاند.

لە کاتێکدا هیوام بەهیچ شوێنێك نەمابوو، بڕیارمدا لەتەنیا شوێنێکدا کە لەبیرمـدا بوو، واتە دۆڵەکە،فڕۆکەکە بنیشێنمەوە. بۆ ئەم مەبەستە بەرەو زەوی ڕۆشتم، بەڵام لـەنزیکی ڕووی زەوی کاتێکـە تایـەی فڕۆکەکـە بـەر زەوی کـەوت، بـەرەو ڕووی تەختەبـەردێك بوومـەوە کەنـەدەکرا فڕۆکەکـەی لـێ لابـدەیت‌و هەربۆیـە بـەهۆی پێکدادان لەگەڵ تەختەبەردەکەدا، تایـەکان لـەبن هـاتن‌و فڕۆکەکە کەوتـە سەرسك‌و بەسەرزەوییەکەدا خشا کەهەڵبـەت ئەنجامەکـەی –بەخۆشییەوە – بوو بـەهۆی کـەم

بوونەوەی خێرایی فڕۆکەکە. تۆزێ دواتر باڵی فڕۆکەکە بەر تەختەبەردێکی دیکە کەوت و بەو هۆیەوە فڕۆکەکە وەرگەڕاو لەجووڵەکەوت.
من و جەنڕاڵەکەی هامڕام کەسەرەو ژێر لێ وەستابووین، بێ هیچ زەحمەتێك پشتێنەکانمان داماڵی و لەفڕۆکەکە هاتینەدەرەوە. بەڵام ڕوخساری جەنڕاڵەکە وادەهاتە بەرچاو کە دەیویست تێك بچێت.
فڕۆکەیەکی دیکەش کەبەدوامانەوە بوو، بەدیتنی دیمەنەکە توانی بووی بەبێ هیچ گرفتێك لەنزیك گوندێکدا بنیشێتەوە. دوای ماوەیك ئەوکەسانەش کەبە ئۆتۆمبیل بەرێگەوەبوون تا لەشوێنی دیاری کراودا یەکبگرینەوە، خۆیان گەیاندە شوێنی ڕووداوەکە. ئەم گرووپە زۆر نیگەران و نارەحەت بوون، بەڵام من دڵنیایانم کردن کە هیچ گرفتێکم نییەو وتم دەمهەوێت ڕێگاکەم بە فڕۆکەیەکی دیکە درێژەپێبدەم. بەوتنی ئەم بابەتە، لەناکاو بەهۆی ئەوجەنڕاڵانەوە دەورە درام کەبەتوندی لەدژی بڕیارەکەی من هەڵویستیان گرت.
دواتریش کاتێك دیتیان گوێ بۆ قسەکانیان ناگرم و سوورم لەسەربڕیارەکەی خۆم،لە کاتێکدا ویستم سواری فڕۆکەکە ببم، هەموویان لەپێش فڕۆکەکەدا پاڵ کەوتن و وتیان: " بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادەین ئێوە بەفڕۆکە بڕون.." بەمجۆرە لەبەر ئەوەی چارەم نەبوو، باقی ڕێگاکەم بەئۆتۆمبیل بڕی و سەرئەنجام لەحالێکدا گەیشتمە ئیسفەهان کەخۆشحاڵ بووم توانیومە ڕاست لەکاتی خۆیدا ئامادەی ڕێ و رەسمەکە ببم.
لە ڕووداوێکی هەوایی دیکەدا، ڕووداوێکی وەك ئەمەی پێشووم بۆپێش هات. لەکاتێکدا فڕۆکەیەکەم بەتەنگە لانێکی نێوان دووکێودا دەبرد، لەپڕبۆم دەرکەوت کەناتوانم ئەوەندە فڕۆکەکەم ببەمە سەرەوە کەبتوانم لەسەر کێوەکەوە بڕوم. هەربۆیە بڕیارمدا بسووڕێمەوەو هەرلەو ڕێگایەوە کەهاتبووم بگەڕێمەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی گێچەکانی پێشەوەی فڕۆکەکە کەم بوونەوەی خێرایی نیشان دەدا، لەکاتێکدا باڵی فڕۆکەکە ئەستوون وەستابوو ولەچەند مەتری ڕووی زەوییەوە دەفڕیم، هیوا بڕاوانە هەوڵم دا بەبێ سەرنجدان بە هەموویاساکانی ئایرودینامیك و

کێشی زەوی، مانوڤرێ ئەنجام بدەم کەدەمزانی ئەنجامی بێ ئەملاو ئەولای ئەوکارە شتێکی جیا لەمردن نییە. بەڵام تۆزێ دواتر، فڕۆکەوانێکی گەنج کەلەگەڵم بوو، کاتێك دیتی فڕۆکەکە بێ زیان نیشتەوە وئێمەش هیچمان بەسەرنەهات ئەوەندە تووشی سەرسووڕمان هاتبوو کەهەر لەوێدا داوای لەمن کرد کە ڕێگای بدەم تالێهاتووی‌و کارامەیی خۆی نیشان بدات.

منیش کەدیتم ئەو نایهەوێت لەمن دوابکەوێت‌و زۆرحەزدەکات خۆی نیشان بدات، ڕێگام پێدا. ئەم فڕۆکەوانە گەنجە دەیویست لەهەوا سووربخوات، پشتەوەروو لەنزیك زەوییەوە بفڕێت‌و بەرەزەوی خۆی بەرداتەوە. هەڵبەت لەبەرئەوەی کەدەمزانی لەهەمووی ئەم کارانەدا بەتەواوی لێهاتووی‌و کارامەیی هەیەو دەتوانێت بەچاکی ئەنجامی بدات، داواکاریەکەی ئەوم قەبووڵ کرد. بەڵام لەکاتێکدا دەیویست بەسەرا و بەرەو زەوی بڕوات، بەداخەوە نەیتوانی لەکاتی خۆیدا پێشەوەی فڕۆکەکە بەرەو سەرەوە بەرزبکاتەوە وهەربەو خێراییەو لەپێش چاوی مندا بەر زەوی کەوت. دیتنی ئەودیمەنە کۆتاییە بێرەحمانەیە کە چارەنووس بۆئەو فڕۆکەوانە گەنجەی دیاری کردبوو، زیاتر منی ناچارکرد کەئەم ڕاستییە قەبووڵ بکەم کەهێشتا ماوەمە بمرم. ماوەیەك دواتریش بەسەرنجدان بەهەوڵێکی کوشتن کەلەدژی من لەرۆژی٤ ی فیبریوەری١٩٤٩دا رووی دا، دیسان هاتمە سەرئەوقەناعەتەی کەهێزێك پارێزگاری لەمن دەکات.

ئەورۆژە سەرەتای دوانیوەڕۆ بۆبەشداریکردن لە ڕێورەسمی ساڵرۆژی دامەزراندنی زانکۆی تاران، خۆم ئامادەکردبوو. لەکاتی چوونم بۆ ناو زانکۆ، جل‌و بەرگی سەربازیم لەبەردابوو وبڕیاربوو بڕوانامە بەخویندکاران ببەخشم. کاتژمێر تۆزێ لەسێی دوای نیوەڕۆ لای دابوو کەگەیشتمە بەر شاندی پێشوازی کار. وێنەگرەکان لە هەمووڵایەکەوە سەرقاڵبوون کەلەناکاو یەکێك لەوان لەڕیزی وێنەگرەکان هاتەدەرەوە وبەرەورووم هات، هەرکە گەیشتە سێ مەتریم دەمانچەکەی لێم ڕاکێشا.

سێ تیری یەکەم بەرکڵاوەکەم کەوت و بەبێ ئەوەی کە برینێك دروست بکات تەنیا پێستی سەرمی رووشان و دەرچوو. گوللەی چوارەم بەرگونای راستم کەوت و لەژێر لووتمەوە دەرچوو. من کەچاوم لەسەر تاوانبارەکە هەڵنەدەگرت، چوون دەمزانی بەردەوامە لەسەر هاویشتن، خێراسوورێکم خواردو خۆم چەماندەوە. ئەم کارەم بوو بەهۆی ئەوەی کە گوللەی پێنجەم کەبەرەو دڵم هاوێژرابوو، بەرشانم بکەوێت. گوللەی شەشەمیش لەدەمانچەکەیدا گیری کرد.

تاوانبار، کەناوی " فەخرئارایی " بوو دەسبەجێ کەوتە بەردەسرێژی گوللەو کوژرا. گومان دەکەم ڕەنگە بەرژەوەندی کەسانێك وایدەکرد کە تاوانبار قسەیەك نەکات و بکوژرێت.

دواتر بۆمان دەرکەوت کە تاوانبار ڕاستەوخۆ لەژێرکاریگەری هەندێ لەو تاقمە نیمچە مەزهەبیانەدابوو کە بەستراوەبوون بە باڵی توندرەوی خۆپارێزەکان، بەڵام ئەو بەڵگەنامانەی کە لەشوێنی ژیانی ناوبراو دەسکەوتن پەیوەندییان بە حیزبی توودەی ئێرانەوە هەبوو کەوەك " حیزبی کۆمۆنیستی ئێران "وابوو. حیزبی توودە لەوکاتەدا هێشتا نایاسایی رانەگەیەنرابوو و سەرقاڵی بەرێوەبردنی یەکێك لەکونگرەکانی خۆی بوو.

رزگاربوونی سەرسووڕهێنەرانەی من لەم هەوڵەی کوشتن جارێکی دیکە ئەوەی سەلماند کەپارێزگاریم لێدەکرێت و،بەردەوام باوڕم وابووە کەبەسەر هەرکەسدا هەمان ئەوشتەی دێت کەلە چارەی نووسراوە.

چونکە بەردەوام ئەوە ئیمان وباوڕی من بووە کە ئاراستەی ژیانمی وەك تاکێك و شێوازی کردەوەمی وەك سەرۆکی ولاتێك دیاری کردووە، هەربۆیە بەردەوام ئاگام لەو خاڵەبووە کە پارێزگاری کردن لەدینی خۆم بە یەکێك لە گرنگترین ئەرکەکانم بزانم. بەرای من، شارستانیەتێك کەبناغەکەی لەسەر بێخوایی دامەزرابێت، شارستانیەتێکی راستەقینە نییە.هەروەها بەردەوام هەوڵم داوە کە " شۆڕشی سپی " –هەمان ئەو شۆڕشەی کە ساڵانێکی دوور ودرێژ لەسەردەمی پاشایەتیم بۆ

بەدی هاتنی تەرخانکرد -لەهەموو بوارەکاندا، لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام لەناتەبایی دا نەبێت.
دین وەك ساروجێك وایە کەبنەڕەتی کۆمەڵگا ڕادەگرێتو، لەستوونێك دەچێت کە بنەمای ژیانی خێزانیو هەروەها ژیانی میللەتێکیش زەمانەت دەکات .



# فەسڵی ٥

## رۆڵەکەم! لەهیچ شتێک مەترسە

کاتێك تەمەنم گەیشتە شەش ساڵ، خاتوونێکی فەرەنسی کە ببوو بەهاوسەری یەکێك لە هاونیشتمانانم‌و ناوی "ئەرفەع" بوو، وەك مامۆستای ماڵەوەی من دەسنیشان کرا. ناوبراو کەپێم وایە ناوی پێش لەشووکردنی " بوژۆ " بوو، بەردەوام نیشانی دەدا کەنەفرەتێکی قووڵی لە ئەڵمانییەکان هەیە.ئەم کەسە منی بەباشی فێری زمانی فەرەنسی کرد، دواتر کەلەتەمەنی ١٢ ساڵیدا رۆشتم بۆسویس، هیچ گرفتێکم لە قسەکردن بەزمانی فەرەنسیدا نەبوو. من تاساڵی١٩٣٦ لە سویسدا مامەوەو لەتەواوی ئەوماوەدا هەمیشە لەسەر باوڕە مەزهەبیەکانی خۆم بەردەوام بووم.

لە کاتی خویندندا ئۆگرییێکی زۆرم بە مێژووی فەرەنسا پەیداکرد. سن لویم ستایش دەکرد کەهەمیشە لەکاتی داوەری کردندا لەژێر دار بەڕوویەکی دارستانی وینسان دا دادەنیشت. خوێندنەوەی ژیاننامەی سن لویی (لویی نۆیەم) پاشای چاکەکاری خۆمان " نەوشیروانی عادڵ "ی دەخستەوە یادم. کە زەنگێکی لەسەر دەرگای کۆشکەکەی خۆی هەڵواسی بوو وهەرکەس کە بەدوای دادپەروەریدا

دەهات زەنگەکەی دەزڕاندەوە. تائەو جێگای کەتەنانەت وتویانە: رۆژێك گوێرێژێ لە کاتی لەوەڕینی دا زنجیری ئەم زەنگە رادەکێشی و، نەوشیروانیش بەبیستنی دەنگی زەنگەکە کەسێك دەنێرێت تالەگوێدرێژەکە بپرسێت چ داواکارییێکی هەیە؟
کەسانێك وەك هانری چوارەم، لویی چواردەیەمو ناپێلئۆن (پیاوێك کەبەرای من کەسایەتییێکی جیاوازی هەبوو)، لەو کەسانەبوون کەبەردەوام بیری منیان بۆلای خۆیان رادەکێشا. هەروەها بەتامەزرۆییێکی زۆرەوە ژیاننامەی کاردینالە فەرەنسیەکانی وەك: ریش لیو، مازارن وتەنانەت دووبۆایشم دەخوێندەوە، ئەم سێ کەسە گەرچی تووشی هەلەگەلێك هاتن، بەلام بەگشتی خزمەتیان بە ولاتەکەی خۆیان کرد.
لەناو کەسایەتیە گەورەکانی مێژوودا، بەردەوام لەڕیزی ئەو کەسانەیدابووم کەستایشی شارلی پێنجەم (ئیمپراتۆری ئازاو سیاسەت وانی زیرەك)، پێتری مەزن، کاترینی مەزن، ئەلیزابێتی یەکەمو فردریکی مەزن دەکەن.ئۆگری من بۆمێژوو بەگشتی هۆکارێکی نەبوو جگەلەوەی کە جێگرەوەی شابووم وبەهەرحاڵ دەبوو رۆژێك لەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشم،هەربۆیە خوێندنەوەی ژیانی پیاوانی مێژوو منی بۆلای خۆی رادەکێشا.
هەمیشە یەکێك لەباشترین ئارەزووەکانی سەردەمی منداڵیم ئەوە بووەکە گوندنشینانی ئێران بەختەوەربن. هەروەها یەکێك لەخەونەکانم تێکۆشان بۆسەقامگیرکردنی دادپەروەریو دەسەلاتی یاسابوو بۆهەمووخەڵك. لەدووتوێ لاپەڕەکانی دواتری ئەم پەرتووکەدا ئەوە باسدەکەم کەچۆن بۆگەیشتن بەو رۆژە و بەدیهاتنی ئەم خەونە تێکۆشام.
لەساڵی١٩٣١دا لەبەندەری پەهلەوییەوە –بەندەرێکی بچووك لەکەناری دەریای خەزەردا– ڕۆشتم بۆباکوی رووسیاو سەرئەنجام بەشەمەندەفەر ڕۆشتم بۆسویس بۆئەوەی لەوێ بچمە قوتابخانەو بخوێنم. کاتێك لەساڵی١٩٣٦ دا هەرلەم ڕێگایەوە گەڕامەوە بۆئێران، بە هیچ جۆر نەمتوانی بەندەری پەهلەوەی بناسمەوە، چونکە ببووبەشارێکی مۆدێرنی ئەورووپی. تارانیش کەبەفەرمانی باوکم شوورەکۆنەکانی

رووخێنرابوو، بەرەبەرە بەرەوئەوەی دەچوو کەسیمای پایتەختێکی ئەورووپی لەخۆبگرێت. بەڵام لەبەر ئەوەی کەدەسبەجێ دوای گەڕانەوەم رۆشتمە کۆلیجی ئەفسەری بۆخوێندن، دەرفەتێکی ئەوتۆم نەبوو هەتابتوانم بەتەواوی ئەوشتانەی ببینم کەبۆنویێ کردنەوەی ئێران ئەنجام دەدران.
دەسبەجێ دوای ئەوەی کەلەساڵی١٩٣٨دا بەپلەی ستوان دووەم لەکۆلێجی سەربازی خوێندنم تەواوکرد، وەك پشکێنەری هێزی سەربازی دەسبەکاربووم.
هەموو رۆژێك چەندکاتژمێر لەکاتی خۆم لەتەنیشتی باوکمدا –شا– دەبردەسەرو بەزۆری لەسەردانەکانی دا بۆناوچەجیاجیاکانی وڵات لەگەڵی دەڕۆشتم. باوکم دەیویست من لەنزیکەوە لەگەڵ کاروبارەکانی وڵاتدا ئاشنابیم و لەم ڕێگایەوە شێوازی پاشایەتی کردنیش فێربیم. لەوماوەدا، من دەربارەی دەور و نەقشی پاشا وەك فەرماندەیەکی سەربازیش لێکۆڵینەوە گەلێکم ئەنجام دا.
لەبەر ئەوەی کەباوکم لەماوەی ساڵە پڕمەترسییەکانی ١٩١٥ تا١٩٢١دا ژیابوو وتەواوی ئەوگرفتاری و مەینەتیانەی لەنزیکەوە دیبوو کەلە گرژبوونێکی جیهانی وشەڕێکی نێونەتەوەییەوە سەرچاوەدەگرێ، لەم بارەوە زۆر دەترسا کەنەوەك بەرلەوەی کەئێران ئامادەیی بۆ بەرگری لەسەربەخۆیی و یەکپارچەیی خۆی لە بەرامبەر پەلاماردان دا پەیدابکات، دیسان وڵات گرفتاری مەترسی شەڕێکی دیکەی جیهانی ببێت.
بەڵام هێشتا ساڵێك بەسەرتەواوبوونی خوێندن و ئەفسەریمدا تێنەپەڕی بوو کەجارێکی دیکە شەڕ بەرۆکی جیهانی گرت و لەرۆژی ٣ ی سپتەمبەری ١٩٣٩ دا جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکرد.

**بێ لایەنی:**

بەپێچەوانەی ئەو شتانەی کەدەربارەی باوکم نووسراون، ئەوبە هیچ جۆر بەرامبەر بەهیتلەر گۆمانێکی باشی نەبووو بۆچوونەسیاسی – سەربازیەکانی ئەوی

بەنیشانەی ملهوڕییێکی بێ ئەقلانەو پڕ لەمەترسی، ئەگەر نەڵێم کارەسات بار، بۆدونیای پێشکەوتووو بەتایبەت بۆئێرانی دەزانی.
لەو کاتەدا سەرەڕای ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە کارناسانی ئەڵمانی لەئێراندا – کەبەزۆریش لە رووی ئاستی شارەزاییەوە لەپلەیەکی بەرزدابوون– باوکم دەسبەجێ لەگەڵ دەسپێکی شەڕەکەدا بێ لایەنی ئێرانی ڕاگەیاند. دوای ئەوەش، لەماوەی یەکەمین قۆناغی شەڕدا تاکاتی هێرشی هێزی سەرەکی بۆولاتانی باڵکان لە ئاپریلی ۱۹٤۱ دا، بەردەوام ئارەزوومان ئەوەبوو کە دێوەزمەی شەڕ بەرۆکی ئێران نەگرێت. دواتریش کاتێکە سوپای ئەڵمانی نازی لەرۆژی ۲۲ ی جوونی ۱۹٤۱ دا هێرشی بۆسەرخاکی یەکیەتی سوڤیەت دەسپێکرد، ئێران جارێکی دیکە قورس‌و قایم رایگەیاند کەخۆی لەشەڕدا بێ لایەن دەزانێت.
پێشڤەچوونە برووسکە ئاساکانی هیتلەر، سەرەتا لەرۆژئاواو دواترلەرۆژهەلاتی ئەورووپادا، یەکیەتی سوڤیەتی لەباروودۆخێکی زۆرهەستیاردا دانابوو. بە تایبەتی ئەم بابەتەی ئاشکراکرد کەیەکیەتی سوڤیەت تەنیا بەمەرجێك دەتوانێت درێژە بەژیانی خۆی بدات کە هێزی هاوپەیمانان فریای بکەون. بەلام یارمەتی گەیاندن بەسوڤیەت بۆخۆی کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزبوو. چونکە نەدەبوو لەرێگای باکوورو بەندەری "مورمانسك"ە وە پێداویستی‌و کەل‌و پەلی سەربازی بۆ بڕوات‌و نەدەبوو لەرێگای دەریای ناوەڕاستەوە ئەم کارەبکرێت. لەبەر ئەوە تورکیا رێگای رۆشتن بۆدەریای رەشی لەتەنگەلانەکاندا داخستبوو وسوپای ئەفریقی مارشال رومێل- یش هەرەشەی لە بەندەری ئەسکەندەریە دەکردو هێزەکانی نازی-ش بولگاریاو یۆنانی داگیرکردبوو. دواتریش لەهاوینی ۱۹٤۲ دا هێزی موتۆریزەی ئەڵمان توانییان خۆیان بگەیەننە نزیکی ناوەندە نەوتییەکانی سوڤیەت لەقەفقاز.
بەمجۆرە، هاوپەیمانان تەنیا لەرێگایەکەوە دەیان توانی بەوپەڕی ئاسایشەوە یارمەتی سوڤیەت بدەن‌و ئەم ڕێگایەش جگەلە کەنداوی فارس‌و ولاتی ئێران نەبوو. ئێران بەرەو ئەوەدەچوو تاجارێکی دیکە گرنگی پلەیەکەم بوونی خۆی لەرووی ستراتیجییەوە –نەتەکتیکی– لەناوچەکەدا نیشان بدات.

هەرلەوکاتەدا مەلیك فارۆق کەمن لەگەڵ خۆشکەکەی ژیانی هاوبەشم پێکهێنابوو، لەرێگای باڵوێزی میسرەوە لەتاران ئاگاداری کردم کەسوپای بریتانیا لەناوچەکەدا دەستی کردووە بەجموجوڵ و پێدەچێت ئەم مانۆڕانە سەرەتایەك بێت بۆهێرش کردنە سەرئێران.

من باوکم لەم کێشەیە ئاگادارکردەوەو ئەوەیش خێرا بەناردنی بروسکەیەك بۆ "موقەدەم" وەزیرموختاری ئێران لەلەندەندا، داوای لێکرد بەپرس وجۆکردن لەبەرپرسانی بریتانیایی بزانێت کەئامانجی راستەقینەی بریتانیاییەکان لەدەسپێکردنی جموجۆڵی سەربازی لەناوچەکەدا چییە. هەرلەوکاتەدا دەگوترا کە کەشتییەبازرگانییەکانی ئەڵمان لە کەنداودا چەکیان پێیەو هەروەها چەند فرۆکەیەکی ئیتالیاش دووسێ بۆمبێکیان لەناوچەی کەنداوی فارسدا خستوەتەخوارەوە.

بێگومان لەو قۆناغەدا دەکرا رێگایەك بۆ رێکەوتن بدۆزینەوە و یارمەتی هاوپەیمانان بدەین کە پێداویستی و کەل و پەلەکانی خۆیان بۆسۆڤیەت بگوازنەوە . بەلام وەزیری موختاری ئێمە لەلەندەن هیچ وەلامێکی لەبەرپرسانی بریتانیاییەوە سەبارەت بە ئامانجەکەیان بەدەست نەهێنا. لەتارانیش دا باڵوێزەکانی بریتانیاو رووس پاڵەپەستۆیان دەخستە سەرمان کەهەرچی زووتر شارەزایانی ئەڵمانی لە ئێران دەربکەین.

ئێمە خەریکی هەڵگرتنی هەنگاوە سەرەتاییەکانی دەرکردنی شارەزایانی ئەڵمانی بووین کەلەناکاو لەیەکەمین کاتژمێرەکانی بەرەبەیانی رۆژی ٢٣ ی ئاگۆستی ١٩٤١دا (٢٥ی ئاگۆست دروستە-و.) هێزەکانی رووس و بریتانیا بەبێ هیچ ئاگادار کردنەوەیەکی پێشتر پەلاماری ئێرانیان دا.

لەباکوورەوە، یەکە بە هێزەکانی موتۆریزەی سۆڤیەت لەسنوورەکانی ئازەربایجان و، بەشێکی ترلە سنوورەکانی رۆژهەلاتەوە بەخوراساندا تێپەرین و هاتنە ناوخاکی ئێران. هەرلەوکاتەدا پێنج لەشکری بریتانی لەسنوورەکانی رۆژئاواوو باشوورو باشووری رۆژهەلاتەوە پەلاماری ئێرانیان داو هێزی ئاسمانی

پاشایەتی بریتانیاش هەندێ ئامانجی سەربازییان لە ئەهوازو بەندەری شاهپوورو خورەمشەهردا بۆردمان کرد. بەڵام وریابوون کە دامەزراوە نەوتیەکانی باشوور لەهێرشی ئاسمانی بەدووربێت.
لەلایەکی دیکە، لەبەرەبەیانی ٢٥ ی ئاگۆستدا کەشتییێکی جەنگی بریتانی بەناوی "شورهام" کەشتییێکی بچووکی ئێمەی لەکەناری ئابادان- دا نقوم کردو هەروەها فڕۆکەکانی سوپای سوڤیەتیش شارەکانی تەوریزو قەزوینو بەندەری پەهلەویو رەشتو رەزاییەی بۆردمان کرد.
موحەمەدی ساعد باڵوێزی ئێمە لەمسکۆ سەبارەت بەم کارەی سوڤیەت، نارەزایەتی خۆی گەیاندە مولۆتۆفو داوای لێکرد وەڵامی ئەم پرسیارەبداتەوە کە: بۆچی سوڤیەت کەوتوەتە ژێرکاریگەری جموجۆڵەکانی بریتانیاو لەگەڵ ئەواندا بەشداری چالاکی سەربازی لەدژی ئێران کردووە؟
لەو کاتەدا مولۆتۆف وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدایەوە. بەڵام ئێستا ئێمە چاك دەزانین کەبڕیاری هێرشو کردنەوەی ڕێگاکانی ئێران بۆگەیاندنی یارمەتی هاوپەیمانان بۆسوڤیەت، پێشتر لەکاتی چاوپێکەوتنی چرچیلو رۆزڤێلت دا لەسەر کەشتییێکی ئەمریکیو لەکاتی واژۆکردنی پەیمانی ئەتلانتیك دا، درابوو.
رۆژی٢٨ی ئاگۆستی ١٩٤١ رەزاشا فەرمانی بەیەکەکانی سوپای ئێران کرد کە چەکەکانیان دابنێن. دواتریش ئاگادارکراینەوە کە: رۆژی ١٧ ی سێپتەمبر هێزەکانی هاوپەیمانان دەیانەوێت پایتەخت داگیربکەن. کاتێکیش باوکم لەنزیك بوونەوەی هێزەکانی بریتانیایی بۆتاران ئاگاداربوو، دەسبەجێ منی بانگ کردو پێی گوتم:" پێت وایە بتوانم لەئەفسەرێکی بێ قیمەتی بریتانیایی فەرمان وەربگرم؟" ودوابەدوای ئەوەش لە رۆژی١٦ ی سێپتەمبردا باوکم بەڕەسمی وازی لەدەسەڵات هێنا. دەقی نامەی دەست لەکارکێشانەوەکەی ئەو لەلایەن موحەمەدعەلی فروغی، سەرۆك وەزیرانی ئێران، لەپەرلمان دا بەمجۆرە خوێندرایەوە:

...من، شای ئێران، کەلەلایەن خواوخەڵکەوە پشتگیریم لێکراوە، ئێستا لەرووی ناچارییەوە ملم بەم بڕیارەگرنگەداوە کەلە بەرژەوەندی کوڕی خۆشەویستم موحەممەد رەزا پەهلەوەی دا واز لەدەسەڵات بهێنم...

پەرلەمان بەتێکرای دەنگ دەست لەکارکێشانەوەی باوکمی پەسەندکرد. بەلآم کێشەکە ئەوەبوو کەمن چۆن دەمتوانی بۆگرتنە دەستی پلەی پاشایەتی و سوێندخواردن، خۆم بگەیەنمە بینای پەرلەمان. لەوکاتەدا تازە هێزەکانی بریتانیا و رووس هاتبوونە ناوتاران، رۆشتنی من بۆپەرلەمان کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبوو. بەلآم ئامادەبوونی بەربلآوی خەڵك منی دڵنیاکرد کە دەتوانم خۆم بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بگەیەنمە بینای پەرلەمان. دواتریش کە ڕێو ڕەسمی پەیوەندیدار کۆتایی پێهات، هەستی خەڵك ئەوەندە ورووژابوو کەتەنانەت دەیان ویست ئۆتۆمبیلی هەڵگری من لەسەرزەوی بەرزبکەنەوەو لەسەرشان بیبەن.لەوچرکەساتە هەستیارو پڕمەترسیانەدا ، دەربڕینی هەست وئۆگری خەڵکی ونیشتمانپەروەرانە بۆبنەماڵەی ئێمە،شتێك بوو کە بەخەیاڵدا نەدەهات و ڕووداوێك بووکە هەرگیز ناتوانم لەبیری بکەم.

لەڕێوڕەسمی سوێندخواردنی مندا باڵوێزەکانی بریتانیا و ڕووس بەشدارییان نەکرد. بریتانیاییەکان حەزیان دەکرد پشتیوانی لەشازادەیەکی قاجاڕبکەن بۆلەئەستۆگرتنی پاشایەتی ئێران کە وەك ئەفسەر لەهێزی دەریایی پاشایەتی بریتانیا خزمەتی دەکرد. باڵوێزەکانی بریتانیا ورووس و دەوڵەتەکانیان سێ ڕۆژدواتر بڕیاریان دا دان بەفەرمانڕەوایی مندا بنێن و، ئەمەش هەڵبەت هۆکارێکی نەبوو جگەلەوەی کە خۆپیشاندانی بەربلآوی خەڵك بۆ پشتیوانی لەمن بەوانی نیشاندا کەبەڕاستی ناتوانن کەسێکی دیکە لەجێگای من دابنێن.

هێزە داگیرکەرەکان چاوەڕوان بوون من ببم بەپاشایەکی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوان. تەنانەت خەیاڵیشیان هەرئەمەبوو کەبەئاسانی دەتوانن شایەکی گەنج هەرجۆر بیانەوێت ئاراستەبکەن. ئامانجی ئەوان هەمیشە هەرئەمە بووە. هەرواکە

لەسالی۱۹۰۷یشدا هەولیان دا ئیران بکەن بەناوچەیەکی بێ کەلک و بیکەن بەولاتێك کەحکوومەتێکی بەهێزی تێدا نەبێت بەلام خاوەن ئابڕووبێت.
باوکم کەبەردەوام هەموو هەولی خۆی بۆدابین کردنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی ئێران وەگەڕخستبوو، پەیامێکی بۆم نارد کەلەسەرگرامافۆن تومارکرابوو ولەودا ئاماژە بەمن دەیگوت:" رۆلەکەم لەهیچ شتێك مەترسە". هەلبەت من هەرگیز دوای سەفەری باوکم ئیتر ئەوم نەبینیەوە، تاسەرئەنجام لەسالی۱۹٤٤دا هەوالی مردنی ئەوم لە ژوهانسبورگدا، بیست.
بەبیستنی هەوالی مردنی باوکم، خەمێکی قورس سەرتا پێمی داگرت و هاوکات هەستم کرد کەبۆ رێزلێنان لەیادوبیرەوەری ئەو پێویستە ڕێگاو ئامانجی ئەو تائەو ئاستەی بۆم دەلوێت درێژەپێبدەم. هەروەها لام روون بوو کەجارێکی تر مەسەلەی مردن و ژیانی ئێران لەگۆڕێدایە و ئێمەلەکاتێکدا لەگەڵ باروودۆخی وەك۱۹۲۰ دەستەویەخەین کەلەسالی۱۹٤۱داین و منیش تەمەنم ۲۲سال زیاتر نییە.

## ناسینی دەسەلاتداریتی و سەربەخۆیی ئێران:

بەرلەهەمووشتێك دەبوو بۆ کێشە ئالۆزەکانی بەردەممان ڕێگەچارەیەکی گونجاو بدۆزینەوە و، ئەم کێشانەش بەگشتی لەداگیرکردنی ئێران بەهۆی هێزی سەربازی دوو دەولەتی دەرەکییەوە سەرچاوەی دەگرت.
لەجەنیوەری۱۹٤۲دا توانیمان پەیمانێکی یەکیەتی سێ لایەنە لەگەڵ بریتانیا و سوڤیەتدا واژۆ بکەین، کەبە پێی ئەوپەیمانە: هاوپەیمانان بەفەرمی دانیان بەحکوومەت و سەربەخۆیی سیاسی ئێراندا نا. هێزی هاوپەیمانان دەبوو ئەوپەڕی لەماوەی شەش مانگ پاش کوتایی هاتنی شەڕی ئەوان لەگەڵ ئەلمان و شەریکەکانیدا، خاکی ئێران چۆڵ بکەن(بەپێی فەسلی پێنجەمی پەیمانەکە).
هەروەها لەفەسلی شەشەمی پەیمانەکەدا، هاوپەیمانان دەروەست بوون

کەلەپەیوەندی خۆیان لەگەڵ ولاتانی دیکەدا ڕێگاوشێوازێك هەڵنەبژێرن کەزیانی بۆ یەکپارچەیی خاك و دەسەلاتدارێتی یان سەربەخۆیی سیاسی ئێران هەبێت.
بەمجۆرە، لەماوەی ساڵەکانی ١٩٤٢تا١٩٤٦ من ناچاربووم بۆبەرگری کردن لەولات بەرەو ڕووی هێرش گەلێك ببمەوە کەچ بەشێوەی ڕاستەوخۆو چ نهێنی وناڕاستەوخۆ یەکیەتی میللەت و ژیانی ڕامیاری وئابووری ولاتی کردبووە ئامانج.
گرنگترین هۆکاری بێ سەرەوبەرەی ئابووری، بوونی بازاڕی ڕەش و کەڵك وەرگرتنی نابەجێ لەپێداویستییەکان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا من توانیم لەهەڵوەشاندنەوەی کارگەکانی چەك وچۆڵ سازی ئێران و گواستنەوەیان بۆسوڤیەت ڕێگری بکەم و، لەبەرامبەردا هەمووکارگەکانم خستەبەردەست هاوپەیمانان هەتا بۆکاروباری جەنگیی خۆیان کەڵکی لێوەربگرن.
لەسەردەمی سەرۆك وەزیریی قەوام دا،باڵوێزی یەکێك لەولاتانی داگیرکەری ئێران هات بۆلام و گوتی: بەهۆی ئەو متمانەی کەهاوپەیمانان بەرامبەر بەکابینەی قەوام هەیانە، هیواداران ئێمە لەگەڵ چاپ وبلاوکردنەوەی پارە بۆکەڵك وەرگرتنی هێزی داگیرکەر لەئێراندا ڕەزامەندی دەربڕین. منیش بەسەرنجدان بەوەی کە پەرلمانیش ڕووێکی ئەوتۆی بەم کارە نیشان نەدابوو، لەوەلامی باڵوێزدا گوتم کە: لەولاتانی دەرەکییەوە فەرمان وەرناگرین.
لەبواری سیاسیشدا، جم وجۆڵ بۆجیاکردنەوەی بەشێن لەولات لەگۆڕێدابوو کەپێویست بوو لەگەڵیان بەرەو ڕوو ببیتەوە. ئەم جۆرە جم وجۆلانە لە دەرەوە یان ناوەوەی ولاتەوە ئاڕاستەدەکرا. ڕووسەکان بەپێی ڕەفتاری خۆیان حیزبێکیان بەناوی "توودە" لەسەربنەمای ڕێبازی خۆیان دامەزراندبوو، کەلەوکاتەوە تائێستا – چ لەسەردەمی چالاکی ڕەسمی و چ لە نهێنی دا– هەرگیز لە هەوڵدان بۆبچڕاندنی یەکیەتی نێوان میللەت و لاوازکردنی ورەی خەڵك ڕانەوەستاوە.
ئۆرگانی حیزبی توودە ڕۆژنامەیەك بوو بەناوی (مردم) کەخەرجییەکانی لەسەرەتادا بەهۆی کەسێکەوە بەناوی " مستەفا فاتێح" دابین دەبوو کەفەرمانبەری

کومپانیای نەوتی ئێران و بریتانیا بوو. فاتێح کاتێ بوو بە راوێژکاری جەنڕاڵ "فریزێر" (فەرمانبەری تایبەت بەکاروباری سەربازی باڵوێزخانەی بریتانیا لەئێران)، چەندمانگ دوای ئەوە هەموو هێزوتوانای خۆی بەگەڕخست بۆئەوەی پۆستی فەرمانداندەیی گشتی هێزەچەکدارەکانی ئێران لەمن بسنرێتەوە. ئەمەهەر ئەوسیاسەتەی بووکەساڵانی دواتر موسەدێقیش گرتیەبەر.

هەرلەدرێژەی ئەم رەفتارەدا،چەندساڵ دواتر ڕووسەکان ڕاستەوخۆ دەستیان کرد بەپشتیوانی کردن لەگرووپە یاخیبووەکانی "قازی موحەممەد" لەکوردستان و "پیشەوەری" لەئازەربایجاندا. هەروەها سوڤیەت لەکاتێکدا درێژەی بەمانەوەی هێزەداگیرکەرەکانی خۆی لەئێراندا دەدا، کەبریتانییەکان وئەمریکییەکان ڕاست لەکاتی دیاری کراو لەپەیمانی یەکیەتی سێ لایەنەی جەنیوەری ١٩٤٢دا هێزەکانی خۆیان لەئێران بردبووە دەرەوە.

مانەوەی هێزەکانی سوڤیەت لەئازەربایجاندا بووە هۆی ئەوەی کەبارودۆخ لەو ناوچەیەدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتر ببێت و پاشانیش دوای گەماڕودانی پادگانی تەورێز لەلایەن یاخیبووانەوە، فەرماندەی لەشکر لەژێر پاڵەپەستۆی هێزی سوڤیەتدا خۆی ڕادەستی یاخیبووان کرد. لەبەر ئەوە کاری ئەم فەرماندەیە بەهەرحاڵ بەجۆرێك لەخەیانەت دێتە ئەژمار، سزای لەسێدارەدانی بەسەرداسەپا، بەڵام دواتر بەخشرا.

## بوون یان نەبوون:

یەکێك لەدەرئەنجامەکانی خۆبەدەستەوەدانی پادگانی تەورێز، ئەوەبووکەیاخی بووانی کورد داوای خودموختاری کوردستانیان کرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا، بەرخۆدانی ئازایانەی زۆربەی خەڵك لەهەمبەر جیایی خوازاندا، وەك پاڵپشتێکی بەهێز، بوو بەجێگای کەڵك وەرگرتنی سەرۆك ترۆمێن ولەرۆژی ٨ی مارسی١٩٤٦دا بەتوندی بۆ دواجار مولۆتۆڤ ئاگادارکردەوە، کەئەنجامەکەی

چوونەدەرەوەی هێزەکانی سوڤیەت بوو لەئێراندا لەمانگی مای١٩٤٦دا. بەمجۆرە ئێران پاش ،چەند ساڵ سەرئەنجام لەهێزەکانی داگیرکەر پاك بووەوە.
بەڵام خەباتێك کەبۆپاراستنی مانەوەی ئێران دەستی پێکردبوو هێشتا دەبوو بەردەوام بێت و، ئێمە ناچاربووین بەدڵ بەرگری بکەین بۆئەوەی سەربەخۆیی وڵات بەتەواوەتی دابین ببێت. چونکە لەدرێژەی هەوڵەکانی جیایی خوازیی لەرۆژئاوای وڵاتدا، ئێستا کێشە گەلێك لەباشووری وڵات وبەتایبەت لەئابادان دا- کەکاریگەریی حیزبی توودە لەوێدا زۆربوو- سەری هەڵدابوو.
لەبەرئەوەی کەلەهەمان کاتدا گرووپێ لە هۆزی فارسەکان لەناوچەی دەور و بەری شیرازو ئیسفەهانیشدا یاخی ببوون، پێدەچوو بریتانییەکان و ئەمریکییەکان بیانەوێت نارچەیەك بۆ دەست رۆیشتووی خۆیان لەباشوورو باشووری رۆژئاوای وڵاتدا فەراهەم بکەن تائەگەر ئێران نەیتوانی بەسەر دووپارێزگای ئازەربایجان و کوردستاندا زاڵ ببێت، ئەوان جێ پێیەکیان هەبێت.
سەرکەوتن بەسەر ئەم گرووپە یاخیانەدا کارێکی تا رادەیەك ئاسان بوو، بەڵام ئەم کارە سەبارەت بەیاخیبوون لەئازەربایجاندا نەیدەتوانی بەئاسانی بەدی بێت. چونکە ڕووسەکان چەندین گرووپی گەورەی چەکداری لایەنگری خۆیان لەوێدا هەبوو کەلەڕاستیدا هیچ جیاوازییێکیان لەگەڵ هێزەکانی داگیرکەری سوڤیەت دا نەبوو.
لەوکاتەدا،سەرەتا پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران لەئەستۆی "ئیبراهیم حەکیمی" دابوو کەپیرە پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو بەڵام زۆرلایەنگری لەبریتانییەکان دەکرد. دواتر لەبەرئەوەی کەپەیوەندیەکانمان لەگەڵ سوڤیەتدا بێ ئاکام مایەوە، چیتر نەیتوانی بەردەوام بێت و هەربۆیە ناچاربوو لەپۆستی سەرۆك وەزیران وازبێنێت. سەبارەت بەسەرۆك وەزیرانی دواترکە "ئەحمەد قەوام" بوو، پێم وابوو کەناتوانێت سەرکەوتنێکی ئەوتۆم بۆبەدی بێنێت. چونکە ئەوخێرا دوای هەڵبژاردنی بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران سەردانی مسکۆی کرد و لەوێ رێکەوتن

نامەیەکی لەبواری دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوتدا واژۆکرد که ٥١٪ سوودو داهاتی بۆسۆڤیەت و ٤٩٪ بۆئێران دەبوو.

بەڵام بەخۆشییەوە لەرێکەوتننامەکەدا ماددەیەك هەبوو کەبەئاشکرا دەیگوت: ئەگەر دەقی رێکەوتننامەکە لەلایەن پەرلەمانی ئێرانەوە پەسەند نەکرێت، بایەخی یاسایی نابێت.

قەوام لەگەڕانەوەیدا لەسۆڤیەت بەرێکەوتننامەیەکەوە کەلەگیرفانیدابوو وتووێژی لەگەڵ یاخیبووانی ئازەربایجاندا دەسپێکرد. ناوبراو تەنانەت داوای لەمن کرد کەبەبەرزکردنەوەی پلەی ئەفسەرانی یاخی بوو ڕازی ببم‌و بەهەریەك لەوان دووپلە ببەخشم، بەجۆرێکە بۆنموونە کەسێك بەپلەی ستوان یەکەمی ببێت بەسەرگوردو شتی لەم جۆرە. بەڵام من لەوڵامدا گوتم کە:" پێم باشترە دەستم بقرتێت‌و وەها فەرمانێك واژۆ نەکەم..." لەوکات و ساتەدا زۆربەی فەرمانەدەکانی سوپا، جگە لەرەزم ئارا (سەرۆکی ناوەندی فەرماندەیی سوپا)، پێداگرانە پێشنیاریان بەمن دەکرد کەبەهەرجۆرە کردەوەیەك کەببێتە هۆی هاندانی ڕووسەکان بۆدەستێوەردانی سەربازی لەئێراندا، خۆببوێرم.

بەڵام من بەپێچەوانەی هەموو ئەم ڕاسپاردانە بڕیارم دا بەتوندی بەرەو ڕووی کێشەکە ببمەوە و بۆدەستبەسەراگرتنی دووبارەی ئازەربایجان هەنگاو هەڵبگرم. من ئەم بڕیارەم – بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆربەی پیاوان‌و فەرمانەدەکان کەبەلایانەوە بڕیارێکی ناشارەزایانەوبێ باکییێکی بێجێ بوو– لەڕووی زانیاری ڕاست‌و دروستەوە دابوو.

چونکە دەمزانی یاخیبووان ئەگەرچی لەڕووی چەك‌وچۆڵەوە بەهێزترلەهێزی سەربازی ئێمەنەبوون، بەڵام دەیانویست لە داهاتوویێکی نزیکدا بەوەرگرتنی چەك‌وچۆڵی نوێ‌وپێشکەوتوو خۆیان بەهێزبکەن. بۆئەم مەبەستەش چەندگرووپێکیان رەوانەی سۆڤیەت کردبوو بۆئەوەی فێری تەکنیك‌وهونەرەکانی تایبەت بەفڕۆکەو دەبابە ببن. ئەم کەسانەش لەماوەی ساڵێکدا بەکردەوە دەچوونە خزمەتی یاخیبووانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، من پێم باش بوو مەترسی بەشداری

لەشەڕێکی سەربەرزانەدا قەبووڵ بکەم، بەڵام هەرگیزپاشایەك نەبم کەبەگوێ لەمستوسەرشۆڕ بیناسن. سەرەڕای ئەمە، "جۆرج ئالێن" باڵوێزی ئەمریکا لەئێران، کەلەدۆستانم بوو وپشتیوانی لێدەکردم ئاگاداری کردمەوەو گوتی:" ...ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا سەداسەد لەگەڵ بۆچوونی ئێوە هاوڕایە، بەڵام هەرگیز ئامادە نییە لەبەرئێوە شەڕلەگەڵ سۆڤیەتدا بکات..."

هەڵبەت منیش وەهاچاوەڕوانییێکم لەئەمریکا نەبوو،بەڵام هەستم دەکرد کەهەموو خەڵك لەپشتمن. هۆکاریشی بوونی کۆمەڵێکی زۆر لەوکەسانەبوو کەدڵخوازانە بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ یاخیبوواندا ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی. دواتریش کاتێك قەوام چاوپۆشی لەسیاسەتەکەی خۆی کردو لەگەڵ بڕیارەکەی من بۆتێکشکانی یاخی بووان کەوت، پلانی هێرشەکەیان دەسپێکرد.

بۆئەوەی بزانم پلانی هێرشەکە چۆن دەڕواتە پێش، لەگەڵ ژەنراڵ رەزم ئارا – کەبەردەوام پشتیوانی لەمن دەکرد- چەندجار بەسەرمەیدانی ئۆپراسیونەکاندافڕیم، هەندێ جار بەفڕۆکەیەکی کۆن و هەندێ جاریش بەفڕۆکەیەکی بچووکی جووت بزوێنەری "بیچ کرافت"، کەتەنانەت هیچکامیان ئامێری رادیویی بێ تەلیان نەبوو. تاسەرئەنجام هێزەکانی دوژمن کەلەژێر فەرمانی پێشەوەری دابوون و موریدی پووسەکان بوون، سێ پارچەکران و لەبەریەك هەڵوەشان. دواتریش پیشەوەری و هاودەستانی لەسنوور تێپەرین و بەرەو سۆڤیەت هەڵاتن.

هەرلەوکاتەدا باڵوێزی سۆڤیەت هات بۆلام وبەتووڕەییەوە داوای لەمن کرد کەوەك سەرۆکی وڵات و فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکان، گورج فەرمان بەهێزەکانی ئێران بکەم کە ڕاوەستن، هەتا بەمجۆرە لە "مەترسی خستنی ئاشتی جیهانی" خۆم بوارد بێت.

لەگەڵ ئەوەی کەداواکارییەکەی باڵوێزی سۆڤیەتم قەبووڵ نەکرد، دڵنیام کردکە ئامانجی سوپای ئێران هەڕەشەکردن لەهیچ کەس و هیچ شوێنێك نییەو مەبەستی ئێمە گێڕانەوەی بارودۆخەکەیە بۆباری پێشوی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن لە

ناوچەیەکدا کەهی خۆمانە. هاوکات بۆئەوەی بەکەڵکی بێت پێم گوت:" دەبێت بزانێت کەهەرئێستا یاخیبووان خۆیان بە دەستەوە داوە".

بەمجۆرە، دووەمین پلانێک کەبۆسڕینەوەی ئێران لەسەرنەخشەی جیهان داڕێژرابوو، تووشی شکست هات. جاری یەکەم کاتێک بووکەلەساڵی١٩٠٧دا هاوکات لەگەڵ بەستنی پەیمانی نێوان بریتانیاو رووس لە٣٠ی ئاگۆستی ئەوساڵەدا وڵاتی ئێران کرا بە دوو بەش،رووسەکان بەشی باکوورو بریتانییەکانیش بەشی باشووریان برد بۆخۆیان. بەڵام لەکوتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا، رەزاشا جارێکیتر توانی یەکپارچەیی وڵات مسۆگەربکات.

هەوڵدان بۆجێبەجێ کردنی دووبارەی گەڵاڵەی دابەشکردنی ئێران، دوای دەسپێکردنی:

شەڕی دووەمی جیهانی، نیشانی دا کە وڵاتانی رۆژئاوا بەردەوام لەوەها گەڵاڵەگەلێن سەبارەت بەئێران پشتیوانی دەکەن. چونکە لەساڵی ١٩٤٥دا "ئێرنێست بوین" (وەزیری دەرەوەی بریتانیا) و "جۆزێف برێنس"(وەزیری دەرەوەی ئەمریکا) لەمسکۆدا پێشنیاریان بەستالین کرد کەئازەربایجان‌و کوردستان‌و خووزستان ببن بەناوچەی خودموختار. کە هەڵبەت لەسەرەتادا ستالین بۆچوونەکەیانی قەبوول کرد، بەڵام دواتر بەسەرنجدان بەبۆچوونی وەزیری دەرەوی سۆڤیەت (مولۆتوۆ) لەقەبوول کردنی پێشنیارەکەی ئەمریکاو بریتانیا خۆی بوارد. لەبەرئەم هۆیەی کە مولۆتۆف باوڕی وابوو: سۆڤیەت بەتۆزێ چاوەڕوانی دەیتوانی سەرانسەری ئێران بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆی. واتا سۆڤیەت بەیارمەتی کۆمۆنیستەکانی ئێران لەکۆتاییدا هەموو ئێرانی -نەویلایەتێك یان نیوەی- دەخستە ژێردەستی خۆی‌و لەم رووەوە لەدژایەتی کردنی هاوپەیمانانیش باکێکی نەبوو.

پێویستە بوترێت کەئەم بۆچوونەی ڕووسەکان هیچ هۆکارێکی نەبوو جگەلەبێ ئاگایی ئەوان لە: چۆنیەتی کاردانەوەی من، توانایی سەربازی ئێرانی (سەرەرای لاوازی کەل‌وپەل‌وپێداویستیەکانیان)، هەروەها رادەی وەفاداری خەڵکی ئێران بە

تـاج و تـەخت ونیـشتمانیان. لەکاتێکـدا کەهـەموو هەوڵـە ئۆرگانیزەکراوەکـان لـەدەرەوەی ولاّت بـۆ دابەشـکردنی ئێـران بـێ ئاکـام مایـەوە، زنجـیرە هەوڵـدانێك لـەناوەوەی ولاّت بۆزیـان گەیانـدن بەبناغـەی ولاّت دەسـتیپێکرد. هۆکـارانی فیتنەوستوونی پێنجەم بەهاوکاری یەکتر لەدژی میللەت و یەکپارچەیی ئێران - کەبەرگریکردن لەیەکپارچەیی و یەکیەتی ئەوان ئەرکی من بوو- دەست بەکاربوون. زۆربـەیان راسـتەوخۆ لـەدەرەوە ولەلایـەن کەسـانێکەوە ئاراسـتە دەکـران کەجگـە لەرێگای گەیشتن بەو ئامانجانەی کەدژی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێرانییەکان بوو هـەنگاویان هەڵنـەدەگرت. هەڵبـەت چـەکێکی تیـژتر لـەفریودانی خەڵکیـشیان بەدەسـتەوە نـەبوو. ڕاسـت هـەر ئەوچـەکەی کەپێدەچـێت ئـەم رۆژانـە هۆکـاری سەرکەوتن بووبێت. بنەمای ئەم کارە ئەوە بووە کەئێران -بەهەرشێوەیەك بووە- لە پێـشکەوتن ڕاگـرن و بەرەوشـێواوی و کۆیلـەیی ببـەن. ئـەم ئامانجـە نەلەساڵی١٩٠٧داو نەلـەماوەی سـاڵەکانی ١٩٤٥و١٩٤٦دا بـەدی نـەهات. بـەلاّم هەوڵـەکان سـەرئەنجام بـە ئاکـام گەیـشت و لـەم رۆژانـەدا ئـەو بەرهەمانـەی کەئەوان دەیان ویست بەدی هات.

# فەسڵی ٦

## موسەدێق، نەزان خڵەتێنێک لەلووتکەی دەسەڵاتدا

لەساڵی١٩٤٧دا سەردانی ئازەربایجانم کرد. لەوپارێزگا رزگارکراوەداو لەرێگای گەڕانەوەمدا بۆتاران، بۆهەرشوێنێ کەڕۆشتم، لەگەڵ پێشوازی خەڵك و خۆپیشاندانی کەسانێك دا بەرەو روو بوومەوە کەلەو پەڕی ورووژاویدا لایەنگرییان لێم دەکرد.

ئەوەی لەو سەفەرەدا ڕووی دا ئەوەندە کاری لەمن کرد کەهەرگیز لەبیری ناکەم و ئەمرۆش کەبیری لێدەکەمەوە، بەراستی دڵتەنگ دەبم. لەوکاتەدا، قوناغی بەرگری گشتی بۆپاراستنی مانەوەی میللەت بەسەرچووبوو وبەرەو سەردەمی بنیاتنان هەنگاومان هەڵدەگرت.

قەوام سەرۆکی وەزیران کەلە دوای بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن توانی بووی زۆرینەی پارلەمان بەدەست بێنێت، ڕاست وەك من بیری دەکردەوە کەبۆ سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئێران دەبوو خەباتێکی نوێ وهەمەلایەنە دەسپێبکرێت و بۆ گەشە پێدانی وڵاتیش پرۆژەگەلێك ئامادە بکرێت و بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

## كۆششی سۆڤیەت:

نابێت لەبیری بكەین كەلەوكاتەدا ئێمە لەگەڵ پێشنیارێكی ڕووسەكان دا بەرەو ڕووبووین كەئەوەندە جدی بوو زیاتر لەفەرمانێك دەچوو.ئەویش داوای دەسبەجێ دامەزراندنی كومپانیایەكی هاوبەشی سۆڤیەتی-ئێرانی بوو (بە٥١٪پشكی سۆڤیەت و٤٩٪پشكی ئێران) بۆدەرهێنانی نەوت. ڕواڵەتی ئەم پێشنیارە نیشانی دەدا كە ڕووسەكان دەیانەوێت شوێنێك بۆخۆیان لەباكووری ئێراندا ڕاست وەك ئەوەی كەبریتانییەكان لەباشووری وڵاتدا هەیان بوو، پەیدابكەن.

دوای ماوەیەك ئەم بابەتە لەپەرلەماندا كەوتە بەرباس و لەدرێژەی كۆمەڵێك دان وستاندا،گەڵاڵەیەكی یاسایی بەزۆرینەی ١٠٩ دەنگ لەبەرامبەر٢٧دەنگدا پەسەندكرا، كەپێدانی مۆڵەتی نەوت بەدەوڵەتی سۆڤیەتی بەرێگەپێنەدراو ڕادەگەیاند. ڕێبەری نەیارانی پێدانی ئەم مۆڵەتە لەپەرلەمان دا كەسێك نەبوو جگە لەموسەدێق، كەبێگومان دواتر دەربارەی ئەو زیاتر قسە دەكەین.

لەم یاسایەدا بڕیار بووكە:"١...) وتووێژو ڕێكەوتننامەكانی تایبەت بەدروستكردنی كومپانیای هاوبەشی نەوتی ئێران و سۆڤیەت هەڵبوەشێتەوە...٢) پێدانی هەرجۆرە ماڤو مۆڵەتیكی دەرهێنانی نەوت و بەرهەمە نەوتیەكانی وڵات بەبیانییەكان و دروست كردنی هەرچەشنە كومپانیایەك بۆئەم مەبەستە كەبەجۆرێ لەجۆرەكان بیانییەكان لەودا بەشیان هەبێت، هەرگیز ڕێگەی پێنەدرێت...٣) وتووێژ لەگەڵ كومپانیای نەوتی بریتانیا وئێراندا دەبێت هەرچی زووتر ولەسەر ئەم بنەمایە دەسپێبكات كەپێویستە ئێمە پشكی زیاترمان لەقازانجەكانی نەوتی باشووردا هەبێت...٤) ئەگەر لەماوەی سێ ساڵدا بوونی نەوت بەرێژەیەكی بەرچاو لەناوچەكانی باكووری ئێران دا سەلمێندرا، ئەوا دەوڵەت دەتوانێت لەبارەی فرۆشتنی بەرهەمەكانیەوە درگای وتووێژ لەگەڵ یەكیەتی سۆڤیەت دا بكاتەوە..."

سەرەڕای پەسەندكردنی ئەم بڕیارە (بەندی ٤) لەلایەن پەرلمانەوە، پەیوەندیەسیاسیەكانی ئێمە لەگەڵ دراوسێی بەهێزی باكوورمان بەرەو ئاڵۆزی

ڕۆشت. لەکاتێکدا دەمانزانی کەئەم بارودۆخە ڕەنگە ببێتە هۆی قەیرانی نێوان دوو وڵات ،بەڵام هیچ کارێکیشمان بۆ نەدەکرا. هەربۆیە لەمانگی مای١٩٤٨دا بۆ زەمانـەت کردنـی ئاسایـشی وڵات، وەرگـرتنی چەكوچـۆڵی سـووکمان لـە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا دەسپێکرد.

لەوکاتەدا لەبەرئەوەی سەرەڕای ئاژاوە گێڕیەکانی حیزبی توودە توانی بوومان ڕێـژەی دەرهێنـانی نـەوتی خۆمـان سـاڵ بەسـاڵ زیاتربکـەین، هەسـتمان دەکـرد کـەدەتوانین دڵنیـابین. (لەسـاڵی١٩٤٦دا بـڕی نـەوتی دەرهێنـراو گەیشتە١٩ملیـۆن تەن، لەساڵی١٩٤٧دا ٢١ملیۆن تەن‌و لەساڵی١٩٤٨دا گەیشتە٢٥ملیۆن تەن کەلەم بـڕە نەوتـە توانیمـان نزیکـەی ٢٤ملیـۆن تـەنی دوای پـاڵاوتن هـەناردەی دەرەوەی بکەین).

بەڵام هەرلەو هەل‌ومەرجەدا کە هەست دەکرا وڵات ڕزگاری بووە، لەناکاو ٥ گوللەی گومانـاوی لەدەمانـچەکەی فـەخر ئـارایی- یـەوە بـەرەو ڕووم هاوێـژراو بێگومـان منیش هیچ کات نەمزانی کەچ کەسێك لەپشتی ئەوکارەوەیە.

هەر دوابەدوای هەوڵدان بۆ کوشتنی من بوو کە زۆرینەی نزیك بەتـەواوی خـەڵکی ئێران لەئاکامی نەبوونی من لەشوێنی حوکمڕانی دا تێگەیشتن‌و زانییـان کەئەگـەر من نـەبم ئێران بەرەو لەناوچوون دەڕوات‌و هەرواکە ئەمڕۆش پێش هـاتووە، وڵات تووشی شێواوی‌و ئاڵۆزی دەبێت. هـەروەها دەبێت ئەم خاڵـەش زیادبکەم کەلەبـەر ئـەوەی لـەو ڕۆژانـەدا شوێنەمەزهەبیەکانی وڵات بەباشـی لەمەترسـی نـەبوونی مـن ئاگاداربوون، هەربۆیـە زۆربـەی پایەبـەرزانی مەزهـەبی قەزیـەی بـێ ئاکـام مانـەوەی تیرۆری منیان بە "موعجیزەیەکی ڕاستەقینە" لێك دایەوە.

خـەڵکی ئێـران هەمیشە بـەپێی سروشـتیان خـاوەن هەسـتێکی زۆر قووڵ‌وخـاوێن بووگن. هەربۆیـە نەتـەنیا ئەوشـتانەی –سـەرەڕای هـەموو ئەوکۆسپانەی کەهـەبوو– کەبەدەستمان هێنابوو بەتەواوی فامیان دەکرد، بەڵکو بەباشـی دەیانزانی کەئەگـەر هـەموومان یـەکبگرین دەتـوانین پێشکەوتنی زیـاتر بەدەسـت بێـنین. ئەم ڕاسـتیەش کـەمن لەلایـەن دوژمنـانی میللەتـەوە کرابوومـە ئامـانج، بەباشـی دەیـسەلماند

کەرێگایەکی دروستم گرتبووە پێش. کەگەر ویستی خوایش منی لەم شەڕە رزگارکردبوو، کەواتە، بێگومان دەبوو هەرجۆر بووە ئەرکەکەم ئەنجام بدەم و تەواوی بکەم.

## یەکەمین پلانی ئاوەدان کردنەوە:

لەیەکێک لەئاخاوتنە فەرمیەکانمدا لەمانگی فیبریوەری ساڵی١٩٥٠دا خۆاستی خۆم بۆنووسینەوەی یاسایەکی بنەڕەتی نوێ بەڕای گشتی گەیاند. یاسای بنەڕەتی ١٩٠٥کە ئیلهامی لەیاسای بنەڕەتی بەلجیکاوە گرتبوو، مافی هەڵوەشانەوەی مەجلیسی شۆرای میلی بەپاشا نەدەدا. بەلام دەستوورێك کەلەساڵی ١٩٥٠دانرا، دەسەلاتی تایبەتی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی دا بەمن.

پێش لەساڵی١٩٥٠، نوێنەرانی پەرلەمان لەماوەی بەرێوەچوونی هەڵبژاردنەکاندا، کۆبوونەوەکانیان لەپەرلەمان بەردەوام دەبوو. سروشتییە کەئەم کارە ئەوانی لە هەڵبژاردنەوەی دووبارەیان دڵنیادەکرد. ساڵی١٩٤٩ لەسەردانێکم دا بۆ ئیتالیا، کاتێك ئەم شێوازەم بەئاگاداری "گاسپری" سەرۆك کۆماری ئیتالیا گەیاند، ئەوبەسەرسووڕمانەوە وتی:" ئەمەجگە لەحکوومەتی کەسانی بەتواناوکاریگەر شتێکی تر نییە."

لەکاتی شەڕدا، هەڵبژاردنەکانی ئێران بەمجۆرە بەرێوەدەچوو کە: بۆ نموونە سەرلەبەیانی راوێژکاری باڵوێزخانەی بریتانیابەلیستی ناوی ٨٠ پاڵێوراوی نوێنەرایەتی پەرلمانەوە سەردانی سەرۆکی وەزیرانی دەکردو،دوانیوەرۆی هەمان رۆژیش راوێژکاری باڵوێزخانەی سۆڤیەتیش ناوی ١٢کەس لەنوێنەرانی دڵخوازی خۆی دەدا بەسەرۆکی وەزیران.

من بۆکۆتایی هێنان بەم بارودۆخە پڕلەسووکایەتیە، ناسیونالیستێکم بەناوی موسەدێق – کەدواتربوو بە رێبەری جەبهەی میلی– بانگ کردو داوام لێکرد

کەئەگەر رازییە، دەستبکات بەپێکهێنانی کابینەیەك کەبتوانێت چاکسازی لەسیستەمی هەڵبژاردنەکانی وڵاتدابکات وهەڵبژاردنێك بەڕێوەببات کەبەدووربێت لەهەر چەشنە دەستێوەردانێکی دەرەکی. بەڵام بەو پەڕی سەرسوورمانەوە دیتم کە موسەدیق لە وڵامی مندا، قەبووڵ کردنی پۆستی سەرۆکی وەزیرانی بەستەوە بەم سێ مەرجە: ١) ڕەزامەندی بریتانیەکان بەسەرۆك وەزیرانی ئەو. ٢) ئەوەی کەبتوانێت سەرلەبەیانی هەموو رۆژێك چاوی بەمن بکەوێت بۆئەوەی رێنمایی پێویست وەربگرێت. ٣) پاسەوانەکانی کەسانی مەدەنی بن.

به موسەدیقم گوت لەبەرئەوەی پێشترهەرگیز بیروڕای بریتانیەکانم وەرنەگرتووە، لەم بارەشەوە کارێك ئەنجام نادەم. بەڵام ئەگەر پێداگری دەکات،دەبێت بیروڕای رووسەکانیش لەم بارەوە وەربگرین. لەگەڵ ئەوەی کە موسەدیق لەوڵامداگوتی:" لە ئێراندا بەبێ رەزامەندی بریتانیەکان هیچ کارێك ناکرێت و گوێ بۆ رووسەکانیش ناگرین." بەڵام من حوسەین عەلا وەزیری دەربارم بۆ باڵوێزخانەی بریتانیا و ژەنراڵ یەزدان پەنایشم – کەلەقەزاقەدێرینەکان بوو- بۆباڵوێزخانەی سۆڤیەت نارد بۆئەوەی لەبیروڕایان ئاگاداربین.

رووسەکان دەسبەجێ رەزامەندی خۆیان ڕاگەیاند، بەڵام باڵوێزی بریتانیا لە قەبووڵ کردنی خۆی بواردو بەنێردراوەکەی منی گوت:"...شا بەم کارە یاری بە پاشایەتیەکەی دەکات..."موسەدیقیش دوای ئاگاداربوونەوە لەئەنجامی چاو پێکەوتنەکانی نێردراوەکەی من، پۆستەکەی قەبووڵ نەکرد. هەربۆیە شانۆی گاڵتەجاڕانەی هەڵبژاردن لەوڵات دا هەروەك رابردوو بەڕێوەچوو. بەڵام پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە بریتانیەکان بە پێچەوانەی ئەوەی کەلەکاتی قسەکردنیاندا دەربارەی جیاوازییەکانی دیموکراسی، بەردەوام خۆیان زۆرپابەند بەلەبەرچاوگرتن و پاراستنی بنەماکانی دیموکراسی دەزانن، کەچی ئەم کارەیان زۆر بەئاسایی وسروشتی دەزانی کەهەڵبژاردن لەئێراندا بەگوێرەی خواست وبۆچوونی ئەوان بەڕێوەبچێت.

پاش پەسەندکرانی دەستووری نوێ لەساڵی ١٩٥٠، مەسەلەی بەدی هاتنی پلانێکی ئاوەدانکردنەوەی حەوت ساڵە کەلەبیرمدابوو خستمەبەرچاو وکارەکەم لەکاتێکدا دەسپێکرد کەباروذۆخەکەش ئەوەندە گونجاو نەبوو. لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی کەلەلایەن "کۆمەڵەی راوێژکارانی ئەمریکی ماورابحار" ە وە ئەنجام درابوو نزیکەی سێ ملیۆن دۆلاری تێچووبوو، هەروەها بیستوپێنج ملیۆن دۆلاریشمان پێویست بوو هەتا بتوانین دەست بەجێبەجێ کردنی پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە بکەین. بەلاّم ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدانی ئەو برەپارەیە بە ئێمە خۆی دەدزیەوە.
لێرەدا باشترە ئاماژەیەك بەخاڵە گرنگەکانی پلانی حەوت ساڵەی یەکەم بکەم هەتا ئەوشتەی کەمەبەستمان بوو جێبەجێ بکەین روونتر ببێتەوە. هەڵبەتە ئامانجی سەرەکی لەم پلانە شتێك نەبوو جگەلە گەشەپێدانی ئابووری ئێران نەبێت، بەگشتیش لەرێگای یارمەتی دانی گوندنشینان (بەشێوەی چاکترکردنی دامەزراوە کشت وکاڵیەکان) و زیادکردنی بەرهەمو پالاّوتنی نەوتەوە بوو. پێویست بوو بۆئەم کارە بوودجەیەکی ٦٥٦ ملیۆن دۆلاری تەرخان بکرێت کەپرۆژەکەی بەمجۆرەی خوارەوەبوو:

| | |
|---|---|
| باشبوونی هەلومەرجی کۆمەلاّیەتی | ٦, ٢٨٪ |
| کشتوکاڵ | ٪٢٥ |
| گواستنەوەوگەیاندن | ٧, ٢٣٪ |
| پیشەوسەرچاوەکان | ٣, ١٤٪ |
| دامەزراوەکانی نەوت | ٪ ٤,٨ |
| پەیوەندیوراگەیاندن | ٦, ٣٪ |

بەشی زۆری ئەم بوودجەیە دەبوو بۆتەندروستی و فێرکردن تەرخان بکرێت. لەهەرپارێزگایەکدا نەخۆشخانەیەکی ٥٠٠ تا ٦٠٠ قەرەوێڵەیی دروست دەکراو شێوازی جۆراوجۆر بۆ پێشخستنی کاروباری تەندروستی جێبەجێ دەکرا. بڕیاربوو نزیکەی ٥٠٠٠قوتابخانەی بنەڕەتی و ١٥٠ قوتابخانەی ئامادەیی و ٢٦ قوتابخانەی تەکنیکی وپیشەیی لەسەرانسەری وڵاتدا دروست بکرێت. سێ زانکۆی نوێ لەپارێزگاکاندا دروست ببێت و هەمووساڵێك یەك ملیۆن منداڵ و ١٧٥هەزار گەنج سەرقاڵی خوێندن بن.

لەماوەی بەرنامەی حەوت ساڵەکەدا، میکانیزەکرنی کشت وکاڵ لەبەرچاودەگیراو بینای نزیکەی دە بەنداویش لەگەڵ دامەزراوەکانی هایدرۆئەلێکتریك و دروستکردنی جۆگەکانی ئاودێری دەچووە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. لەبەشی پیشەسازیشدا هەوڵدەدرا کاروباری تایبەت بەتوانەوەی کانزاکان، رستن وچنین، چیمەنتۆ، خشت، بەرهەمێن کیمیایی و کەوتنە ڕووی کانەکان لەپێشدا جێبەجێ بکرێت.

دروست کردنی زیاتر لە ٣٠٠٠کیلومەتر ڕێگای نوێ، نوێژەنکردنەوەی ٦٧٠٠ کیلومەتر ڕێگا، ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەر لەپایتەختەوە بۆتەورێزو لەمەشهەدەوەبۆ یەزد، یارمەتی دەگەیاند بەگەشەسەندنی پەیوەندییەکان و بازرگانی لەوڵاتدا. بارودۆخی بەندەرەکانمان لەکەنارەکانی کەنداوو دەریای خەزەردا دەبوو چاکتربێت، فرۆکەخانەی نوێ دروست بکرێت و تۆڕەکانی پۆستەو تەلگراف و تەلەفوون پەرەپێبدرێت.

جگەلەمانە: سوپای ئێران پێویستی بە نوێسازی لەهێزدا هەبوو، هێزی پۆلیس دەبووسەرلەنوێ ڕێکبخرێتەوە، چەك کردنی عەشایر –بەتایبەت لەباشووری وڵاتدا کەهەرکەس چەکێکی پێبوو– بەرێووەبچێت. یاسایێ مەدەنی و سزادان پێویستیان بە پێداچوونەوەبوو، دادگای نوێ پێکبێت و چاکسازیش لەپێکهاتەی ئیداری دا بکرێت. بەڵام لەنێو ئەم بابەتانەدا، لەبەرئەوەی بابەتی عەشایەر گرنگی تایبەتی

هەبوو، پێویست بوو هەرچی زووتر ڕێکخراویکی ڕێكوپێكو كارای بۆ دروست ببێت.

هەرچەند لەسالآنی دواتردا ئێمە توانیمان بڕێکی زۆر وەپێش پلانەکە بکەوین، بەلآم بەداخەوە لەماوەی ئاپریلی١٩٥١ تا جوولای ١٩٥٣ نەمانتوانی بوو هیچ هەنگاوێك بۆ جێبەجیٚ کردنی قۆناغەکانی هەڵبگرین. ئەم ماوەیەش ڕێکەوت بوو لەگەڵ سەردەمێك کەموسەدێق دەوڵەتێکی توندڕەوی بەڕێوەدەبرد.

لەماوەی دانوستان لەگەڵ کومپانیای نەوتی بریتانیا وئێران دا – کەدەمانویست داهاتی ئێمە لەنەوتی خۆمان زیادبکەین– گەشتینە ئەوجێگای کەناچاربووین دانوستانەکە ڕاگرین. ئەم بارودۆخە لەسەردەمی کابینەی "ساعد" دا ڕوویداو، سەرئەنجام لەدەوڵەتی "مەنسوور"یشدا کارێکمان بۆنەکرا، تائەوەی کەلەمانگی جوونی ١٩٤٩دا ژەنراڵ "عەلی رەزم ئارا"م ؛ کەسەرۆکایەتی ناوەندی فەرماندەیی سوپای لەئەستۆبوو (ولەسەردەمی شەڕی ئازەربایجانیشدا هەرئەم پۆستەی هەبوو) بۆسەرۆکایەتی وەزیران راسپارد.

ڕەزم ئارا وتووێژی لەگەڵ بەرپرسانی کومپانیای نەوتی ئێران و بریتانیادا دەسپێکردەوە، بەلآم بووە هۆی ئەوەی کە وتووێژەکان زۆر زۆر درێژە بکێشێت.
من بەردەوام لەخۆم پرسیوە کەئایا وەها شێوازێك بۆ ئەوە نەبوو کەكار لەکاربترازێت؟ یان پیلانێك نەبوو کە نەوتی ئێران – ڕاست وەك ئەوەی کەدواتر لەسەردەمی موسەدێق دا رووی دا– بوەستێت؟

ڕەزم ئارا ژەنراڵێکی باش بوو، بەلآم وەك سیاسەتوان، کەسێکی لاوازونەشیاو ومیانەڕەو بوو. زیاتر لەهەمووشتێك نەزان کاریەکانی ئەوبوو کەبووە هۆی ئەوەی کەجەبهەی میللی موسەدێق لەرووی ڕاگەیاندنەوە مانۆڤر گەلی سەرکەوتووانە ئەنجام بدات.

ئەم بزووتنەوەیە کەخۆی بەجووڵانەوەیەکی نەتەوەیی دەزانی،گرنگترین تایبەتمەندی دژایەتی کردن بوو لەگەڵ بیانییەکانداو لەساڵی ١٩٥١بەدوا "خۆماڵی کردنی نەوت"ی کردبوو بەئامانجی سەرەکی خۆی. هەڵبەت منیش

لەسەرەتادا لەگەڵ نیشتمانی کردنی نەوت هاوڕابووم، بەڵام نەم دەتوانی لەگەڵ ئەوشێوازانەی کە موسەدیق بۆجێبەجێ کردنی ئەم کارە دەیویست ئەنجامیان بدات ، هاودەنگ بم.
لەوماوەدا، خۆپیشاندانی توندوتیژانە لەدژی دەوڵەتی رەزم ئارا بەڕێوەدەچوو کەدەبووە هۆی ورووژاندنی نەفرەتی خەڵکی و پڕۆپاگەندەی توند لەدژی ئەو. تائەوەی کەسەرئەنجام لە رۆژی ٧ی مارسی ساڵی١٩٥١ رەزم ئارا لە بەرامبەر مزگەوتی گەورەدا بەدەستی یەکێك لە ئەندامانی "فیداییانی ئیسلام" –کەتاقمێکی تیرۆریستی دەستە ڕاستی توندرەو بوون– کوژرا.
پاش کوژرانی رەزم ئارا، من لەسەرەتادا یەکێك لەکەسایەتیە بەناوبانگەکانم –حوسەین عەلا– وەك جێنشینی ئەو بۆپێکهێنانی کابینە راسپاردو هیوام ئەوەبوو کەکێشەی نەوت بەدەستی ئەو چارەسەربێت. بەڵام شەپۆلی خۆپیشاندانی دژی لایەنی دەرەکی هەروا درێژەی هەبوو و موسەدیقیش بەردەوام –لە پەرلمان و شوێنەکانی تردا– بەڵێنی بەخەڵك دەدا کەلەدژی دەرەکییەکان خەبات دەکات تامافەکانی میللەتیان لێ وەربگرێت و ئەوسەدان ملیۆن لیرەش کەڕۆژانە کومپانیای نەوتی بریتانیا دەستی دەکەوێت، لەچنگیان دەربێنێت.
زۆربەی سەرۆك فراکسیونە جیاوازەکانی پەرلەمان، کەلەبەر کاریگەری موسەدیق لەسەریان ورووژابوون، لەکاتی راوێژکردنیاندا لەگەڵ من، بەتەواوی دڵنیایان دەکردم کەلەو قۆناغەدا هیچ کەس وەك موسەدیق بۆسەرۆکایەتی کردنی دەوڵەت شیاونییە.
ئەگەرچی من پێشتر لەساڵی ١٩٤٠دا سەبارەت بەموسەدیق رووم لەرەزاشای باوکم نابوو –کەئەوی دەسبەسەرکردبوو– و، هەمیشە لەقۆناغە جیاوازەکاندا حەزم دەکرد لەوەها کەسانێکی ئازا کەڵك وەرگرم، بەڵام لەوکاتەدا بۆ دەستنیشان کردنی موسەدیق وەك سەرۆکی وەزیران نەختێ گومانم هەبوو. بەڵام خێرا بڕیارم دا بەسەرگومانی خۆمدا زاڵ ببم و ئەولەسەر ڕێگایەك دابنێم کەبەدڵنیاییەوە ڕێگای

گەڕانەوەی بۆ نەبوو. هەڵبەت زۆری نەخایاند کەدەرئەنجامەکانی ئەم کارە بەتەواوەتی ئاشکرابوو.

لەبەرئەوەی نەمدەتوانی لەگەڵ گەشبینی هەندێ کەسایەتیدا دەربارەی ڕێبەری جەبهەی میللی کۆك‌وهاوڕابم کەلەرابردوودا چەندجارێك ناکۆکی ئاشکرام لەنێوان قسەوکردەوەی موسەدێق دا دیبوو. موسەدێق بەردەوام خۆی بەلایەنگری هەستی نەتەوایەتی دژی داگیرکاری نیشان دەداو وەك نیشتمانپەروەرێك دەردەکەوت کەئامادەی سازش کردن نییەو دەیگوت کەنابێت هەرگیز هیچ ماڤ ولەسەرو تریێك بدرێت بەهێزەدەرەکییەکان. موسەدێق ئەم بیرۆکەیەی خۆی بە "سیاسەتی هاوسەنگی نەرێنیانە" ناودەبردو گەورەترین عەیبیشی هەردەبوو بەم "ئەرێنی" بوونەی بزانێت.

ڕۆژێك موسەدێق لەلای من بەتام‌ولامەیەکی زۆرەوە کەوتەباس کردن سەبارەت بەهەڵەکانی ڕەزاشا دەربارەی کێشانی هێڵی ئاسنی سەرانسەری ئێران‌وگوتی: ئەم هێڵە لەبەگرێدانی کەنداوی فارس بەدەریای خەزەرەوە، دەرفەتی هێرشی بریتانیەکان بۆسەرخاکی رووسیا فەراهەم دەکات. هاوکات باشترە لەبیری نەکەین کەلەکاتی شەڕدا، کاتێك بیرم لەوەی کردەوە کەموسەدێق بکەم بەسەرۆکی وەزیران، قەبووڵ کردنی ئەم پۆستە بەمەرجی ڕەزامەندی بریتانیا دانا.

موسەدێق ئاخێوەرێکی بەتوانابوو کەداوەری کردن دەربارەی ئەو وەك سیاسەتوانێك هێندەئاسان نییە. چونکە هەمیشە لەنێوان قسەوکردەوەیدا ناکۆکی هەبوو، هەروەها بارودۆخیشی زۆرخێرا دەگۆڕا. هەندێ جار لەکاتێکدا کەشادمان بوو لەپڕتووشی خەمۆکی دەهات. یان لەکاتی ئاخاوتنێکی گەرم‌وگوڕو هەستیارانەدا، سەرەڕای خاترجەمییێك کە نیشانی دەدا، لەناکاو دەستی دەکرد بەگریان‌و ددبوورایەوە.

موسەدێق لەحاڵەتی جۆراوجۆردا، بەهۆکاری سیاسی خۆی لەنەخۆشی دەداو ڕۆڵێکی وای دەگێڕا کەدەتگوت لەکاتی نمایشی کومێدی مردووەکاندا هاوەاردەکات‌و خۆی وەك بوونەوەرێك لەسەرەمەرگدا نیشان دەدا.لەم بارەوە دەکرا

ئەولەگەڵ "ڕوبسپیر" یان "رینتسی" یان تەنانەت کەسایەتیە"کۆمێدیەنەکانی ئیتالیا" بەراوردبکرێت.

بەدڵنیاییەوە موسەدێق کەسێکی بەتەواوی ئەقڵانی نەبوو، چونکە لە سیاسەتدا، بەهەرحاڵ نەیدەتوانی خۆی لەهەستوسۆز بەدووربگرێت. منیش سەرئەنجام بەوئاکامە گەیشتم کەلەپشت دەمامکی ئەم ناسیونالیستەگیان سەختە، پیاوێك خۆی حەشارداوە کەپەیوەندی زۆرنزیکی لەگەڵ بریتانییەکاندا هەیە(هەروا کەدواتر ڕاستی ئەم بۆچوونەی من بەهۆی بەڵگەنامە بڵاوکراوەکانی "سەردار فاخری حیکمەت" سەرۆکی پێشووی مەجلیسی شورای میللی و،هەروەها بڵاوبوونەوەی راپۆرتە سیاسیەکانی نێوان باڵوێزی ئەوکاتی بریتانیا لەتاران و کونسوولی بریتانیا لەشیراز، سەلمێنرا.)

بەراستی چۆن دەکرا ئەوپیاوە – لەکاتێکدا حەوت ساڵ پێش دەیگوت کەلەئێراندا هیچ کارێك بەبێ ڕەزامەندی بریتانییەکان ئەنجام نادرێت– بتوانێت ئامانجەکانی خۆی بەبێ پشتیوانی بریتانییەکان بباتەپێش؟... ئەمە پرسیارێك بوو کەبەڕاستی پێویست بوو بێتەگۆڕێ. لەبەرئەوە لەشوێنانی تردا، سیاسەتی ئەنگلوساکسۆن هەندێ جار دوژمنانی خۆیشی – بەمەرجێکە دەستی بەسەریاندا بڕوات– بەدەسەڵات گەیاندبوو. بەڵام هەڵبەت هەڵەی زۆریش لەم بارەوە ڕووی دابوو، لەبەرئەوە وەها کەسانێك هەمیشەناکرێت بەتەواوەتی بەسەریاندا زاڵ بێت.

کاتێك لە٢٨ی ئاپریلی ١٩٥١دا موسەدێقم وەك سەرۆکی وەزیران دەسنیشان کرد، ناوبراو تەمەنی ٧٣ساڵ بوو. بەمجۆرە، موسەدێق کەبەیەکێك لەگەورە مالیکانی ئێران دەهاتە ئەژمار، توانی بەدەسەڵات بگات. بەڵام لەبەرئەوەی دەیویست دەسەڵاتی رەهای هەبێت، ئامۆژگاریم کرد کەواباشترە هەڵسوکەوتی هێمن و لەسەرخۆ بگرێتەبەرو هاوکات بەبیری ئەوم هێنایەوە کەلەبەر ئەوەی ڕێگای گەیشتنی ئێمە بەسەربەخۆیی سیاسی و ئابووری زۆر پڕمەترسییە، دەبێت لەڕەفتاری توندڕەوانە دووری بکەین. موسەدێقیش بەڵێنی بەمن دا کەبەووریایی و لەسەرخۆیی کاردەکات.

دووڕۆژ دوای هەڵبـژاردنی موسـەدێق وەك سـەرۆكی وەزیـران، پەرلـەمان لـەرۆژی ٣٠ی ئـاپریلی ١٩٥١دا لەسـەرداوای نـاوبراو یاسـای نیـشتمانی كردنـی نـەوتی پەسەندكرد. من كەبەتەواوەتی لەگەڵ ئەم یاسایە هاودەنگ بووم، دەسبەجێ واژۆم لەسەركرد. بەڵام ئاشكرابوو كەلەدوای ئەم یاسایە دەبوو لەگەڵ بریتانییەكان دا سـەبارەت بەنـەوت رێكـەوتنێكی نـوێ پێكبێـت، كەموسـەدێق ئامادەنـەبوو ئـەم كارەبكات. موسەدێق تا دووساڵ لەسەر باوەڕی هەڵەی خۆی مایەوەو بەردەوام پێداگری دەكرد كەجیهان ناتوانێت بەبێ نەوتی ئێران هـەڵبكاتو لەبەرامبەریشدا ئێران، بێ كەڵك وەرگرتن لەهەرجۆرە یارمـەتییێكی دەرەكی بە تـەواوی دەتوانێت نـەوتی خـۆی بفرۆشـێت. موسـەدێق لەبـەر ئـەم جـۆرە بیركردنەوەیـە بـوو كـەهیچ چەشـنە پێـشنیارێكی قـەبووڵ نـەدەكرد. چ پێـشنیاری شـاندەكانی "سـتۆكس" و "هریمن"، چ پێشنیاری كەسانی وەك،چێرچیل، سەرۆك تـرۆمێن، بـانكی جیهـانیو دواتـریش سـەرۆك ئایزێنهـاڤێر سـەبارەت بـەناو بـژیوانی رێكخـراوێن بـێ لایـەن. موسـەدێق كـەدیلی هەسـتی نـەرێنی خـۆی بـوو. تـوانی هـەموو رێگاكـانی گەیشتن بەرێكەوتن بەتەواوەتی دابخات. ئاكامەكەی بووبەوەی كەكاتێك لەدەسـەڵات كـەوت، تەنانـەت نـەیتوانی بـوو بۆچارەسـەركردنی كێـشەكە بـەقازانجی ئێمـە هـەنگاوێك زیاترلـەكاتی دەسـپێكردنی خۆمـاڵی كردنـی نـەوت بڕواتـە پـێش. لەكاتێكـدا هاوبەشـەكانی ئێمـە -كەلـەدوای نیـشتمانی بـوونی نـەوت بوون بەهـەڤرکی ئێمـە- هەرگیز دەسـتیان لەسـەر دەسـت دانـەناو دەسبەجێ پاش خۆمـاڵی كردنـی نـەوت، لەكاتێكـدا شـەپۆلی خۆپیـشاندان دژی دەرەكییـەكان لـەبرەودابوو وئەنـدازیارانی بیانی ئێرانیان بەجێ هێشتبوو، بەرپرسـانی كومپانیـای نـەوتی ئێرانو بریتانیـا كارەكـانی خۆیـان بەتـەواوی راگرتبـوو و، لەدرێـژەی ئـەوەدا نەتـەنیا لـەبری مـاف سوودوەرگرتن لەسەرچاوەی نەوت پارەیـەكیان بەدەوڵـەت نـەدەدا، بـەڵكو پێشیان بەفرۆشتنی نەوتی ئێرانیش گرت.

سـەرئەنجام بەرهـەمهێنانی بەرهەمـە نەوتییـەكان لـە پاڵاوگـەی گـەورەی ئابـادان دا ڕاگیرا. دامەزراوەی نوێی ئێمە كەلەژێر نـاوی "كومپانیـای میللی نـەوتی ئێـران" دا

چالاکییەکانی خۆی دەسپێکردبوو سەرەڕای هەبوونی نەوتێکی زۆری پاشەکەوت کراو لەعەمارەکانی دا، نەدەیتوانی ئەونەوتەی کە هەیەتی بیفرۆشێت و نەتوانای هەبوو هەنارەی دەرەوەی بکات.

پاشان، کێشەی نەوتی ئێران گەیەنرایە دیوانی داوەری نێونەتەوەیی لاهەو لەوێدا، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، دادوەری بریتانی بەقازانجی ئێران بڕیاری دا. بەڵام دادوەری سۆڤیەت لەبارێکی گوماناویدا، تەنانەت لەئامادەبوونیش لەدادگا خۆی بوارد. دوومانگ دوای دەست بەکاربوونی موسەدیق وەك سەرۆکی وەزیران، بریتانیا کەشتی جەنگیی "موریشس"یان ناردەکەنارەکانی ئابادان و، هاوکات لەگەڵ ناردنی هێزەکانی بریتانیا بۆ نزیك سنوورەکانی ئێران لە ئێراقەوە. پەرەشووتوانەکانیشیان لەقوبرس دابەزاند. بەسەرنجدان بەوەها بارودۆخێك من باڵوێزی بریتانیام دڵنیاکردەوەکە:"دەبێت بزانن کەئەگەر هێرش بکەنە سەر ئێران، من بۆخۆم فەرماندەیی سوپای ئێران لەشەڕ دژی ئێوە لەئەستۆدەگرم."

لەمانگی جوولای ١٩٥٢دا لام روون بوو کەئیتر ناتوانم متمانە بەکەسێك بکەم کە وڵات بەرەو ئیفلاسی دەبات. چوونکە لەکاتی خۆماڵی کردنی نەوتەوە، ئێمە نەمانتوانی بوو تەنانەت دڵۆپێك نەوت بفرۆشێن، هیوا بەهیچ چەشنە ڕێکەوتنێك نەبوو،پلانی ئاوەدانکردنەوەی حەوت ساڵە راوەستابوو وهەمووان بەرەو هەڵدێر دەرۆشتین. لەوەها بارودۆخێکدا، موسەدیق سەرەڕای بێ ئاکامی لەهەموو بوارەکاندا، بەهۆی هاندانی لەلایەن دەور و بەری خۆیەوە دەیویست هەروا لەدەسەڵات دا بمێنێتەوە، داوای لەمن کرد تاپۆستی وەزیری جەنگیشی ڕادەست بکەم، بەڵام کاتێك لەگەڵ ئەم داوایەی ئەو دژایەتیم کرد، موسەدیق ڕۆژی ١٧ی جوولای دەستی لەکارەکەی کێشایەوەو ئەحمەد قەوام بەسەرۆکی وەزیران دەست نیشان کرا.

لەوکاتەدا من – ئیلاهیارصاڵح-م پێ باشتربوو بۆوەرگرتنی پۆستی سەرۆکی وەزیران، کەئەویش لەئەندامانی جەبهەی میللی بوو. چونکە بەڕای من، صاڵح لە ڕێبەری حیزبەکەی خۆی زۆر مەنتێقی تربوو. بەڵام دەنگی زۆرینەی نوێنەرانی

پەرلەمان منی ناچارکرد قەوام، کە ناشارەزایانە دژایەتی نیشتمانی کردنی نەوتی کرد، بۆپۆستی سەرۆکی وەزیران راسپێرم.
دەسبەجێ دوای راسپاردنی قەوام، خۆپیشاندانی خەڵکی لەدژی ئەو لەتاران دەستی پێکردو لەماوەی ئەم خۆپیشاندانەدا کەبۆماوەی سێ رۆژ لە ٢٠ تا ٢٣ی جوولای درێژەی کێشا، من فەرمانم بەهێزە چەکدارەکان کردکە تەقە لە خەڵك نەکەن، بەڵام لەبەرئەوەی وڵات لەبەر مەترسی شەڕی ناوخۆیی دا بوو، ناچاربووم دووبارە موسەدیق بەسەرۆکی وەزیران ڕاسپێرمو هەڵبەتە ئەم جارە مەرجەکانی ناوبراویشم قەبووڵ کرد.
بێگومان، موسەدیق لەوکاتەدا بەباشی دەیزانی کە وڵات بەرەولێکترازان چووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەئیتر درەنگ ببوو، نەیدەتوانی کارێك بکات. موسەدیق وەك قوربانی لەخۆڕازی بوونی نەزان خڵەتێنانەی خۆی و، ترس لەبێگانەو بێ لایەقەتیەکانی، ببوو بە زیندانیی هاوپەیمانانی راستو چەپی خۆی. ئەو کەپێشتر ناوبانگی قارەمانی بەرگری لەدەستووری هەبوو و خۆی بەنوێنەری دەوڵەتێکی پەیڕەوی یاسا دەناساند، بوو بەکەسێکە: مەجلیسی سەنای هەڵوەشاندەوە، چالاکییەکانی دیوانی بەرزی وڵاتی کۆتایی پێهێناو هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی شۆرای میللی لەکاتێکدا ڕاگرت کەتەنیا ٨٠ کەس لەکۆی ١٣٢ نوێنەری پەرلمان هەڵبژێرابوون. دواتریش هەرلەبەرئەوەی ئەم پەرلمانەی هەڵوەشاندەوە کەچەندکەس لەنوێنەران وێرابوویان رەخنە لەدەوڵەتی موسەدیق بگرن. ئەم بڕیارەش بەشێوەی راگەیاندنی بەڕێوەچوونی ڕێفراندۆم بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان.
لەم ڕێفراندۆمەدا لەبەرئەوەی دەنگدان بەشێوەی نهێنی بەرێوە نەچوو، لایەنگرانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، زۆرینەی دەنگەکانیان بەدەست هێنا. سەرئەنجام موسەدیق لەکاتێکدا هەموو رۆژنامەکانی دەمکوت کردبوو، بەپەنابردن بۆ حکوومەتی سەربازی – کەبەردەوام لەپۆستی نوێنەرایەتی پەرلەمان دا لەدژی بوو– درێژەی بەدەسەلاتی خۆی دا. کاتێ تێگەیشت کەخەزێنەی دەوڵەت

بەتەواوەتی خاڵییە، بەنهێنی فەرمانی چاپ و بڵاوکردنەوەی پارەی بێ پاڵپشتی دەرکرد بۆئەوەی پارەی مانگانەی کرێکارانی پیشەی نەوت بدات. ئەم کارە دەسبەجێ بوو بەهۆی هەڵاوسانی ئابووری زۆرو شوێنەواری خراپی لەسەر وڵات دانا. لەکاتێکدا کە پێشتر موسەدێق هەمیشە لەگەڵ چاپی پارە، تەنانەت بەپاڵپشتی جەواهێرو بەردێن گرانبەهای پاشایەتی و ئاڵتوونی پاشەکەوتی وڵات ، دژایەتی دەکرد.

موسەدێق نەیدەتوانی لەدەسەڵات و کاریگەری حزبی توودە بەرگری بکات و ئەندامەکانی. ئەم حیزبە بەرەبەرە توانی بوویان خۆیان بخزێننە هەمووشوێنێك، بەتایبەتی ناو ریزەکانی سوپاش – کەئێستا ئیتر لەژێردەستی موسەدێق دابوو– ئەو لەم رووەوە، پەیرەوی لەسیاسەتەکانی ژەنراڵ " فریزێر" ی بریتانی کردبوو. ئەوبە بەدەستەوەگرتنی پۆستی وەزارەتی جەنگ، دەیویست دەسەڵاتی مـن لەفەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکاندا بسڕێتەوە.

بەهۆی ئامانجەکانی موسەدێق و ئەوەی کە ئەو دەیویست نەوتی ئێران لەژێردەسەڵاتی بریتانییەکاندا دەربێنێت، لەرووی ئابوورییەوە تاڵی و سەختی زۆرمان چێشت. بەڵام ئاکامەکەی بوو بەوەی کەبریتانییەکان وەك پێشتر بازاری نەوتی ئێمەیان بەدەستەوەبوو، بەڵام ئەم بارودۆخە – بەپێچەوانەی ڕابردوو– هیچ قازانجێکی ئابووری بۆئێران بەدواوە نەبوو. نەوتی ئێمە لەکاتێکدا بێ ئەوەی بەکاربهێنرێت لەعەمارەکاندا مایەوە، کەچی بریتانیا بەئاسانی توانی نەوتی پێویستی خۆی بەسەندنی زیاتر لەئێراق و بەتایبەت کوێت – کەنرخەکەی نزمتربوو– دابین دەکات. پێم وایە نرخی تەواوبووی بەرهەمهێنانی نەوت لەکوێت دا بۆهەر بەرمیلێك ٩سەنت و لەئێرانیشدا ١٢سەنت بوو.

بەمجۆرە بریتانییەکان لەهەردووبەرەکەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو، وادەرکەوت کەدەتگوت ئامانجی راستەقینەی موسەدێق پێچەوانەی ئەوشتەی بوو کەرایدەگەیاند. پێویستە ئەوەش بوترێت کە "دۆستانی" بریتانی موسەدێق کاتێ

دیتیان کەئیتر ئەو سوودێکی بۆیان نییە، بەتەنیایان هێشتەوە. چونکە بۆیان دەرکەوتبوو کەبێ موسەدێقیش دەتوانن کارتێلێکی جیهانی نەوت بەرێوەببەن.

لەئاگۆستی ١٩٥٣دا پاش دڵنیابوونم لەپشتیوانی بێ ئەملاوئەولای ئەمریکاو بریتانیا – کەسەرئەنجام رێکەوتبوون لەسەرسیاسەتێکی هاوبەش- وپاش باسکردنی کێشەکە لەگەڵ دۆستم " کرمیت روزفێلت " (کاربەدەستی دەزگای هەواڵگریی سیا)، بڕیارم دا بۆخۆم دەست بەکاربیم.

رۆژی ١٣ی ئاگۆست سەرتیپ نێعمەت الله نەسیری (فەرماندەی گاردی پاشایی)م راسپارد هەتا فەرمانی لەسەرکارلادانی موسەدێق بدات بەناوبراو وهەروەها فەرمانی پێکهێنانی کابینەی نوێش بدات بەژەنراڵ زاهێدی – کەلەلایەنگرانی پێشووی موسەدێق بوو- بەلام زاهێدی کەلەدەست بەسەرکردن دەترسا، خێراخۆی شاردەوە.

موسەدێق نەتەنیا فەرمانی لەسەرکار لادانی قەبوول نەکرد- کەبێگومان ئەمە دژی دەستووربوو- بەڵکو دەستی دایە کوودەتایەکی سەربازی. رێبەری ئەم کوودەتایەش فەرماندەی ناوەندی سوپای موسەدێق بوو، واتا سەرلەشکر ریاحی. ئەم هەنگاوە گەرچی بێ ئاکام مایەوەو بەخوێن کوتایی هات، بەلام دواتر نەبووە رێگری "ریاحی" لەکۆکردنەوەی سەروەت وسامانی زۆر لەکاروباری بیناسازی دا، لەسەردەمی دەسەلاتی " ستەمکارانەی ! " من دا. سەرسووڕهێنەرتر ئەوەی کە هەرئەم "ریاحی"یە پۆستی وەزیری بەرگری لەکابینەی بازرگاندا بەدەست هێناو تاسپتەمبری ١٩٧٩ درێژەی بەخزمەتی دا.

بەئاگاداربوون لەپلانەکانی موسەدێق و زێدەخوازییەکانی، بڕیارمدا خێراو بەرلەوەی کەناوبراو هێزی خۆی نمایش بدات، ئێران بەجێ بێڵم. ئامانج لەم کارەش شتێك نەبوو جگەلە پێش گیری کردن لەبەرێ خستنی گۆماوی خوێن و دانی دەرفەت بەخەڵك بۆئەوەی کاری خۆیان یەك لابکەنەوە. ئەم کارەی من جۆرێ ریسك بوو، بەلام ریسکێکی هەڵسەنگێندراو.

سەرەتا بەفڕۆکەیەکی جووت بزوێنەی تایبەت بەخۆم کەبۆ خۆیشم فڕۆکەوانی بووم، سەفەری بەغدام کرد. باڵوێزی ئێران لە ئێراق تەنانەت هەوڵی ڕاگرتنی منی دا، بەڵام کارەکەی ئەو نەیتوانی ببێتە هۆی سەرنەدانم لەشارەکانی نەجەف و کەربەلا. دواتریش سەفەری ڕۆمام کردو لەوێدابوو کەلەچارەنووسی پڕ لەکەسەری سیاسەتوانێکی شەڕئەنگێز کەکردەوەکانی زیانی زۆری بۆمیللەت بەدواوە بوو، ئاگادارکرام.

## ڕابوونی ئێرانییەکان:

میللەتی ئێران تەنیا کاتێك لەلێواری هەڵدێر نزیك بووەوە، بەهۆش هات و لەو مەترسییەی کەهەڕەشەی لەژیانی دەکرد ئاگاداربوو. بەڵام پێش لەوە، سێ ڕۆژی تەواو تاران گیرۆدەی ئاڵۆزی و ئاژاوەبوو.

ئاژاوەکانی دوو ڕۆژی یەکەم لایەنگرانی موسەدێق و توودەییەکان نایانەوە. بەڵام لەبەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمەوە واتا ١٩ی ئاگۆستی ١٩٥٣، کۆمەڵێك لەکرێکاران و سەنعەتکاران و خوێندکاران و پاسەوانان و تەنانەت ژنان ومندااڵنیش، بەئازایەتییێکی بێ وێنەوە لەهەمبەر چەك وتەنانەت دەبابەکانی دیکتاتۆری ملهوڕدا ڕاوەستان و بارودۆخەکەیان گۆڕی.سەرئەنجام دوابەدوای هاویشتنی گوللە تۆپێك لەتانکێکەوەو لەبەرامبەرماڵی "سەرۆك وەزیرانی پێشوو"وە، کۆتاییان بەدەسەڵاتی سێ ساڵەی سیاسەتوانێکی شێت هێناو، حەزرەتی سەرۆك کۆمار "بەژێر پانتۆڵییەوە وپاش ڕۆشتنە سەر لە دیواری ماڵەوە خۆی گەیاندە باخچەی دراوسێ و لەژێر زەوینی ئەوێدا-کەهی بەڕێوەبەری گشتی پۆستە بوو- پەنای گرت. لەوکاتەدا موسەدێق ٢٧سێدارەی لەگۆڕەپانی سوپادا بەڕێ خستبوو و دەیویست کۆمەڵێك لەنەیاران و چەندکەس لەئەندامانی پێشووی حیزبەکەی خۆی بەبەرچاوی خەڵکەوە لەسێدارە بدات.

کاتێك لەدوای سێ ڕۆژ گەڕامەوە تاران، لەگەڵ پێشوازییێکی گەرم وگوڕی خەڵك بەرەو ڕووبووم. هەست وسۆزی خەڵکی سەرانسەری ئێران نەدەکرا لەبەرچاو

نەگیرێت. پێشتر من پاشایەك بووم كەدەسەڵاتم بەمیراتی پێگەیشتبوو، بەڵام لەوكاتە بەدوا بەراستی دەمتوانی ئیدەعابكەم كەخەڵكی منی لەسەرتەختی پاشایی داناوە.

پاشان، موسەدیق لەبەرامبەر دادوەرەكانی دادگا درێژەی بەگەمەتایبەتیەكانی خۆی دا. هەندێ جار هەوڵی بۆراكێشانی رەحموبەزەیی دەدا، هەندێ جار چیرۆكی دەخوێندەوە، جاروبار قسەی پێكەنیناوی دەكرد، بەهەرحاڵ لەهەوڵی ئەوە دابوو هەرجۆركەبووە خۆی بۆ راگەیاندنەكانی نێونەتەوەیی دەربخات. شایەت لەبەرئەوەی دایكی موسەدیق لەبنەماڵەی قاجاربوو، دوژمنایەتی بنەماڵەی پەهلەوی دەكرد. من نازانم. بەڵام لانیكەم لەم بابەتە ئاگادارم كەدادگا بەدڵنیاییەوە دەیویست سزای مەرگ بەسەر موسەدیق دا بسەپێنێت و تاوانی ئەویشی "خەیانەت" دیاری كردبوو. بەڵام من داوام لەدادگا كرد كەلەتاوانكارییەكانی موسەدیق بەرامبەر بەمن چاوپۆشی بكات.

هەربۆیە ئەوپاش سێ ساڵ زیندانی، بۆبەڕێ كردنی سەردەمی خانەنشینی ڕووی كردە موڵكەكەی خۆی لەئەحمەد ئاباد كە شوێنێكی بەرین بوو لەڕۆژئاوای تاراندا. دواتریش لەساڵی ١٩٦٧ هەرلەوێ كۆچی دوایی كرد.

دادگایی كردنێك كەپاش كوتایی هاتنی سەردەمی موسەدیق بەڕێوەچوو، توانی تا ئاستێكی زۆر ڕاستییە سەرسووڕهێنەرەكانی پەیوەندی دار بەساڵەكانی ١٩٥١تا ١٩٥٣ ئاشكرابكات. بۆنموونە دەركەوت كاتێك موسەدیق پۆستی وەزارەتی جەنگی لەساڵی ١٩٥١دا بەدەستەوەگرت، تەنیا ١١٠ كەس لەئەفسەران ئەندامی حزبی توودە بوون. بەڵام كاتێكە لەساڵی ١٩٥٣دا موسەدیق رووخا، ژمارەی ئەفسەرانی ئەندامی حیزبی توودە گەیشتبووە ٦٤٠ كەس.

پلانی كۆمۆنیستەكان ئەوەبوو كەلەموسەدیق بۆ وەلانانی من كەڵك وەرگرن. بەپێی بەڵگەنامەكانی حیزبی توودە كەدواتر دەسكەوت، كۆمۆنیستەكان ویستبوویان دووهەفتە پاش چوونە دەرەوەی من لەئێران، موسەدیقیش لەسەركارلاببەن. من

بەچاوی خۆم پوول گەلێکم دیت کە دروشمی "کۆماری خەڵکی ئێران"ی لەسەر نووسرابوو و دەیان ویست بڵاوی بکەنەوە.
سەرهەڵدانی خەڵك بەلایەنگری لەمن تەواوی ئەم پیلانانەی تێکدا. دوای ئەوەش توودییەکان لەبەر ئەوەی دەیانزانی کەخەڵك پشتیوانیان لێناکات، ناچاربوون بەنهێنی کاربکەن. هەروەها پێویستە ئەم خاڵە لەبیرنەکرێت کەچەند مانگ پێشتر بە هۆی مردنی ستالینەوە، سیاسەتی سۆڤیەتیش تووشی گۆڕانێکی بەرچاو هاتبوو.
گومانی تێدانییە کەسۆڤیەت لەحیزبی توودە پشتیوانی سیاسیوئابووری دەکرد. هەنێ کەس وتویانە کەبریتانیاو بەتایبەت ویلایەتەیەککرتووەکانی ئەمریکا لەرووی ئابوورییەوە یارمەتی رووخاندنی موسەدێق یان کردووە. لەم بارەوە بەڵگەنامەی ورد لەبەردەست دایە کەدەیسەلمێنێت : دەزگای هەواڵگریی"سیا" لەوکاتەدا زیاترلە ٦٠ هەزار دۆلارێکیان خەرج نەکردبوو. منیش بەراستی هەست ناکەم کەئەم بڕە پارەیە بۆسەرهەڵدانو وەڕێ خستنی خەڵکی ولاتێك لەماوەی چەند رۆژێکدا بەس بێت.
نزیکەی سێ مانگی خایاند تاخەڵکی ئێران توانییان سیمای راستەقینەی موسەدێق بناسنو تێبگەن کەئەو وەك نموونەی شاگردێکی سێحرباز، تەنانەت دەسەلاتی نەبوو ئەوخراپەکارانەی کەبۆخۆی هەوساریانی شل کردبوو بخاتەژێر رکێفی خۆیەوە.
لەکۆتاییەکانی ئاگۆستی ١٩٥٣دا ئیتر لە شارەکاندا لاتو لەوێر حکوومەتیان نەدەکردو خەڵکی خۆدان شەرەفیش دەیتوانی جارێکیتر لەئاشتیوئارامی دا درێژە بەژیانو کاری خۆی بدات. بەلام هەڵبەت ژیان لەولاتێکدا کەوێرانو قەرزار بوو. ئابووری ئێران لەماوەی دەسەلاتی موسەدێق دا سەدان ملیۆن دۆلار زیانی پێگەیشت، جگەلەوەش، ولات سێ ساڵ لەکاتی خۆیشی بەفیڕۆ دابوو. لەفەسڵی داهاتوودا بۆمان دەردەکەوێت کە کێشەی نەوتی ئێران سەرئەنجام چۆن کۆتایی پێهات.

# فەسڵی ٧

## لەسەردەمی نەوت تا سەردەمی ئەتۆم

لەسەردەمی دێرینندا،لەئازەربایجان بڵێسەی پیرۆزی ئاگردانەکانی زەردەشتیان هەرگیز دامرکانەوەی بۆ نەبوو، ئەمڕۆ وادیارە کەئەو بڵێسانە نەتەنیا هێمای رووناکیی مێژووی ئەفسانەی دێرینی ئێران بوو بەڵکو لەداهاتووی نیشتمانی ئێمەش دەدوا.

لەبیرناچێتەوە کەیەکەمین چاڵەنەوت بەهۆی داریوشی مەزنەوە لەناوچەی شووش لێدرا. پاش بیست وپێنج سەدە، هەرلەوناوچەدا، نەوت لەیەکەمین چاڵی سەردەمی نوێدا هەڵقوڵا. هەرواکە دەزانین، لەسەردەمی هاوچەرخ دا مێژووی نەوت لەژیانی هەندێ لەنەتەوەکاندا رووداوی ئاڵۆزی لەگەڵ خۆی هێناوە. ئەم مێژووە کەیلە لەزنجیرەیەکی نەبڕاو لەدنەدان و پیلانگێڕیوئاڵوگۆڕی گەورەو کتوپڕی سیاسی و ئابووریو کردەوەی تیرۆریستی و کوودەتاو شۆڕشی خوێناوی. بێ لێکۆڵینەوە لەو کێشانەی کەپەیوەندییان بەنەوتەوە هەیە، ئەو رووداووە کارەسات بارو وەیشومانەی کەلەئێران و بەشێ لەرۆژهەڵاتی نزیکدا تالانی و وێرانی دروست کردەوەو دەیکات، فام ناکرێن.

## چیرۆکێکی دژی مرۆیی:

چیرۆکی نەوت لەجیهاندا یەکێك لەدژەمرۆیی ترین بەسەرهاتەکانی مرۆڤە، کەلەودا سەرەتایی ترین بنەماکانی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی لە ژێرپێ نراوە. ئەگەر دەیبینن کەکۆمپانیا گەورەکانی نەوت، ئیتر تاڵان و سوکایەتی وڵاتی ئێمە ناکەن لەبەر ئەوەی نییە کەئەم تاڵان چیانە خۆوخدەی مروییان تێدا دروست بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەئێمە لەشەڕێکی قورس دا، کەلەسەرەتای ئەم سەدەیەوە دەستیپێکردوە، سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە.

هەرواکەدەزانین لەساڵی ١٩٠١دا مۆڵەتێك بەخشرابە "ویلیام ناکس دارسی" کە کۆمپانیای نەوتی ناچاردەکرد ١٦٪ قازانجی خۆی بدات بەدەوڵەتی ئێران. هەروەها لەسەر ئەم خاڵە جەخت کرابووە وە کەدەوڵەت نەدەبوو دەست لەکاروباری کۆمپانیا وەربدات و ئەو ئێرانیانەش کەمافی کارکردنیان لەوێداهەبوو تەنیا کرێکاری ئاسایی بوون.

بەبەرەکەتی داهاتێکی سەرسووڕهێنەر، کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی ئێران وبریتانیا لەماوەیەکی کورتدا بووبە یەکێك لەگەورەترین کۆمپانیاکانی نەوتی جیهان.

لەساڵی١٩٣٣دا دەوڵەتی ئێران توانی ڕێکەوتنی خۆی لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی ئێران و بریتانیادا هەڵبووەشێنێتەوە. ڕێکەوتن نامەیەکی نوێ واژۆکرا کەداهاتی ئێرانی تۆزێ بردەسەرەوە. بەمجۆرە ئەگەرچی پشکی ئێمە لەهەر بەرمیلێك نەوتی هەناردە کراو لە١٧٪ بۆ ٢٣٪ بەرزبووە وە، بەڵام ناوچەی ڕێکەوتننامە نوێکە دابەزی بۆ سەدهەزارمایلی چوارگۆشە. هەروەها کۆمپانیا ئیتر مافی ئەوەی نەبوو لەشوێنێکدا کەفەرمانبەرانی ئێرانی ئامادە ی خزمەتکردن بوون فەرمانبەری بیانی دابمەزرێنێت.

**سووکایەتی سەرباری نادادپەروەری:**

**لەم ماوەدا داهاتی کۆمپانیا لەنەوت بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر زیادی کرد.لە سەرەتای دەیەی بیستدا تەواوی ئەو پارەیەی کەلەسەرەتادا بۆی تەرخانکرابوو و بڕەکەی سەدملیۆن دۆلار بوو گەڕایەوە.**

**دواتر، بەپێی خەملاندنێکی لۆژیکی، داهاتی کومپانیا گەیشتە بیستوپێنج ئەوەندەی ئەم بڕەپارەیە. ئێران لەوسامانە زۆرو زەبەندەی کەلەناخی خاکەکەی هەڵیان دەکێشا بیٚ بەش بوو وهەمووی دەڕژایە گیرفانی پشکدارانی کۆمپانیا کەگەورەترینیان خەزێنەداری بریتانیاو وەزارەتی دەریاداری بریتانیا بوو وهێزی دەریایی پاشایەتی بریتانیا بەنەوتی ئێران دەجوولاّ. بەمجۆرە تاسالّی ١٩٥٠، ئێران لەبری پشکداربوونی خۆی چلوپێنج ملیۆن دۆلاری وەرگرتبوو لەکاتێکدا کەهەرلەو ماوەیەدا کۆمپانیای نەوتی ئێرانوبریتانیا ١١٢ملیۆن دۆلار باجی داهاتی خۆیان بەدەوڵەتی بریتانیادابوو. ئەمە بۆخۆی دەربڕی ئەوبڕە سوودەیە کەبەنسیوی پشکداران ببوو.**

**لەگەڵ ئەوەشدا،هەڵویستی کۆمپانیا بەرامبەر بەئێران بەشێوەیەکی زۆرسەرنجراکێش**

**تێکەڵ بوو لەگەڵ جیاوازی دانان، بۆنموونە بەولاّتانی وەك ئێراقو کوێت لەبری ماف بەشداریێتی پارەیەکی زیاتری دەدا. هەروەها ئەوگازەش کەلە دەرهێنانی نەوت بەرهەم دەهات بەگشتی بەفیڕۆدەچوو وهەرلەوێدا دەسووتێنرا. کۆمپانیا: ڕێزی بۆنێوەرۆکی ڕێکەوتننامەی ١٩٣٣دا نەدەنا، بایەخی بەراهێنانی تەکنیك کارانی ئێران نەدەداو سەرئەنجام لە کەم کردنەوەی فەرمانبەرانی بیانی خۆی سەرپێچی دەکرد. هەقدەستی کەمی بەئێرانییەکان دەداو بەپێچەوانەی ڕێکەوتننامەکە، هەنگاوی بۆ دروستکردنی خانووی شیاو بۆنیشتە جیٚ بوونیان هەڵنەدەگرت.**

لەکاتێکــدا کــەکۆمپانیاکانی ئــەمریکی رێکەوتننامــەی ٥٠/٥٠ یــان لەگــەڵ عەرەبستانی سعوودی دا واژۆ کردبوو بەڵام ئەوبڕەپارەیەی کەکۆمپانیای نەوتی بریتانیا وئێران لـەبری ماف بەشداریتی بەئێمـەی دەدا لـە٣٠٪ بـوو. سـەرئەنجام، بەشـێکی گـەورە لـە داهـاتی تـاڵان کردنـی ئێـران بۆدۆزینـەوە ودەرهێنـانی نـەوت لـەوڵاتانی دیکـەدا تـەرخان دەکـراو لێـرەدا بـوو کەسـووکایەتی بووبەسـەرباری نادادپەروەری.

## سەرئەنجام ئێران توانی نەوتی خۆی بەرهەم بهێنێت:

لـە ٢٠ی مـای ١٩٥١دا یاسـای خۆمـاڵی کردنـی نـەوت لـە پەرلـەمانی ئێـران دا پەسـەندکرا. (٢٠ی مـارس دروسـتە- و.) بەئاسـانی دەکـرێ تێبگـەیت کـەمن لەلایەنگرانی زۆر قورس وقـایمی ئـەم خۆمـاڵی کردنـەبووم. بـەڵام هـەروا کەپێـشتر ئامـاژەم پێـدا ئـەم کـارەدەبوو بـە وتوویـژ ودانوسـتانی پێـشتریان پاشـتر بەدواداچوونی بۆ بکرێت.

بەڵام ئەم یاسایە لەپڕ کەوتە بواری جێبەجێ کردنەوەو وسەرەڕای هەوڵەکانی من، تاقمێك کەبۆگەیشتن بـەئامانجی تایبـەتی خۆیـان لـەکێبڕکێ دابـوون سـتراتیجێکی رەق و نـەگۆڕیان گرتـەپێش. بریتانیـای مـەزن ناڕەزایـەتی دەربـڕی. لـەدیوانی دادوەری نێونەتـەوەیی لاهـە سـکاڵای کـرد. ٤٨٠٠ تـەکنیککاری خـۆی لـەئابادان بانگهێشت کردەوە.

فـەرمانی قەدەغـەکردنی نـەوتی ئێرانـی دەرکـرد و هەمووبەنـدەرەکانی بـەرووی کەشـتییە نـەوت هـەڵگرەکانی ئێمـەدا داخـست. کۆمپانیـای میللـی نـەوتی ئێـران کـەخێرا دوای نیـشتمانی کردنـی نـەوت دامـەزرا، نـەیتوانی تاقەبـەرمیلێك نـەوت تەنانـەت بـەنیوە قیمـەتیش بفرۆشـێت. هـیچ کەشـتییێك نەیـدەوێرا نـەوتی ئێمـە باربکات و بیگوازێتـەوە. لەڕاسـتیدا تـەنیا کەشـتییەك ئـەوکارەی کرد کەدەسبەجێ رایـان گـرت و بردیـان بۆبەنـدەری عـەدەن. بۆمـاوەی سـێ سـاڵ نـەوت

لەبەرمیلەکان وعەمارەکاندا مایەوەو لەم ماوەدا لەجیاتی ئەوەی کەسەرچاوەی داهات بێت، بووبەمایەی خەرج کردن چونکە ناچاربووین مووچەو هەقدەستی کرێکاران بدەین و کارگەو دامەزراوە وکەل وپەلەکانی بپارێزین.

تەنیا لەساڵی ١٩٥٤داو پاش زنجیرەیەك دان وستانی دووردرێژ بوو کەتوانیمان بە رێکەوتنێکی سەرەتایی لەگەڵ کۆنسێرسیۆمێك بگەین کەپێکهاتبوو لەهەشت گەورە کۆمپانیای نەوتی جیهان : ئەم کۆنسێرسیۆمە بووبەبریکاری کۆمپانیای میللی ئێمە، کەخاوەنی نەوت و فرۆشیاریش بوو. ئەم رێکەوتنە بۆماوەی بیست وپێنج ساڵ بایەخی هەبوو (ئەگەری ئەوەش هەبوو لەسێ خولی پێنج ساڵەدا نوێ بکرێتەوە) وئێران پشکی لە٥٠٪ی بەردەکەوت.

سێ ساڵ دواتر توانیمان کۆمپانیای میللی نەوت لەهەموچالاکییەنەوتییەکانی سەرانسەری ولآتدا کەبەهۆی کۆمپانیای نەوتی تازەدامەزراوەو ە بەرێوەدەچوو لە٥٠٪ بەشداربکەین.

ئەم کۆمپانیانە بریتی بوون لەکۆمپانیای نەوتی ئیتالیا وئێران کەلە گەل ئەجیپ (A.G.I.P) ی ئەنریکۆ ماتەئی بەشداربوو، وەدواتریش کۆمپانیای ئایپەك (I.P.A.C)کە بەهاوبەشی لەگەڵ کۆمپانیای پان ئەمەریکن ئۆیل دامەزرا. ئەم رێکەوتننامانەی کەلەگەڵ ولآتانی رۆژئاوایی بەسترا بریتی بوولەمۆڵەتی دۆزینەوەی نەوت وهەردوو رێکەوتنەکەش تایبەت بوو بەدۆزینەوەی نەوت لە ژێر ئاوەکانی کەنداوی فارس دا. دوابەدوای ئەوانەش رێکەوتننامەی جۆراوجۆری دیکە بەسترا کەبەرەبەرە نێوەرۆکەکانیان رووی لەقازانجی ئێمە بوو.

لەسایەی خێری ئەم رێکەوتن نامانەدا، تاساڵی ١٩٥٨، ئێران سەرئەنجام توانی ٧٠٪ قازانجی نەوتی خۆی بەنسیوبیێت و کۆمپانیابیانییەکانیش بە ٢٥٪– کەبەهۆی باج دانیان بەدەوڵەتی ئێران ئەمەیان بۆدەمایەوە– رازی بوون. هەڵبەت ئەمەش شتێکی بەتەواوی سروشتی بوو. کۆمپانیای شێل تەنانەت بری ٨٥ ملیۆن دۆلاری دا بۆئەوەی مۆڵەتی پەیداکردنی نەوت بەدەست بێنێت کەهەمووی دۆڕاندو هیچ ئەنجامێکی بەدەست نەهێنا.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، بڕیـاردرا کـەئێران ئـیتر مـاف و مۆڵـەت بەکەسـێك نـەدات و کۆمپانیابیانییەکانیش تـەنیا وەك دەڵاڵ یان شـەریك بۆپەیداکردنی نـەوت قـەبووڵ بکات. بەمجۆرە دەوڵـەتی ئێـران بۆکـەڵك وەرگـرتن لەسەرچـاوەی نـوێ سـەرمایەی وەگەڕدەخـست. وتوویـژی زۆر لـەماوەی سـاڵەکانی ١٩٥٨ تـاجوولای ١٩٧٣دا بەڕێوەچـوو، تاسـەرئەنجام لـەم مـاوەدا، پـاش باسێکی دوورو درێـژ کەبـەزۆریش بـەهۆی لێـك تێنەگەیـشتنەوە تووشـی تونـدیو ئـاڵۆزی دەبـوو، ڕێکەوتننامـەکانی سـاڵی ١٩٥٤ی ئێمـە لەگـەڵ کۆنـسێرسیۆمی سـەرەکی نـەوت بەتـەواوەتی پێداچوونەوەی تیاکرا.

سـەرەنجام خاوەنداریـەتی ئێـران بەسـەر سەرچـاوەکانی خۆیـداو مـاف باڵادەسـت بوونی بەسەر بەرهەمهێنانی نەوتدا دانی پێدانراو خۆمـاڵی کردنی نـەوت بـەمانای تـەواوی وشـە کـەوتـە بـواری جێبـەجێ کردنـەوە. لەوەبەدوا کۆنسێرسیۆم بۆمـاوەی بیـست سـاڵ بووبـەکڕیاری نـەوتی خـاوی ئێـران (کەئێمـە لەفرۆشـتنی خۆشـحاڵ بـووین). کۆمپانیـای میللـی نـەوتی ئێـران دەسـتی بەسـەر هەمووشـتێکدا لەوانـە پاڵاوگـەی ئابـادان داگـرت و لەداهاتووشـدا دەبـوو پـلان بـۆ سـوودوەرگرتن لەپاشەکەوتی نەوت لەبەرژەوەندی وقازانجی نەتەوەیی دا دابنێت.

## هەمووکەرەستەکان بەئاشکرادژی ئێمە وەگەڕکەوتن

### مردنی ئەنریکۆماتەئی:

پاش ئەوەی کەلەساڵی ١٩٥٧دا نەچوونە ژێرباری هەندێ لـەکۆمپانیا گـەورەکانی نێـو نەتـەوەیی بـۆ سـوودوەرگرتن لەسەرچـاوەی سروشـتی مـان، ڕووداوی سەیروسەمەرە ڕوویاندا. ئەم قۆناغە - بەڕاستی شۆرشگێڕانە- لەمێژووی نەوتدا، هاوکـات بـوو لـە گـەڵ ڕووداوانـی ڕووداوگەلێکـدا کەمایـەی سـۆزوبەزەیی بـوون. لەبەرئـەوەی بەرژەوەنـدی مـاددی لـەم نێـوەدا زۆر زۆر بـوو، کۆمپانیـا گـەورەکان بۆلـەژێرپێ نـانی مـاف بێ ئەملاوئـەولای وڵاتـانی بەرهـەمهێنی نـەوت، لـەفێڵبازیو

تەنانەت پەنابردن بۆتوندوتیژیش بچووکترین دوودڵییان لادروست نەدەبوو. هەمووکەرەستەیەك بۆ گەیشتن بەئامانج گونجاوبوو- لەبۆختان کردنەوە بیگرە تا کوشتنی مرۆڤ.

لەناو ئەو هەمووە ڕووداوانەدا دووانیان شیاوی باسکردنە کەیەکەمیان کوشتنی درندانەی ئەنریکۆماتەئی سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری و بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای ئیتالیایی ئەجیپ بوو. کاتێك ئەندازیار ماتەئی- م ناسی، پیاوێك پەنجا ساڵەی زۆرچالاك بوو کەشارەزاییێکی باشی لەدونیای نەوتدا هەبوو بەتەواویش لەومەترسیانەی کەلە بەرەو ڕووبونەوەی لەگەڵ ئەندامانی یەکیەتی کۆمپانیاکانی نەوتی جیهان دا ڕووبەرووی دەبووە وە ئاگاداربوو. بەلآم هەمیشە دەیگوت:" ئەرفەتم نییە بترسم".

بۆئەوەی کاتی بەفیڕۆ نەڕوات بەفڕۆکە یان هێلیکۆپتێر سەفەری دەکرد.کۆی کاتژمێرەکانی فڕینی دەگەیشتە ٥٧٠٠ کاتژمێر. فڕۆکەی جێتی جووت بزوێنەری Morane-saunier٧٦٠ ی ناوبراو هەمیشە سەرگورد ئیرنێریۆبێرتوتسی کە فڕۆکە وانێکی نایاب و زۆر وریا بوو دەیفڕاند. ڕۆژی ٢٧ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٢٦ کاتژمێر پێنج و بیست وپێنج خولەکی دوانیوەڕۆ، ئەم فڕۆکەیە لەفڕۆکەخانەی کاتانیا لەدوورگەی سیسیل ەوە هەڵدەستێ و بڕیاربوو کاتژمێر شەش و پەنجا وحەوت خولەك لەمیلان دابنیشێتەوە. ویلیام مەك هیل هەواڵنێری گۆڤاری ئەمریکی تایم لەئیتالیا لەگەڵ ماتەئی دابوو. کەش و هەوا لەمیلان بارانی وتەم ومژاوی بوو. کاتژمێر شەش و پەنجا وپێنج خولەك وێستگەی چاودێری فڕۆکەخانە دوایین پەیامی بێرتوتسی کەبۆنیشتنەوە ئامادە دەبوو وەردەگرێت و ئیتر هیچ پەیامێك نابیسرێت.

لەکاتژمێر دەی شەودا دەرکەوت کەفڕۆکەکە لەنزیکی پاویا کەوتووەتە خوارەوە و سووتاوە،کەس لەم ڕووداوەدا بەسەلامەتی دەرنەچوو. لەسەرەتای مانگی ئۆکتۆبردا لێکۆڵینەوە لەفڕۆکەکە نیشانیدا کەلە یەکێك لەبزوێنەرەکانیدا ماددەی

تەقینەوەیان دانابوو. بەلام وترا کە ڕووداوەکە بەهۆی "کەمی بینین"ەوە ڕووی داوە. ڕووداو؟

**دەربارەی ڕووداوی دووەمیش دەبێت بوترێت:**

هەرکەئێران بووبەخاوەن بەرژەوەندی خۆی، هەندێ لەڕاگەیاندنەکان دەستیان کرد بە هێرشێکی ڕێکخراو بۆ بەدناوکردنی منودەسەلاتەکەم. لەم کاتەوە بووکەبووم بەکەسێکی دیکتاتۆرو سەرکوتگەرو ستەمکار. ڕاگەیاندنێکی بەربلاو و ڕووخێنەر دروست بوو و فیتنەچیانی کارامەش لەژێر ناوی ڕێکخراوێکی "خوێندکاریی"دا کەئەندامانی تەنیابەناو خوێندکاربوون، دەست بەکاربوون.

ئەم خەباتە کەلە ١٩٥٨دا دەستی پێکرد، هەرگیز سست نەبوو لەسالی ١٩٦١دا گەیشتە ترۆپکی خۆی.شۆڕشی کۆمەلایەتی ئێمە ئەم خەباتەی ڕاگرت بەلام لە ١٩٧٥دا بەگۆڕو تینێکی زیاترەوە تاکاتی هاتنەدەرەوەم لەئێران بەردەوام بوو.

**پێچەوانەی هەلوێستی پیاوانی نەوت:**

**پاش ئێمە دونیا چ ئاوبێت چ تراویلکە**

لەکۆتایی مانگی دێسامبری ١٩٧٣ لەسەر بانگهێشتی من وەزیرانی نەوتی ولاتانی هەناردەکاری نەوت لەتاران کۆبوونەوە. کاتێك ئەم کۆبوونەوەیە لەڕۆژی یەك شەممە ٢٣ی دێسامبردا بڕیاریدا نرخی هەربەرمیلێك نەوت لە٥/٠٣ دۆلارەوە بۆ١١/٦٥ دۆلاربەرزبکاتەوە، ڕاگەیاندنەکانی دونیا من یان تاوانبارکرد کەدەمهەوێت ئابووری ڕۆژئاواو سەرئەنجام هەموو دونیا تێکبدەم.

لەکۆنفرانسێکی ڕۆژنامەیی دا کەلەکۆشکی سەعدئاباد بەڕێوەچوو، ڕوونم کردەوە کە ئەم نرخە دادپەروەرانەیەو بەهیچ جۆرهەڕەشە لەئابووری جیهان ناکات. هەموو کەس دەیزانی کەنەوت بەرمیلێك بە ١٧دۆلار دەفرۆشراو بەنرخی بێ وینەی ٢٢/٦٠ دۆلاریش فرۆشرابوو. لەو کۆنفرانسەدا گوتم کەبارودۆخی ئابووری لە درێژخایەن دا ڕێكوپێکتریش دەبێت. چونکە لەونرخەیدا کەبۆنەوتی خاوم

دەستنیشان کرد نە تەنیا پێداویستیەکانی گەشەی ئابووری بەڵکو کۆی تێچووی وزەجێگرەوەکانیشم لەبەر چاو گرتبوو.

زۆر ناسروشـتی و،ناڵێم ناماقوڵ،بووکەنـەوت لـەئاوی کـانی ئیڤیـان (Evian) هەرزانتربێت. ئەویش لەحالێکدا کەلەم مادده دەگمەنە تائەوکاتە زیاتر لە ٧٠٠٠٠ بەرهەمی جۆراوجۆریان دەردەهێنا . لەناویاندا چەندین هـەزار مادده پەیدا دەبوو کەنرخی نەوت لەقیمەتی تەواوبووی ئەواندا رێژەیەکی ئێگجار کەم دەهاتەبەرچاو. بـەباوڕی مـن، پێویـستە نـەوت ببێـت بـەماددەی سـەرەکی بۆپیـشەسازی ئـاڵۆزی کیمیای نەوت کەهەموو پۆژێك، جۆراجۆری زیاتر بەخۆوە دەبینێت.

بەکارهێنانی نـەوت بـۆدابین کردنـی گـەرماو رووناکیو جووڵـەی شـەمەندەفەرەکان ئاقڵانە نەبوو. ئەم کارە نیشانەی لەبیرکردنی داهاتووبوو ولەبەفیڕۆچوونی تـەواوو سـووتانی گـازی چاڵەنەوتەکانی ئێمەدەچوو. نـەدەبوو باوڕمـان وابێـت کـە " پـاش ئێمـە دونیـاچ ئاوبێـت وچ تراویلکـە". مـن هەمیشە ئامـاژەم بەمەترسـییەکانی ئـەم جۆرە بۆچوونە دەکرد.

رێگەچارەیەکی بنیاتنەر کە دەیتوانی رێگە لەداتەپینی ئابووری جیهان بگرێت. ئەگـەروابێت کەنـەوت بۆبـەکارهێنانی پیـشەسازی کیمیـای نـەوت پاشـەکەوت بکرێت، روونەکەدەبێت بەدوای سەرچاوەی وزەی جێگرەوەدا بگەڕین. تەنیاهەشت سەرچاوەی هیوابەخش بەبیردێنمەوە: قیری سروشتی، لمی پیسبووبەنەوت، گازی خەڵۆزی بەردین، گازی میسان، وزەی جیوتێرماڵ (گـەرمای نـاوەوەی زەوی)، وزەی خۆر، وزەی هەڵکشان وداکشان، وزەی با. بەڵام تاکاتێکە نرخی نەوت لەئاوی کـانی ئیڤیان هەرزانترە،هیچ دەوڵەتێك ناچێتەژێرباری تێچووی زۆری کـەڵك وەرگرتن لـەم سەرچاوانەی وزە.

شەش ساڵ پێش رامگەیانـد کـەنرخ دانانێکی زۆر ورد بۆنـەوت بـەقازانجی وڵاتـانی خاوەن پیشەسازی تەواودەبێت.

بەبەرزکردنـەوەی بـەردەوامی نرخـی نـەوت تائـەوجێگای کـە سـەرچـاوەگرانەکانی دیکەی وزە بتوانن لەگەڵی بەربەرەکانێ بکەن، دەگەیشتینە قۆناغێك کەنەوت تـەنیا

لەپیشەسازی زۆرپێشکەوتوودا بەکاردەهێنرا. لەرووی ئابوورییەوەمانای ئەم کارەئەوەبوو کەوزەی پاشەکەوتی جیهان زیادی دەکردوبەمجۆرە لەبەلای کەمبوونی وزە دووری دەکراو زەمینەی پێشڤەچوون بەرەو سەردەمی وزەی لەبڕان نەهاتوو فەراهەم دەبوو –چ وزەی ئەتۆمی بێت چ وزەی خۆر یان ئاو– لەلایەکی دیکە، سیاسەتی کەڵك وەرگرتن لە نەوتی هەرزان سیاستێکە لەسەربنەمای بەفیڕۆدانو تەمەڵی کەراستەوخۆ دەبێتەهۆی لەناوچوونی نابەوەختی سەرچاوەکانو بەمانای داڕووخانی ئابووری جیهانە.

سیاسەتی دانانی نرخێکی دروست بۆ نەوت نەتەنیا پێویستی بەوە هەیە کە نرخەکان پێداچوونەوەی ڕێکوپێکی تێدابکرێت، بەڵکوهاوکاری وڵاتانی بەکارهێنەرو بەتایبەت ڕێکخراوی گەشەپێدانو هاوکاری ئابووریشی( OEC D) پێویستە بۆ ئەوەی خۆلە " قەمچ وپێچی هەڵاوسانی نرخەکانی نێونەتەوەیی" لابدەیت. لەڕێگای وتووێژەوە دەکرێ بەشێوەی نەوبەتی نرخێکی جێگیر "بۆ وزە دەسنیشان بکرێت کەبەپێی ئەونرخە پیشەسازی داهاتووی جیهان بنیات بنرێت." دواتر دەیبینین کەبۆخۆلادان لەقەیرانی گەورەی ئابووری کەهەڕەشە لە وڵاتانی خاوەن پیشەسازیو دونیای سێیەم دەکات چ ڕێگە چارەگەلێکی گونجاوی دیکەم پێشنیازکرد.

کاتێ گرووپەکانی لۆبی نێونەتەوەیی لەڕێگای ڕاگەیاندنەکانەوە دەستیان لەئیشەکە وەردا هیچ کەس تووشی سەرسووڕمان نەهات. تەنیا ئاکامی ئەم پاڵەپەستۆیانە ئەوەبوو کە سەرنجی هەموانیان بۆلای بەشێك لەبەرنامەکەی من کەتایبەت بوو بەزیادکردنی نرخی نەوت ڕاکێشا. دەربارەی ئەوپێشنیازەی کەدام بەدەوڵەتانی بەکارهێنەری نەوت، بێ دەنگیان هەڵبژارد. پێشنیازەکەم بەمجۆرەبوو: باجێ کە لەسەرنەوت دادەنرێت نابێت لە ١٠٠٪ قیمەتی تەواوبووی نەوت تێپەربکات. چونکە لەڕاستیدا ڕێژەی ئەوباجەی کە دەوڵەتانی بەکارهێنەر دەیان گرت زیاتربوو لەو بڕەپارەیەی کەوڵاتانی بەرهەم هێنەری نەوت وەریان دەگرت.

**پاش شەش ساڵ.... هەق بەمن ئەدرێت:**

هەنووکە، لەمارسی ١٩٧٩دا، رۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی کەبێ پسانەوە هێرشی دەکردە سەرمن و سیاسەتەکانم، لە " پاشکۆی دیپلۆماتیک"ی خۆیدا، وتارێکی دوور ودرێژ بەقەڵەمی "نیکۆلاسێرکیس" لەژێرناوی "قەیرانی وزە وقیمەتی تەواوبووی نەوت" دا بڵاوکردەوە.

ئەم وتارە پێنج ساڵ وسێ مانگ دوای کۆنفرانسی تاران بڵاوکرایەوە و لەگەڵ ئەوەی کەهەموو هۆکارو بەڵگەکانی منی خستبووە ڕوو سەبارەت بەدەسنیشان کردنی نرخێك بۆنەوت لەڕووی راستیەوە، بەوئاکامە گەیشتبوو کەئەم پرسە پێویستییێکە کە هەموو گەلان لەقەبووڵ کردنیدا تەنەخی و سستییان کردوە:" هەمووان کوێك و هاوڕان کە....درەنگ یا زوو نرخی نەوت بەرزدەبێتە وباشتروایە کەئەم بەرزبوونەوەیە قۆناغ بەقۆناغ بێت بۆئەوەی ئابووری جیهان لەزەبرێکی کتوپر وتوند بپارێزرێت."

وتارەکە ئامارژەی بەریسوایی سووتان و بەفیڕۆدانی ساڵانە ١٢٠ ملیارمەتری سێجای گاز لەجیهاندا کردبوو کەئێستاش بەردەوامە. دیسان بەبیری هێنابووەوە باجی سەرفرۆشتنی نەوت لەهەرکام لەولاتانی بەکارهێن دا زیاترە لەنرخی تەواوبووی نەوت. سەرئەنجام هەربەو ئاکامەگەیشتبوو کەبەدەستهێنانی رێکەوتنێکی نێونەتەوەیی پێویستە." گۆرانکارییێك کەخەریکە کاریگەریی لەسەرسیستەمی وزەی جیهان دادەنێت پێویستی بە دەست هەڵگرتن لەخۆڕانانی نەتەوەیی و کاردانەوەی لەکارکەوتووی سەردەمی داگیرکاری هەیە، پێویستی بەهاوکاری نێونەتەویی ئەگەربکرێت گشتگیرهەیە..." "...کەرەستەو هۆکاری پێویست بۆبەکردەوە دەرهێنانی هاوکارییێکی لەم جۆرە زۆرە: وتووێژ لەگەڵ ئۆپێك و یەکیەتی پیشەسازی ئەلێکتریکی (AEI ) وەیان رێکخراوی گەشەپێدان و هاوکاری ئابووری (OECD). رێکخستنی دامەزراوەیەکی جیهانی بۆ وزە،

پێکهاتووە لەوڵاتانی بەرهەم هێن‌و بەکارهێنی نەوت، کەئامانجەکەی دابین کردنی باری ماڵی‌و ئابووری ئەوپرۆژانەی بێت کە وزە بەرهەم دەهێنن."

نووسەر لەسەرانسەر وتارەکەیدا هیچ ئاماژەیەکی بەوشتانەی کەلەسەعدئاباددا وترابوو نەکردبوو. ناوبراو لەبەڵگەهێنانەوەکانی خۆیدا بەپلەی یەکەم پشتی بەبڵاوکراوەیەك لەکۆمپانیای نەوتی کانتی ئینتاڵ(Continental) بەست بوو، کەلەودا نووسرابوو: نرخی نەوت (لە ١٩٧٥) دا دەبێت بۆبەرمیلێك ٢٤یان٢٧دۆلار بەرزببێتەوە تاپێنج سەرچاوەی دیکەی وزە بتوانن لەگەڵ نەوت دا هەڤرکی بکەن. سەرئەنجام پشتی بە راپۆرتێك بەست بوو کەرەندکۆرپۆرەیشین (Cor Rand Poration ) لەساڵی ١٩٧٨دا وەکاڵەت لەلایەن دەزگای هەواڵگری سیاوە دابووی. ئەم راپۆرتە قامکی لەسەربەرزبوونەوەی نرخی نەوت بۆبەرمیلێك " ٣٠دۆلار دادەنا وپێی وابووکە وەها نرخێك پاشەکەوتەکانی نەوتی ناسراو لەجیهاندا دووهێندە دەکات.

"سەرنجی ناوەکان‌و بەروارەکان بدەن. پێویستە ئەوەی لێ زیاد بکەم کە لە سەرەتای مانگی ئاگۆستی ١٩٧٨دا، بەرێزجەیمز شل زینگێر رایگەیاند کەنرخی نەوت لەوانەیە بگاتە بەرمیلێك ٤٠ تا ٥٠ دۆلار. بەڵام هەر ئەمانە پێشتر ئەم سیاسەتەیان بە " تێکدەری هاوسەنگی" و "باجگرتنی شەرم هێنەر" ناودەبردو هەرکەلەلایەن منەوە پێشنیارکرا، بەهەر رێگایەك کەبە خەیاڵ دابێت لەدژی جوڵانەوە. بەڵام ئێستا بەلابردنی کەسێك کە لایەنگری ئەم سیاسەتە بوو (ئەویش لەکاتێکدا کەهێشتا لۆژیك‌و ئەقڵی سالم دەیتوانی مەترسی گەورە چارەسەربکات)، ئەم سیاسەتە بووە بەتەنیا سیاسەتی گونجاوی جیهانی. هەڵەی من ئەوە بوو کەهەق لای من بوو ومن ڕاستم دەکرد.

یاسای نوێی نەوتی ئێران لەساڵی ١٩٧٤دا بەوشێوەیە نەبوو کە نێوانی هەندێ لەراگەیاندنەکان لەگەڵ من خۆش بکات. بەپێی ئەم یاسایە هەرکۆمپانیایەك کەدەیویست لەئێران دا کاربکات تەنیاکاتێك دەیتوانی دەست بەکاربێت کەنەوت لەکۆمپانیای میللی نەوتی ئێران بکرێت یان وەك بەڵێندەری کۆمپانیا بێتەپێشەوە.

ئەگەر دۆزینەوە وهەڵکەندنی بیرە نەوت بەسەرکەوتوویی بڕوایەتە پێش ئەوا هەرکە بەرهەم هێنانی نەوت دەستی پێدەکرد ڕێکەوتنی بەڵێندەر هەڵدەوەشایەوە. سەبارەت بە فرۆشتنیش، لەسەر ڕێکەوتننامەیەك ڕێکدەکەوتن کەبە پێی ئەو کۆمپانیای میللی نەوت بەشێك لەبەرهەمی خۆی بەنرخی بازار دەفرۆشت بەکۆمپانیا وئەوپەڕی تا ٥٪ی بۆدادەشکاند.

کۆمپانیای نەوتی ئێران دواتر چەند پالاوتگەیەکی لەئەفریقاو ئاسیا دروستکردو بەمەبەستی، دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت و گاز لەدەریای باکووردا لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی بریتانیا (BP) ڕێکەوت و، بەمەبەستی پەیداکردنی نەوت لەدەریاکانی ڕۆژئاوای گرین لەندا لەگەڵ کۆمپانیایەکی ئەمریکی بەشداری کرد. لە ١٩٧٧دا کۆمپانیای میللی نەوتی ئێران بەداهاتی ٢٢ ملیار دۆلاریەوە، لەسەرەوەی ریزبەندێکدا جێی گرت کەپێکهاتبوو لە٥٠٠ کۆمپانیای زەبەلاحی پارەسازی جیهان. ئەم ڕیزبەندە لەلایەن گۆڤاری فۆرچوون- ی ئەمریکییەوە ئامادەکرابوو. کۆمپانیای میللی نەوتی ئێران لەکۆمپانیاکانی ئێکسۆن و شێل بەهەشت ملیار دۆلار داهاتەوە، زۆر لەپێشتربوو.

بەمجۆرە من ئەو بەڵێنەی کەساڵانی پێشتر بەمیللەتەکەم دابووم بردمەسەرو کۆمپانیای میللی نەوتی ئێران بوو بەگەورەترین کۆمپانیای نەوتی جیهان. پێش لەوەی کەگاڵتەجاڕی و گەوجی و نەفرەت بەسەر ئێران دا حکوومەت بکات، ئەم وڵاتە چوارەمین بەرهەم هێنەری نەوت و دووەمین هەناردەکار بوولە ئاستی جیهاندا. جیا لەکۆمپانیای میللی نەوتی ئێران، کۆمپانیای میللی پیشەکانی کیمیای نەوتیش سەرقاڵی کارکردن بوو و یازدە کۆمپانیاو کارگەی لەخۆدەگرت. کۆمپانیای میللی گازی ئێران بەرەبەرە پلەی گرنگی بەدەست دەهێنا، چونکە سەرچاوەی گازی ئێران لەگەڵ سەرچاوەی گازی یەکیەتی سۆڤیەت دا هاوسەنگی دەکات –وە هێشتا هەموو سەرچاوەکانیشی نەدۆزراوەتەوە.

**مرۆڤ دەبێت لەگەڵ ئاژاوەدا خووبگرێت:**

ئەگەربمانەوێت لەچۆنیەتی ئەو ڕووداوانەی کەلەماوەی ساڵی ڕابردوودا لەئێراندا ڕوویـــان داوە ســـەردەربێنین پێویـــستە زۆر ڕاســـتی گـــرنگ لەبەرچـــاوبگرین. بەدڵنیاییەوە مێژوو ئەوەنیشان دەدات کەسەرۆکی وڵاتێك، کەگیرودەی داهاتووی میللەتەکەی بوو وپەنای بۆیەکیەتی ڕاستەقینەی لەگەڵ گەلانی دیکەدا دەبرد،چۆن بێ بەزییانە سزادرا.

لابردنی من زەمینە گـەلێکی فەراهـەم کردووە یـان دەیکـات، کەهەنـدێ کـەس لـە "سیاسەتی بەناو" نەوتی گران" بەقازانجی خۆی کەڵك وەربگرێت. ئەم سیاسەتەی نـەوتی گـران، هـەمان نرخانـدنی نەوتـە بـەپێ بـەهای ڕاسـتەقینەی. ئەمـە هەرئـەو سیاسـەتەیەکە هیواداربـووم بـۆ بەرژەوەنـدی گـشتی پـەیڕەوی بکـەم. کاتێکـە هێزەکانی ڕۆژئاوام ئاگادارکردەوە کەبۆپەیداکردنی وزەی جێگرەوە دەست بکەن بەلێکۆڵینەوە وتەواوکردنی کەرەستەکان، کاتێکە ئێمە نموونەیەك لەوەمان نیشان دا، بڕوایان بەقسەی ئێمە نەکردو تەنانەت ڕێگریشیان لێمان کرد.

چـەندجار وتمو بـۆ دووسـەرۆك کۆمـارو جێگرێکـی سـەرۆك کۆمـاری ویلایەتـە یەکگرتووەکانم (کەرەنگە هێشتا لەبیری بێت) دووپات کردەوە کە وڵاتەکەیان مافی نییـە وەك ڕێبـەری دونیـای ناکۆمۆنیـست، بۆبـەکارهێنانی وزەی خـۆی پـشت بەسەرچاوەی دەرەکی ببەستێت. وادیارەگوێم لێنەگیرا، بـەڵام بەهـەرحاڵ، ئـەمڕۆ لەهـەوڵی ئـەوەدان کەئـەم سیاسـەتە بـەکردەوە دەربێـنن. هەڵبـەت لـەم تەنگانەیـەدا گرفتاریەکانی خۆیان لەمەڕ ڕوونانیان لەسەرچاوەکانی دیکەی وزە گرێ دەدەن بە "قەیرانی ئێران"ەوە وبیانوویەکی باشیان بەدەست هێناوە بۆئەوەی نرخی نـەوت ببەنەسەرەوە.

ڕوونـــە کـــە کـــەمکردنی هـــەناردەی نـــەوتی ئێـــران لەدێـــسامبری ١٩٧٨ بـــەدوا "دەســـەڵاتەکانی خـــاوەن پیـــشەسازی تووشـــی ترسـێکی قـــووڵ کـــرد"، ترسـێك کەبەدڵنیاییـەوە ئـەو وڵاتانەشـی گرتـەوە کەلـەحاڵی گەشـەکردندان. لەڕاسـتیدا، دووربوونی من لەمەیدانی سیاسی و ئابووری جیهان هاوکات بوو لەگەڵ هێرشێکی

هەمەلایەنە. بۆ سەقامگیری ئابووری‌و دواتریش سەقامگیری سیاسی زلهێزەکانی جیهانی رۆژئاوا. لەم ڕووەوە، ئێستا دەڵێن ڕووداوەکانی ئێران کێشمەکێشی دەسەڵاتی تووشی گۆڕان کردووە، "سەردەم گۆڕاوە"، مرۆڤ دەبێت " لەگەڵ بارودۆخی نوێی دونیادا" هەڵبکات. من دەترسم لەوەی کەمرۆڤ ناچاربێت لەگەڵ ئاژاوەش دا خۆی بگونجێنێت.

ئەگەر خۆدی مرۆڤ نەتوانێت ڕێڕەوی ڕووداوەکان بگۆڕێت ئەی کەواتە چ کەسێك دەتوانێت؟

من بەش بەحاڵی خۆم، بۆ دوورکەوتنەوە لەم ئاژاوەیە زۆرجار هۆشداریم داو دووپاتم کردەوەکە :"داهاتووی ئێران ئیتر ناتوانێت پشت بەنەوت ببەستێت." ئاماژەم بەم خاڵەدا کەنەوەکانی هاوچەرخی ئێمە بەخێرایی خەریکن ئەوسەرچاوانەی کەلەماوەی سەردەمانی زەوی ناسی دا پێکهاتوون بەکاردەهێنن (خاوەکان لەسەردەمی درووست بوونی هەسارەی زەوییەوە، کانەکانی خەڵووزی بەردین لەماوەی سێ ملیار ساڵ‌و نەوت لەماوەی شەش سەدملیۆن ساڵ دا.) کەواتە، نەوت ٥٠٠ هەزار جار خێراتر لەدروست بوونی بەکاردەهێنرێت. بەپێی ئەوخەملآندنەی کەلەکۆنفرانسی جیهانی وزە لەئەستانبوولدا کرا، گشت سەرچاوە ناسراوەکانی نەوت ئەوپەڕی بەشی سی‌وحەوت ساڵ دەکات، بەمەرجێك ئاستی بەکارهێنانیشی بەرز نەبێتەوە.

## حکوومەت کردن پێویستی بە بەرنامەرێژی پێشتر هەیە:

ئێمە هێشتا بۆجێبەجێ کردنی پلانەکانمان لەبواری ئابووری‌و جڤاکی دا ناچاربووین پشت بەداهاتی نەوت ببەستین: نزیکەی بیست‌ودوو ملیاردۆلار لەساڵی ١٩٧٧دا. سی ساڵی تر کەدانیشتوانی ئێران دەگاتە ٦٥ملیۆن کەس وسەرچاوەکانی نەوتی ئێمەش بەرەوکۆتایی دەچێت، چی بەسەرئەم بەرنامانەدا دێت؟

حکوومەت کردن پێویستیی بەوە هەیە کەپێشتر بەرنامەرێژی بۆبکرێت. هەربۆیە راستیەکانمان بەتەواوەتی لەبەرچاوگرتبوو. گەڵاڵەمان بۆدامەزراندنی خێرای چوار ویزگەی کارەبای ناووکی داڕشتبوو:" ئێرانی یەك و دوو" کە ئەڵمانییەکان لەنزیکی بووشێهردا دروستیان دەکردو "ئێرانی سێ وچوار"یش کەبڕیاربوو فەرەنسیەکان لە کەناری کاروون و لەنزیکی ئەهوازدا دایبمەزرێنن. دوو ویزگەی یەکەم دەبوو لە ١٩٨٠و ١٩٨١دا کارەبا بەرهەم بهێنن و دوو ویزگەکەی تریش لە ١٩٨٣و ١٩٨٤دا. هەنووکە ئەم گەڵالانەیان وەلاوە ناوەو پارەیەك کەبۆ ئەم کارە تەرخان کرا بێگۆمان بۆهەمیشە بەفیڕۆ چووە. بڕیاربوو دواتر چواردە ویزگەی دیکەی کارەبای ناووکی دروست بکرێت، واتا دەبوو ٢٥٠٠٠ میگاوات کارەبای ئەتۆمی دابین ببێت.

لەئاپریلی ١٩٧٧ دا لەسەربانگهێشتی ئێران، ٥٠٠ پسپۆرو شارەزا لەشیرازدا کۆبوونەوە بۆئەوەی سەبارەت بەهاوکاری نێونەتەوەیی لەبواری تەکنۆلۆجیای ئەتۆمی دا –تەنیا بۆمەبەستی ئاشتی خوازانە– باس و وتووێژ بکەن. لێرەدا پێویستە ئەوشتەی کە لەو کاتەدا وتبووم بیگێڕمەوە.

وڵامی پەیامێکی سەرۆك کۆماری ئەمریکام بەمجۆرەدایەوە کەبۆ بۆکۆنگرەکەی ناردبوو : " گرنگییێك کە ئێوە بەوزەی ناووکی دەیبەخشن بەتەواوی لای من ڕوونەو لەئەگەری ئەو مەترسیی و بەڵاو وەیشوومەی کەڕەنگە لەئەنجامی هەڵوێستی نابەرپرسانەدا تووشی مرۆڤایەتی ببێت بەوردی ئاگادارم. لەم پێناوەدا هیوام ئەوەیە کەئێران هەموو هەوڵەکانی خۆی لەڕێگای کەڵك وەرگرتنی ئاشتی خوازانە لە وزەی ناووکی وەگەڕبخات. ئێمە لەسەرهاوکاریکردن لەگەڵ هەمووگەلانی جیهان بۆگەیشتن بەم ئامانجە کەلەبەرژەوەندی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دایە بەردەوام دەبین.

کەواتە، یەکێك لە"تاوانە" گرنگەکانم ئەوەبوو کەدەمویست تادرەنگ نەبووە ئێران لەسەردەمی نەوتەوە بگوازمەوە بۆسەردەمی ئەتۆم. ئایا دەبێت لەم نیەتەی خۆم "شەرمەزار"بم؟ کەڵك وەرگرتنی ئاشتی خوازانە لەوزەی ناووکی هیچ گرفتێکی

لەڕووی تیشك هاویشتن و پیس كردنەوە دروست نەدەكرد چونكە ئێمە بیابان گەلی بەربلاومان لەبەردەست دایە.
لەكۆتایی مانگی دیسامبری ١٩٧٨ەوە، لەسەرهەموو بەرنامەكانی من كەسانێك پێشتر بەشەوق و زەوقەوە پەسەندكرابوو نیشانەی " ناكرێ "یان دانا: مێترۆیەك كەدەبوو بەهۆی "كۆمپانیای خزمەتگوزاری گواستنەوە وگەیاندنی گشتی پاریس"ەوە لەتاراندا دروست بكرێت ناكرێ راگەیەنرا، بەكارەبایی كردنی تۆڕی ڕێگای ئاسنی ولات و دووئاراستەكردنی زۆربەی هێڵەكانی بەناكرێ راگەیەنرا، دروست كردنی ڕێگای خێرای باشوورو تۆڕی گەیاندنی گازی سروشتی كەدەبووە هۆی ئەوەی كەلەسەرچاوەكانی گازی خۆمان كەلك وەربگرین بەناكرێ راگەیەنرا، لەكاتێكدا كەسێ لەسەرچواری سەرچاوەكانی گازی رۆژهەلاتی ناوەراست هی ئێمەیە.یەكێك لەتاوانەكانی من ئەوەبوو كەپلانی دروستكردنی وێزگەكانی ئەتۆمیم لەبەر "بەرزەفڕی تایبەتیم" داڕشتووە.
ئایا روون نەبوو كەتەمەنی من ناگاتە زۆربەی ئەم بەرنامانە؟ كەواتە ئیتر قسەكردن لەبەرزە فڕی تایبەتی چ مانایەكی هەیە؟ كێشەكە تەنیا پێش بینی كردنی پێداویستیەكانی ئێران بوو. بەرزەفڕییەكانی "تایبەتی" من كەڕوونە لای هەموومرۆڤە ئیماندارەكان گرێدراوی یەكپارچەیی و دابین كردنی بەختەوەری بوو بۆمیللەتی ئێران تائەوجێگای كەبكرێ، هەروەها دابین كردنی داهاتوویەكی ئاشتیانەتر بۆئەوان.
ئێستا خەلك بەرەبەرە ئەم راستیانەیان بۆدەردەكەوێت و سەرەڕای زاڵبوونی مۆتەكەی سەدەكانی ناوەراست بەسەریانداو سەرەڕای هەبوونی ترس و تۆقاندن، بەلام باسی لێوەدەكەن. ئامانجەكانی من بەپێچەوانەی بۆچوونەكانی هەندێ كەس دروستكردنی ئارمان شار نەبوو وخەیالی شەیتانی و خراپیشم لەسەردا نەبوو. ئەمانە تەنانەت دەلێن كە من " ولاتم وێران كردوە و بەرەو دواوە گێڕاومەتەوە."
باشتروایە بزانین چۆن.

# فەسڵی ٨

# بنەماکانی شۆڕشی سپی

هەتا ١٩٥٣ دوازدە ساڵ بوو کەبۆمانەوی ئێران جەنگابووم‌و تائێرە لەباسکردنی ئەم هەولاّنە ئاگادارن.
مەبەستم بوو بیست‌وپێنج ساڵی دیکە بۆدابینکردنی مانەوەو پێشکەوتنی ولاّت تێبکۆشم‌و هەنووکە دەمهەوێت قۆناغە سەرەکییەکانی ئەم خەباتە شرۆڤەبکەم. لەتەواوی ئەم ماوەدا، بەردەوام تەنیا بیرم لەیەك ئامانج دەکردەوە، کەنەتەنیا هەرگیز ئەو ئامانجەم نەدەشاردەوە، بەڵکو بەپێچەوانە بەئاشکرا باسم لێوەدەکرد. ئامانجەکەش ئەوەبوو کەئێران بکەم بەمیللەتێکی نویخوازو سەرەتا خۆش بژێوی ئابووری میللەتەکەمان بەشێوەیەك دابین بکەم کەلەسەر هەسارەی زەوی بەمافی خۆیانی دەزانن،هاوکات ئاوات‌و ئامانجە ئەخلاقی ومەعنەوییەکانیشیان بەهێزو پارێزگاری لێبکەم.

## ئامانجە سەرەتاییەکان:

دەمزانی کەداخوازییەکانی من لەگەڵ بەرژەوەندی بەهێزی ئەوکەسانەی کەژیانیان گرێدراوی هەژاری‌و نەزانینی خەڵکە لەدژایەتی دایە. بەلاّم، سەرەڕای پاڵەپەستۆی دەرەکی‌و بێ باوڕی‌و تەرخان کردنی ناڕەوای سەرچاوەکانی ئابووری گشتی‌و بێ

توانایی هەندێ لەحکوومەتەکانمان، ماندوونەناسانە درێژەم بەئەنجامدانی ئەو ئەرکەی دا کەدەروەست بووم پێی. بەدرێژایی سی وحەوت ساڵ هیچ شتێك نەیتوانی من لەئەنجامدانی ئەرکەکەم ڕابگرێت، نەگوللەی دەمانچەو نەدەسرێژی ڕەشاش.

لەساڵی ١٩٤٣دا سەرەڕای بەردەوام بوونی جەنگی جیهانی و سەرەڕای ئەو گرفتارییەدژوارانەی کە شاوڵیان بۆم هێنابوو، پێم لەسەرئەوە داگرت کەبە سەرەنجدان بەهۆکارێن ڕاستەقینەو ڕیشەی کلۆڵی و بەدبەختیە قووڵەکانمان، دەبێت بەم پێنج ئامانجەبگەین:

١. نان بۆهەمووان.

٢. شوێنی نیشتەجێ بوون بۆهەمووان.

٣. پۆشاك بۆهەمووان.

٤. تەندروستی بۆ هەمووان.

٥. پەروەردەو فێرکردن بۆهەمووان.

لەبەبیرهێنانەوەی ئەم ئامانجانە بەو دەوڵەتانەی کەیەك لەدوای یەك هاتن و ڕۆشتن هەرگیز تەنەخیم نەکردو سەرئەنجام ناچاربووم بۆگەیشتن بەم ئامانجانە شۆڕشی سپی بەسەریاندا بسەپێنم.

پێویستە لەیادمان بێت کە تا گۆڕانکاریەکانی ساڵی ١٩٦٠، من جگەلە فەرماندەیی گشتی هێزەچەکدارەکان دەسەڵاتێکی یاسایی دیکەم نەبوو. هەرکەدەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانم بەدەست هێنا، واتا پاش ڕووخانی موسەدێق، دەمتوانی چاودێربم لەوەی کەدەوڵەتێن کۆششکارو نیشتمانپەروەر بێنە سەرکار. بەبەردەوام بوون لەسەرئەم پێنج ئامانجە، بەرەبەرە پلانی تۆکمەترو پڕنێوەڕۆك ترم داڕشت و هاوکات پێویسترین پێداویستییەکان و ڕاستەقینەترین کەرەستەکانم لە بەرچاوگرت. بەمجۆرە بوو کەنۆزدە بنەمای شۆڕشی سپی یەك لەدوای یەك هاتنە ئاراوە.

## سەرئەنجام داهاتو خەرجیەکان هاوسەنگ کرا:

دەزانین کەبۆچی یەکەمین پلانی حەوت ساڵەی ئێمە کەدەبوو لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٩تا ١٩٥٦دا جێبەجێ بکرێت لێك هەڵوەشا. ئێران بۆموسەدێقی وێرانکەر نرخێکی زۆری دا. دووەمین پلانی حەوت ساڵە کەلەساڵی ١٩٥٤دا دەستی پێکرد، پێکهاتبوو لەبەشێك لەپلانی حەوت ساڵەی یەکەمو تێچووەکەی بەنزیکەی ٧ملیار تمەن (تۆزێك کەمترلە یەك ملیار دۆلار) خەملێنرابوو.

لەبنەڕەتدا دەبوو لایەنی ئابووری پلانی حەوت ساڵەی دووەمیش لەداهاتی نەوت دابین ببێتو هەربۆیە دەبوو لەسەرچاوەکانی نەوتو گازمان بەباشترین شێوە کەڵك وەربگرینو لەنێوان داهاتو خەرجییەکاندا هاوسەنگی پێك بێت. بەئاگاداربوون لەم خاڵە، بۆهاتنەدی پلانەکە، مۆدێرنیزەکردنی ژێرخانی کشتوکاڵیم بەپلەی یەکەم دانابوو. هەربۆیە، دروستکردنی بەنداوەکانو ویزگەکانی هایدرۆئەلێکتریكو تۆڕی گواستنەوەی ئاو وکارگەکانی بەرهەمهێنانی پەینی کیمیایی لەپێشدادانران. درێژەی هێڵەکانی ئاسنی ئێمە تاساڵی ١٩٥٨ سێ هێندە زیادی کرد، هەرلەو ساڵەدا ئێمەپێنج هەزارکیلۆمەتر ڕێگای قیرتاوکراو وسی هەزارکیلۆمەتر ڕێگای پلەدوومان هەبوو. جیالەمانەش، ٢٤٠٠ کیلۆمەتر لەهێڵەکانی بۆری سەرانسەری ئێران ئامادەی کەڵك وەرگرتن بوو. دەکرێ بڵێین ئێران ببوو بەکارگەیەکی بیناسازی گەورە.

هەرلەساڵی ١٩٥٨دا، نەتەنیا کورت هێنانی بوودجەمان نەبوو، بەڵکو بۆیەکەمین جار لەمێژووی ئێرانی نوێدا، زیادەهێنانێکی پۆزەتیڤیش بەرچاودەکەوت. بەهای هەناردە کردنمان ٤ ملیار ریاڵ زیاتربوو لەهاوردەکردنمان.

## چاکسازی لەپێکهاتەدا:

لەپەرتووکی شۆرشی سپی دا بەمجۆرە نووسیومە:

"...ئێمە شێوازی خنکاندنی بیروڕاکانو زەوت کردنی ئازادییەکانی تاكو جڤاکی مان بۆپێشکەوتنی رواڵەتیی خۆمان هەڵنەبژاردووە. بەپێچەوانە، ئەوشتەی کەئێمە

وەك بنەماكانی كاری داهاتوو لەبەرچاومان گرتووە، چاكسازی كۆمەڵایەتی، بنیات نانی ئابوورییێكی هاوزاد لەگەڵ ئابووری دیمۆكراتیك، پێشڤەچوونی فەرهەنگی، هاوكاری نێونەتەوەیی و رێزدانانە بۆباوڕی مەعنەوی و ئازادییەكانی تاكەكەسی و جڤاكی.

لەجەنیوەری ١٩٦٣دا، لەهەمبەر یەكەمین كۆنگرەی هەرەوەزییەكانی كشتوكاڵی دا كەلەتاراندا بەرێوەچوو، یەكەمین شەش بنەمای پێویست بۆشۆڕشم خستەروو:

١. دابەشكردنی زەوی‌وزار: دابەشكردنی زەوی لەنێوان ئەوكەسانەیدا كەبە سەریەوە كاریان دەكرد.
٢. نیشتمانی كردنی دارستانەكان و لەوەڕگەكان.
٣. گۆڕینی كارگە دەوڵەتیەكان بۆكۆمپانیای هاوبەش و فرۆشتنی پشكەكان وەك پاڵ پشتێك بۆجێبەجێ كردنی دابەشكردنی زەوی و زار.
٤. بەشداركردنی كرێكاران لەقازانجی كارگەكاندا.
٥. چاكسازی لەیاسای هەڵبژاردندا. بەشداری گشتی و بەتایبەت ژنان لە هەڵبژاردنەكاندا.
٦. پێكهێنانی سوپای زانست لەوسەربازانەی كەخوێندنیان تەواوكردبوو بۆئەوەی لەگوندەكاندا وانە بڵێنەوە.

ئەم پلانە لەڕاستیدا پلانێكی پراكتیكی بوو لەوەڵامی پێداویستیكانماندا و گونجاو لەگەڵ چۆنیەتی بیركردنەوە ونەریتمان و بەپێی بایەخ و گرنگی داڕێژرابوو. ئەم شەش بنەمایە لەگەڵ سیازدە خاڵی دیكە، كەسەرەتا بەپێی پێداویستییەكانمان و پاشان لەوەڵامدانەوەی ئەو پێویستیەنوێیانەی كەلەم رێگایەدا پەیدابوو، یەكیان گرت .

٧. پێكهێنانی سوپای تەندروستی (٢١ی جەنیوەری١٩٦٤). خوێندكارانی دەرچووی پزیشكی و ددان پزیشكی بەركەوتووی خزمەتی سەربازی و پەرستاران و هتد بەبێ بەرامبەر لەگوندەكانداخەریكی خزمەت و ڕاهێنان دەبوون.

٨. پێکهێنـانی سـوپای برەوپێـدانو ئـاوەدانی (٢٣ی سـپتەمبەری١٩٦٤). بەرکـەوتووانی خزمـەتی سـەربازی بۆمـۆدێرنیزەکردنی کـشتو کـاڵ لەگوندەکانو شارەکاندا خەریکی خزمەت دەبوون.

ئەندامانی ئەم سێ سوپایە بەهاوبەشی بە "ئەندامێن سوپای شۆڕش" ناوبانگیان دەرکـرد. کـچانو ژنـانیش لەسـەر داوای خۆیـان دەیـان تـوانی یارمـەتیان بـدەن. لەیاسادا پێش بینی کرابوو کەئەگەر ژمارەیەکی کەم بەشدارییان کرد ئەوا کچانی گـەنج بۆخزمـەت کـردن بەنیشتمان لـە یـەکێك لەسـوپاکاندا بانگهێـشتی خزمـەت بکـرێن. بـەلأم هەمیـشە خۆبەخـشی پێویـستو، ئەگـەر نـەڵێین زیـاد لەپێویـست هەبوو.

٩. دامەزراندنی دادگای گوندەکان ناسراوبە " خانەکانی داد".
١٠. نیشتمانی کردنی ئاوەکان.
١١. نوێـسازیو ئاوەدانکردنـەوەی شـار بـەهاوکاری سـوپای برەوپێـدانو ئاوەدانی.
١٢. شۆڕش لەبواری کارگێڕیو فێرکردن دا.

لە ١٩٧٥دا ئەم خالأنەش زیادکرا:

١٣. فرۆشـتنی تـا ٤٩٪ پـشکی کارگـە گـەورەکان بـەکرێکاران. کرێکـاران ئـەم پشکانەیان بەقەرزی دەوڵەتی دەکڕیو لەداهاتی کارگەکەش ئەم قـەرزەیان دەدایەوە (مانگی ئاگۆست).
١٤. پـشتیوانی کـردن لەبەکارهێنـەر: بەربـەرەکانێ لەگـەڵ هەڵاوسـانو گـران فرۆشتن لەرێگای کۆنترۆڵ کردنی نرخەکانەوە (مانگی ئاگۆست)
١٥. پـەروەردەو فێرکردنـی بـێ بەرامبـەرو سـەپێنراوی هەشـت سـاڵەو درێژەپێدانی بەمەرجێکە دەرچووان، ئەوەنـدی زیاتر لـەم هەشـت ساڵەی کەلەئامادییەکان و زانکۆکاندا خۆیندوویانە خزمەتی وڵات بکەن (مانگی دیسامبر)

١٦.خـواردنی بـیّ بەرامبـەر بۆدایکـانی نـەدار ومنـدالآن تـا تەمـەنی دووسـالّ (مانگی دیسامبر )

١٧. بیمـەی کۆمەلآیـەتی و مانگانـەی سـەردەمی پـیری هـەموو ئێرانییـەکان بگرێتەوە (مانگی دیسامبر)

سـەرئەنجام، لەسـالّی ١٩٧٧دا دووخـالّی نـوێی دیکـە کەوتـەبواری جێبـەجیّ کردنەوە:

١٨. بەربـەرە کـانیّ لەگـەلّ بازرگـانی کـردن بـەکڕینو فرۆشـتنی زەوی و خانووبەرەو مردەمالّەوە.

ئـەم خالّـە بەمەبەسـتی بـەرگری کـردن بـوو لەبەرزبوونـەوەی هەرەمـەکی کـریّ خانووبەرەو نرخی زەویو بالّەخانەو هتد.

١٩. بەرەنگاربوونەوە لەگەلّ گەندەلّیو بەرتیل خۆری

ئـەرکێن دژوارو گـران لەبەردەمـدا بـوو. بـەلآم دەبینـێن کەچـۆن بـەهاوکاری میللەتەکەم دەست بەکاربووەو چۆن یەکێك لەپێویست ترین چاکسازییەکان، واتا چاکسازی زەویو زارم دەسپێکرد.

# فەسڵی ٩

## تەقسیم ئەرازی

لەساڵی ١٩٤١و ئەوکاتەی کەدەبوو لەگەڵ گرفتەکاندا بجەنگیمو بەرپرسایەتی دەسەلاّت ئەویش لەهەلومەرجێکدا کەپێشتر باسم کرد لەئەستۆبگرم، بەزۆری لەخۆم دەپرسی کەباشترینو گرنگترین ئامانجەکان بۆ یارمەتی دانی خەڵکی ئێران لەرێگای تێکۆشان بۆمانەوەدا چییە.

بەرای من ئەوان بۆپێشگیری لەفەوتان پێویستیان بەیەکیەتی بوو، یەکپارچەییکی جەستەیی و فیکریو ئەخلاقی.

لەبەر ئەوەی کەهیچ نەتەوەیەك ناتوانێت رۆحی خۆی بگۆرێت، هەربۆیە، پێویست بوو زیاترلە مەتریالیزم بایەخ بەریالیزم بدەین.

من بۆخۆم بەپێچەوانەی ئەوکەسانەی کەپیشەیان سیاسەت بوو بیرم دەکردەوە ونەقشم ئەوەبوو کە ئەکرێو ناکرێ لێك جیابکەمەوە. هەربۆیە بەهیچ نرخێك نەدەبوو بیاڤی ئاواتو ئامانج – بۆنموونە بنەماکانی یەکسانیو ئازادی – لەگەڵ بیاڤی راستیەکاندا بەهەڵەبکرم. سەبارەت بەدەسەلاّتی مەزهەبی کە کۆمۆنیستەکانو نکوڵی کارانی خوا بەرێیان خست بەباشی روون بوو کەتەنیا

بـارودۆخێکی پڕلــە مەترســی چـاوەڕێی دەکـات. بەداخــەوە لــەبارەی ئێرانــەوە، داهاتوو لەم بارەوە هەڵەکردنی منی نەسەلماند.

٢٠٠هەزار هێکتـار زەوی لـە نێـوان جووتیارانـدا دابەشـکرا لەسـاڵی ١٩٤١دا بـەدانی زەوی کشتو کاڵی خـۆم بەدەوڵـەت کارێکم دەست پێکرد کەچاوەڕوانییەکی زۆرم لێـی هـەبوو بـێ گومـان ئـەم کـارە دەبـووە هـۆی شـۆڕشێکی بـچووك کەپێکهاتـەی کۆمەڵگەی لادێی تووشی گۆڕان دەکرد.

بەڵام لەبەر ئـەوەی کـە دەوڵـەت وای بـەباش دەزانـی کەلـەو کاتـەدا دەسـکاری ئـەم پێکهاتــە نــەکات، ناچـاربووم ئــەم زەوییانــە لەدەوڵــەت وەربگرمــەوەو لــەنێوان جووتیارانـدا دابەشم کرد. هاتنەمەیـدانی موسـەدێق جارێکی دی پلانـەکانی مـنی تێکداوتـەنیاپاش لەسـەرکارلابردنی ئـەو بـوو کـەتوانیم بەرنامـەی دابەشـکردنی زەویو زار درێژە پێبدەم.

بـۆ یارمـەتی دان بـە جووتیـاران، بانکێـك بـۆ بایەخـدان بەکـشتو کـاڵ دامـەزرا. سەرەڕای بەرگری کردنی توند، یاسایەك بۆدابەش کردنی زەوی خـاوەن مۆڵکـەکان پەسەندکرا. ٢٠٠٠٠٠ هێکتار زەوی بەسەر زیاترلە ٤٢٠٠٠جووتیاردا دابەش کـرا (١٩٥٥). وە سەرئەنجام یاسایەك کەسنووری دادەنا بۆخاوەنداریێتی تایبـەتی ئـەو زەوییانـەی کـەگونجاوبوون بۆکشتو کـاڵ، بەگەڕانـەوە بـۆ ڕای گـشتی پەسـەندکرا (١٧ی جەنیوەری١٩٦٣).

هـەر لەوسـەردەمەدا تـازە بنەماسـەرەتاییەکانی شۆڕشـێکی پێویـستم ڕاگەیاندبوو. خەڵکی ئێران تەواوی ئەو شەڕانەی کەمن بۆ پاراستنی یەکپارچەییو سەربەخۆیی وڵات ڕیبەرایـەتیم کردبـوو، لـەبیریان بـوو. ئـەوان بۆخۆیـان شـایەت بـوون کـەمن زەوییـەکانی خـۆم بەسـەر جووتیارانـدا دابـەش کردبـوو، هـەر بەپـشتیوانی ئـەم متمانەیـەی کەبـەمنیان هـەبوو، لەیەکـەمین کۆنگرەی جووتیارانـدا (٩ی جـەنیوەری ١٩٦٣) بەرنامەکانی خۆم بۆ ئەوان شرۆڤەکرد.

لـە ١٧جـەنیوەری دا خـەڵك بـەدەنگی یـەك لا کـەرەوەی زۆرینـە جاڕنامـەی شـەش ماددەیی منیان پەسەندکرد. وە بەمجۆرەبوو کەشۆڕشی ئێران بە دیمۆکراتیکترین

شێوە بە گەڕانەوە بۆڕای گشتی بەدی دەهات. زیاتر لەهەرشتێك، لەم بەروارەوە بوو کە بەرنامەکانی پێنج ساڵەی ئێمە (سێیەمو چوارەمو پێنجەم لە١٩٦٣ تا ١٩٧٧) وەك کەرەستەی راستەقینەی شۆڕشی سپی خۆیی نیشان دا. من چۆنیەتیو تەواویەتی ئەم شۆڕشەم بەمجۆرە بەبیرهێنایەوە:

"...هەندێ لەحیزبەکان گومانیان وایە تەنیا ئەویاسایانەی کەدەرئەنجامی بیروبۆچوونەکانی ئەوانە دروسترین یاسایە. هێزی ئێمە سەرچاوەی لەم ڕاستیەدایە کەشۆڕشی ئێمە خۆازیاری سەرکەوتنی چینێك یان ئایدۆلۆژیایەك بەسەر ئەوانیتردا نییە... شۆڕشی ئێمە شۆڕشی سپییە: ئێمە لەهیچ دروشمێك پەیڕەوی ناکەین بەڵام هەرچی کەبەلامانەوە باش بێت بەدڵ فراوانییەوە وەری دەگرین، جا ڕەنگ‌وبۆی کۆمۆنیستی هەبێت یان سۆسیالیستی یان کاپیتالیستی... ئامانجی کۆتایی ئێمە ئەوەیە کەلە ماوەی بیست ساڵدا ئێران بگەیەنینە ئەوشوێنەی لە شارستانیەتو پێشکەوتن کەپێشکەوتووترین وڵاتانی جیهان پێی گەیشتوون. لەماوەی دەساڵی رابردوودا ڕادەی دواکەوتوویمان گەیشتووتە نیوە بەڵام هەرئەم نیوەی دووەمی دواکەوتنەیە کەسەرکەوتن بەسەریدا زۆر دژوارە."

### سێ قۆناغی چاکسازی:

چاکسازی لەبواری زەویو زاردا بەسێ قۆناغ جێبەجێ کرا. یەکەم، هیچ مالیکێ نەیدەتوانی خاوەنی زیاتر لەگوندێك بێت. لەخێروبێری ئەوقەرزانەی کەلە ماوەی پازدەساڵدا دەدرانەوە، ئەو جووتیارانەی کەکشت‌وکاڵیان دەکرد توانیان زیادە زەوی مالیکەکان بکڕن. مالیکەکانیش توانیان لەکارگەدەوڵەتیەکاندا پشکەکان بەدەست بێنن چونکەخاوەندارێتی زەوییە فراوانەکان نایاسایی کرابوو.

لەقۆناغی دووەم لەچاکسازی لەزەویو زاردا (فیبریوەری ١٩٦٥) خاوەن زەوییەکان ناچارکران کە ئەوزەوییانەی کەبۆخۆیان بەسەریەوە کارناکەن یان دەبێت بەکرێ

بۆماوەی سی ساڵ بیدەن بەوکەسانەی کەبەسەریەوە کاردەکات یان پێیانی بفرۆشن.
سەرئەنجام لەقۆناغی سێیەمدا: ئەوخاوەن زەوییانەی کەبەکرێدانی زەوییان هەڵبژاردبوو ناچارکران قازانجەکانی ئەوزەوییە لەگەڵ وەرزێرەکەدا دابەش بکەن یان ئەوبەشەی لەزەوییەکە کەوەرزێر لەسەری کشتوکاڵی دەکرد پێی بفرۆشن. گەورەماڵیکان تەنیا دەیانتوانی ئەو زەوییانەی بۆخۆیان ڕاگرن کەکاری لەسەرنەکرابوو بەڵام هیچ شتێك نەیدەتوانی ڕێگری بکات لەوان کە بەئۆتۆمۆبیل کەڵك لەوزەوییانە وەرنەگرن. من دژی ئەوەم کەمرۆڤ دەسرەنجی مرۆڤ ببات بەڵام دژایەتی کەڵك وەرگرتنی مرۆڤ لەماشین ناکەم.

## توندوتیژی و ئاگرنانەوە:

ڕاست پێش لەرێفراندۆم کاتێکە بەفەرمی قسەم بۆخەڵك کرد، بەمجۆرەم گوت: " ئەگەربڕیارم داوە کەئەم چاکسازییە بخەمەدەنگدانی خەڵکەوە، لەبەرئەوەیە کەهیچ کەس ناتوانێت سیستەمی کۆیلایەتی کەجووتیارانی ئێمە گرفتاری بوون جارێکی دی زیندووبکاتەوە وئیتر هەرگیز بەرژەوەندی تایبەتی کەسێك یان تاقمێك نەتوانێت شوێنەواری ئەم گۆڕانکارییە شۆڕشگێڕانەیە لەناوببات یان بیگۆڕێت."
لەجەنیوەری ١٩٦٣دا، ئەنجامی رێفراندۆمەکە شەوق و زەوقی منی ورووژاند. شەش مانگ دواتر، لەمانگی جووندا لەگەڵ سەرهەڵدانێك لەباشووردا بەرەو ڕووبووم. دوابەدوای ئەو، شەپۆلێك لەخراپەکاری و ئاژاوە و ئاگرکەوتنەوەی بە ئەنقەست لەخودی تاراندا پەیدابوو. هەروا کە بڵێیت کردنەوەی ئاگر لەجیاتی کەندنی بیردنەوت، ببوو بەکات بەسەربردنێکی نەتەوەیی.
دەرکەوت لەلایەنی ئابووری ئەم ئاژاوانە لەبنەڕتدا لەلایەن هەندێ لە گەورە مالیکانەوە دابین کرابوو. بەڵام سەرەڕای هەوڵدانی هاوئاهەنگیان نەیان توانی ڕێ لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی زەوی و زار بگرن. هەرچەندە یەکگرتنی

نەفرەت لێکراوی سوورو ڕەش یانێ چەپی ئاژاوەچی و کۆنەپەرستانی توندڕەو لەڕۆژگاری موسەدێقدا پێکهاتبوو، بەلام لەسالی ١٩٦٣دا هێشتا بەشێوەی بزاڤێکی ڕێاەوپێك و ڕێکخراوی مارکسیستی ئیسلامی لێنەهاتبوو. سەرئێشەو گرفتارییەکانی مانگی جوون بەتەواوەتی بەهۆی " ڕەش " ەوە بوو ودەرفەتی بۆخراپەکاری رەها فەراهەم کرد.

هاندەری ئاژاوەو تالان کردن و سووتاندن بەکردەوە کەسێکی نەناسراو بوو بەناوی " ئایەتوڵلا خومەینی" کەبە شێوەی نهێنی خەڵکی لەدژی چاکسازییەکانی ئێمە لەبواری زەوی و زارداو ئازادی ژنان و بەگشتی لەدژی بنەماکانی شۆڕشی سپی هان دەدا. ئەو لە ولاتدا پشتیوانێکی نەبوو و هەربۆیە شوێن کەتووانی زۆر زۆرکەم بوون. کەسیش ئەوی دادگای نەکردو سزای نەدا، بەڵکو تەنیا داوای لێکرا کە بڕوات و زمانی ئاگر هەلایسێنی لەشوێنێکی تردا هەڵسوڕێنێت.

## پارەی بەرنامەکانمان چۆن دابین کرد:

کاتێ کەقۆناغی سێیەمی چاکسازی زەوی مان جێبەجێ کرد ئیتر گەورەمالێکێك لەولاتدا نەمابوو. لەلایەکی دیکە، هەمووجووتیاران ببوون بەخاوەنی زەوی.

بۆتێگەیشتن لەسەرئەنجامی ئەم بارودۆخە، پێویستە بەبیربێتەوە کەتاسالی ١٩٥١، ٧١٪ لەدانیشتوانی ئێمە لەگوندەکاندا دەژیان و زیاتر لەنیوەی زەوییە کشت و کاڵییەکان هی مالیکانی گەورە بوو کەزیاتر لەسی کەسیان خاوەنی زیاتر لەچل لادێ بوون. هەندێ لەم سی کەسە لەسەرۆك عەشیرەکان بوون. بەمجۆرە ٢,٠٪ لەبنەماڵەکانی ولات، خاوەنی ٣٣,٨٪ زەوی کشت وکاڵی بوون. ئەم دەرەبەگە دەوڵەمەندانە، بۆخۆیان لەتاران یان لەدەرەوەی ولاتدا دەژیان و نوێنەرانیان بەرپرسی چەوساندنەوەی جووتیارانێك بوون کەبەشێوازی سەدەکانی ناوەڕاست بەسەر زەوییەکان یانەوە کشت و کاڵیان دەکرد.

بۆپڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کەلەنەبوونی مالیکانی گەورە پەیدا ببوو، بانکی کشتوکاڵ لایەنی ئابووری کۆمەڵیً پرۆژەی جۆراوجۆری دابین کرد کەبەجۆرێك لەگەڵ ئەم چاکسازییەدا پەیوەندی هەبوو.

لەکۆتاییدا، ئەم بانکە کە٢٠٠لقی لەسەرانسەری وڵاتدا هەبوو قەرزی بەجووتیاران و یەکیەتی و هەرەوەزییەکانی لادێ دەدا.تیپە گەڕۆکەکان بۆیارمەتی دانی ئابووری جووتیاران و ئاژەڵداران سەردانی ئەو شوێنانەیان دەکرد کەلەئەنجامی رووداوی سروشتی دا زیانیان پێدەگەیشت یان بەروبوومیان باش نەبوو. تەنیا لەماوەی ساڵەکانی ١٩٦٣تا ١٩٦٧، ئەم بانکە زیاتر لەبیست ملیار ریاڵ قەرزی بەجووتیاران دا. هاوکات هەرەوەزییەکانی کشت و کاڵی دامەزران و بە بەشداری مالیکانی نویً گەشەیان پێدرا. ژمارەی ئەم هەرەوەزییانە ئەوەندە خێرا زیادی کرد، کەزەمینەی کۆکردنەوەیان لە کاربرایەتیە جۆراوجۆرەکاندا فەراهەم بوو.

لەساڵی ١٩٦٣دا رێکخراوێکی ناوەندی بەسەرمایەی یەك ملیۆن ریاڵی یەوە سەرپەرشتی باڵای ئەوانەی لەئەستۆگرت. ئەرکی پێکهێنانی دەستەی بەرێوەبەری، فێرکردنی شێوازەکانی بەرێوەبردنی هەرەوەزییەکان، پەیداکردنی بازار بۆبەرهەمەکان، هاندانی ئیشی دەستی و بەستنی پەیمان گەلێك لەنێوان هەرەوەزییەکانی بەکارهێنەرو رێکخراوەکانی هەرەوەزی نێوەنەتەوەیی دا کەوتە ئەستۆی ئەم رێکخراوەیە. ئامانجی کۆتایی ئەم رێکخراوەیە – کەبەداخەوە دەبێت کرداری رابردووی بۆبەکاربێنم – ئەوە بوو کە کۆمەڵێکی تارادەیەك گەورە لەجووتیاران پێکبێنێت بۆئەوەی بتوانن بۆخۆیان هەرەوەزییەکان بەرێوەببەن، سەرئەنجام بتوانن پشکەکانی ئەم رێکخراوەیە بکڕن.

بەم شێوەیە سەرمایەو بەرێوەبەری دەکەوتە دەست ئەولایەنانەی کەخاوەن بەرژەوەندی بوون.

هەرەوەزییەکان و بانکەکانی کشت و کاڵی لەدامەزراوە کلاسیکەکانی کشت و کاڵیی نوێن. حەزدەکەم دەربارەی دامەزراوەیەکی سێیەم کەبە ڕای من خاوەن رەسەنا

یەتیێکی زیاترە قسەبکەم کەبۆ ولاتانی دیکە زۆر گرنگەو لەولاتی ئێمەش دا لێهاتوویی زۆری لەخۆی نیشان دا. مەبەستم کاربرایەتیەهاوبەشەکانی کشتو کاڵی یە.
دروست بوونی ئەوانە ئاکامی ئۆگرێک بوو کەبەرامبەر بەچاکبوونی چەندیو چۆنیەتی بەرهەمەکان نیشان دەدرا. ئێمە پێویستمان بەمیکانیزاسیونو کەڵک وەرگرتن لەشێوازو ڕێگای کارناسانە بوو، ئەم پێویستییەش لەڕێگای کەڵک وەرگرتن لەرێکخراوەکانی هەرەوەزیەوە نەبوایەت چارەسەر نەدەبوو.

## شێوازی کارکردنی کارجفەکانی کشتو کاڵی:

شێوازی کارکردنی ئەم کارجفانە بەمجۆرەبوو: جووتیارانی خاوەن زەوی بەدانانی زەوییەکانیان لەکاربرایەتی، پشکەکانیان بەدەست دەهێنا. ئەوان وەك خاوەنی زەوی خۆیان دەمانەوە بەلام نەیان دەتوانی بیفرۆشن یان لە دەرەوەی چوارچێوەی کاربرایەتی زەوی بکڕن بەلام دەیان توانی بەشەکانی خۆیان بفرۆشن بە بەشدارانی هەمان کاربرایەتی. میراتگرانی ئەم خاوەن زەوییانە تەنیا پشکەکانی کاربرایەتیان بەمیرات دەبرد نە ئەو زەوییانەی کەلەوێ پشکی پێ گیرابوو. بەمجۆرە ئەوهەزاران هێکتار زەوییەی کەتایبەت بووبە کاربرایەتی نەدەبوو دابەش بکرێتو هەربۆیە باشترین هەلومەرج بۆجێبەجێ کردنی بەرنامە درێژخایەنەکانو کەڵك وەرگرتن لەشێوازە نوێکانی کشتو کاڵ فەراهەم دەبوو.
ئەم سیستەمەی خاوەندارێتی کەهاوکات هەم گرووپییەو هەم تایبەتی، ڕاست بەپێچەوانەی ئەوەی کولخوزو کیبوتسە کە لەواندا کارکردن بەکۆمەڵە بەلام بەرژەوەندی تایبەتی لەناوچووە. لەئێراندا پشکە بێ ناوەکانی کارجفەکان دەرفەتی بۆ جووتیاران دەرەخساند کەلە بەشێك لەو دەزگا بەرهەم هێنەرە گەورەیەدا کاربکەنو لەکۆتایی ساڵیش دا جیا لەو هەق دەستەی کە وەریان

گرتبوو لەقازانجی پشکەکانیشیان بەشیان بەرکەوێت. لە هەمان کاتدا ئیتر لە زەوی گەورەو بەربلاوی تایبەت بە مالیکێك شتێك لە گۆڕێدا نەبوو.

لێرەدا ئاکامی پازدەسالٚ چاکسازی لەبواری زەوی‌و زاردا لەژمارەکاندا کورت دەبێتەوە:

زیاتر لەدوو ملیۆن خێزانی جووتیاربوون بەخاوەنی زەوی.

٢٨٧١ هەرەوەزی زیاتر لەبیست ملیارریالٚ قەرزیان دا بە٢٨٠٠٠٠٠ کەس لەئەندامانی خۆیان.

١٤٧ یەکیەتی لەلادێ کاندا دروست ببوو کە٢٨٠٠ هەرەوەزی ئەندامی بوون.

٨٩ کارجفی کشت‌و کاڵی قازانجی بەدەست هاتوو لە٤٠٠ هەزار هێکتار زەوییان لەنێوان ٦٠٠٠٠ کرێکاری وەرزێڕدا دابەش کرد.

٣٥ هەرەوەزی کشت‌و کاڵی بوون بەبەرپرسی چاکسازی ٨٨ هەزارهێکتار زەوی (بەشیوەی هەموارکردن‌و ئاودێری‌و چۆنیەتی کەڵك لیٚ وەرگرتنی) کەتایبەت بوو بە٥٧هەزارجووتیار.

١٠٢٢ ناوەندی فەرهەنگی خەریکی یارمەتی دان‌و فێرکردنی دووملیۆن لادێی بوو، هەروەها نزیکەی ٢٥٠ هەزار مندالٚی ٣ تا٦سالٚ لە٧٤٩دایەنگەدا کۆکرابوونەوە کە رۆژانە وانەیان پێدەوتراو ژەمێك خواردنی بیٚ بەرامبەریشیان پێدەدرا.

زیادبوونی سالآنەی بەرهەمە کشت‌و کاڵییەکان لەماوەی پازدەساڵدا زیاتر لە٥٪ بووە وئەمەش بەومانایەکە بەرهەم هێنان لەم ماوەیەدا خۆی لەقەرەی دووهێندە داوە.

## کاریگەری شۆڕشی سپی لەسەرژیانی لادیٚ:

بۆتێگەیشتن لەبەرینایی ئەو گۆڕانکاریەی کە جارنامەی شۆڕشی ئێمە لەژیانی وڵاتدا پێکی هێنا، نابێت لەبیربکرێت کەجگە لە چاکسازی زەوی‌و زار، دەکریٚ

بڵێن بنەماوبەندەکانی دیکەش ڕاستەوخۆ لەسەرژیانی کۆمەڵگەی لادێیی شوێن دانەر بوون. تەنیا بەندەکانی ١٩,١٣,١٢,٥,٤ ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەبوو. لێرەدا بەکورتی ئاماژەیەك بەبەندەکانی ١١,٨,٧,٦,٣ دەکەم کەیارمەتی مۆدێرنیزە بوونی گوندەکانی دەدا.

بنەمای سێیەم دەورێکی سەرەکی لەچاکسازی زەوی دا هەبوو، چونکە پەیوەندی بەدابین کردنی لایەنی ئابووری ئەم گەلألەوە هەبوو. ٥٥ کارگە کەپێشتر سەربە وەزارەتی ئابووری بوونو سەرمایەکانیان نزیکەی ٧/٧ ملیارریالْ بوو، کران بە کاربرایەتی گەلێك بەپشکی بیْ ناوەوە. ئەم سەرمایەیە دابەشکرا بۆ ١٥٤هەزاربەش بەبڕی هەرکام ٥٠٠٠٠ریالْو بەهۆی بانکی کشتو کاڵییەوە، لەبەرامبەر نرخی ئەو زەوییانەی کە گەورەمالیکان فرۆشتبوویان، درابە مالیکان. بەم شێوە، ئێمەنەتەنیا لەوەستانی سەرمایە خۆمان بوارد، بەڵکو بەدابین کردنی زەمینەی بەشداربوونی هەمووچین و توێژەکانی کۆمەڵگا، ئەوانمان بۆ بەشداری کردنی ڕاستەوخۆ لەگەشەپێدانی پیشەسازیدا ناچارکرد. سەرئەنجام، نرخی پشکەکان بەرز بووەوە، کارگەکان چاکتر بەرێوەبرانو داهاتی خاوەن پشکەکانیش زیادی کرد.

لەم سەرمایەیانە ٤/٣٪ لەپیشەسازی بەرهەمهێنانی شەکر و٣٨٪ لەپیشەسازی ڕستنو چنینو ٩٪ لەپیشەسازی لۆکەو ئاورێشم و ٧٪لەپیشەسازی بیناسازیو ٣٪ لەپیشەسازی کیماییو خۆراکی دا وەگەرخرا. تەنیا ڕێگای ئاسنو پیشەسازی سەربازی و دەرهێنانی خەڵووزی بەردینو ویزگەکانو نەوتو کانەکانو کیمیای نەوتو پیشەسازی سەرەکی ئاسنو مس بەتەواوەتی لەخاوەندارێتی دەوڵەت دا مایەوە. لانی کەمی سوودی مسۆگەری ساڵانە ٦٪ بوو.

هەموو ئەم کارگەیانە نوژەن کرانەوە و کەرەستەکانیان چاکترکران.پشکی ئەو کارگەیانەی کەسوودیان لەئاستی پێویستدا نەبوو بەخەڵکی نەفرۆشران، بەڵکو کەوتنەژێر بەرپرسایەتی ڕێکخراوی پەرەپێدانو نوژن کردنەوەی پیشەسازی

ئێران بۆئەوەی کەنۆژەن یان بکاتەوە. بڕیاربوو پشکەکانیان ئەوکاتەی کەخاڵی سیازدەیەم جێبەجێ دەکرا بەخەڵکی بفرۆشرێت.

## نیشتمانی کردنی لێڕەوارو لەوەڕگەکان:

سەرئەنجام، پێویستە لێرەدا باسی ئەو کارانەبکەم کەبۆجێبەجێ کردنی خاڵەکانی ١٠،٢ ئەنجام دران. ئەم خاڵانە لەلایەك پەیوەندییان بە خۆماڵی کردنی لێڕەوارو لەوەڕگەکانەوە هەبوو ولەلایەکی دیکە تایبەت بوو بەنیشتمانی کردنی ئاوەکان. ئەم کارانە لەگەڵ پێویستیەکانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی ئێران‌و لەگەڵ بنەماکانی شۆڕشی ئێمەو هاوکات لەگەڵ کۆنترین نەریتەکانی ئێمەو لەگەڵ ئاکاری ئیسلامیشدا یەکی دەگرتەوە.

بەداخەوە لەئێراندا لێڕەواری زۆرنییە: نزیکەی ٣٤٠٠٠٠٠ هێکتار لەباکوورو بەدرێژایی کەناری باشووری دەریای خەزەرو بەشی باکووری کێوەکانی ئەلبۆرز و دووتاسێ ملیۆن هێکتاری تریش لەرۆژئاواو باشووری رۆژئاواو دەوروبەری بیابانەکانی ناوەندی‌و کەنارەکانی کەنداوی عەممان دا پەرش‌وبلاوە. هەروەها، تەنیا بەشێك لەم دارستانانە (١/٣ ملیۆن هێکتار لەباکووردا) بۆبەکارهێنانی لەپیشەسازیدا گونجاوە. باقی دارستانەکان لە رابردوودا فەوتان‌و، لەرووی بایەخی ئابوورییەوە بەمزووانە کەڵکی لێوەرناگیرێت. گەوجی مرۆڤ و ئیشتیای بزن بووە بەهۆی لەناوچوونی بەشێکی گەورە لە دارستانەکانمان.

نیشانەی زۆر هەیە کەدەیسەلمێنێت ئێران لەسەردەمانی دێرینەود تا سەدەی هەژدەیەم، بەتایبەت لەرووی دارستانەکانی بەڕوو و ئەرژەن‌و پستەو سنەوبەرەوە لەباشووردا زۆر دەوڵەمەند بووە. لەسەردەمی هەخامەنشی دا لەچوارچێوەی ئێرانی ئێستادا زیاتر لە ١٦ ملیۆن هێکتار دارستان هەبووە.

بێ گومان هەژاریمان لە رووی دارستانەوە هەڵدەگەرێتەوە بۆسەردەمی هێرشی مەغۆلەکان، بەلام بەزۆری لەم سێ سەدەی دواییداو بەتایبەت لەسەرەتای سەدەی

بیستەم دا بوو کەپانتاییێکی بەرین لەداری دارستانەکانیان بەشێوازێکی دوور لەئەقڵ بڕی بۆ مەبەستی دابین کردنی خەڵووزو گەرما و بەکارهێنانی لەدارتاشیدا. بەجۆرێکە تەنیالەماوەی١٩٠٣ تا ١٩١٣دا نزیکەی ١٣٠ هەزارتەن خەڵووز بەرهەم هات کە٢٣ هەزارتەنی هەناردە کرا.

لەمێژووی دێرینی ئێراندا هیچ نیشانەیەك لە بوونی خاوەنداریێتی تایبەتی لەدارستانەکاندا نابینرێت. یاسای ئیسلام بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات کە رووبارو لێڕەوارو لەوەڕگەو دەریاچەو گۆماو نابێت خاوەنداریێتی تایبەتی هەبێت. لەسەردەمی دەرەبەگایەتی دا، کە دەوڵەتی ناوەندی لاوازو گەندەڵ بوو، گەورە مالیکانی زەوی، بەبێ ئەوەی لەبیری دوارۆژدابن پانتاییێکی بەرین لەزەوی دارستانەکانیان زەوت کرد.

بەڵام نەلە هەوڵی پاراستنی دا بوونو نە نەمامیان لێ ناشتو نە تەنانەت ژیرانەش کەڵکیان لێ وەرگرت، بەڵکو تەنیا بۆ بەرژەوەندی کاتی خۆیان بەکاریان هێنا. هەربۆیە بیابانەکان بەرین بوونەوەو مەترسی ئەوە هەبوو کەئەگەر هەنگاوێك نەهاوێژرێت ئەم دارستانانە بە تەواوەتی لە ناوبچن.

## دارستان تایبەتمەندە بەهەمووان:

لەبەر ئەوەی کەهۆو هاندەری شۆڕشی ئێمە "بەشی هەرکەس بەپێی کارو کۆششی" بوو لەساڵی ١٩٦٣دا رامگەیاند: "دارستان سەرچاوەی سامانی سروشتییەو هیچ کەس بۆ ئەفراندنو گەشەپێدانی کارێکی نەکردوە. سروشت لەبەردەستی ئێمەی داناوەو هەق وایە تایبەت مەندبێت بە هەموو ئەوکەسانەی کە لەم وڵاتەدا دەژین." ئەوشتەی دەربارەی دارستانەکان وتم دەقاودەق دەربارەی لەوەڕگەکانیش وەڕاست دەگەڕێت. بەپێی ئامارەکانمان ئێران خاوەنی هەشت ملیۆن هێکتار لەوەڕگەی باشو تارادەیەك باشو، دەملیۆن هێکتار لێڕەوارە. بەڵام خاڵی جێی سەرەنج ئەوەیە کە ئەم لەوەڕگەیانە تەنیا دەتوانن خواردن بۆنیوەی

ئەو مەڕوماڵاتانەی کەهەیە دابین بکەن. بەواتایەکی تر توانایی ئەم لەوەڕگەیانە بەهۆی زیاتر بەکارهێنانیان کەم دەبێتەوەو مەڕوماڵات لاواز دەبن.
ئەم کارە دەربڕی ئەوەیە کەخاوەنداریێتی لەوەڕگەکان ببوو بەهۆی ئەوەی کەکەڵکی خراپی لێ وەربگرن. زەوییان بەنرخی زۆر بەکرێ دەداوو هەندێ جاریش درێخیان لەجووتیاران دەکرد بۆ ئەوەی بۆشتی بەسوودتر تەرخانی بکەن.
فەرمانی نیشتمانی بوون لە١٦ی فیبریوەری ١٩٦٣دا پەسەندکرا. لەوکاتەوە لێڕەوارەکان و لەوەڕگەکان بوون بە بەشێکی جیانەکراوە لەمیراتی نەتەوەیی. بەخاوەنی ئەم زەوییانە لەبەرامبەر گواستنەوەی ماف خاوەنداریەتیانەدا (کەتۆمارکرابوو) پارەیەکی گونجاو درا. بۆئەم کارە، هەم سەبارەت بە دارستانەکان و هەم لەپەیوەندی لەگەڵ زەوییەکانی کشت و کاڵی دا، ئەو باجەی کە لەمالیکەکان وەرگیرابوو، وەك بناخەی لەبەرچاوگرتنی بژاردن دانرا. داریوش دەڵێت : " درۆ و دوژمن و وشکەساڵی " دژوارترین بەڵان.
پارێزگاری و پەرەپێدان و بەکارهێنانی ئەم دارستانانە کەوتە ئەستۆی رێکخراوی لێڕەوارو لەوەڕگەکان.
چاندنی زەوییەبەرینەکان قەدەغەکراو بەرهەمهێنانی خەڵووزی دار لەناوەندو رۆژئاواو باشووری وڵاتدا نایاسایی راگەیەنرا، بۆ ئەوەی دەرفەتی ناشتنی نەمام لەدارستانە وێران کراوەکاندا فەراهەم ببێت. کۆمپانیای میللی نەوتی ئێران هەزاران شوێنی بۆ فرۆشتنی نەوت و نەوتی سپی و بەنزین کردەوە بۆ ئەوەی جێگای بەکارهێنانی خەڵووزی دار بگرێتەوە. بەمجۆرە دارستانەکانی باکوور بۆ فرۆشتنی ٢٠٠ هەزار تەن داری پێویست لە سەرانسەری وڵاتداو بەملیۆن مەتری سێجای دیکە کەلەپیشەسازی دا بەکاردەهێنرێت بەس بوو.
سەرئەنجام، زیاتر لە ٩ ملیۆن نەمام لە ٢٦ ناوچەدا نێژرا. ٢٨ هەزار هێکتار "پشتێنەی سەوز" بە چواردەوری شارەکان و بەدرێژایی رێگا سەرەکییەکانا دروستکرا، ژمارەیەکی زۆر پارکی گشتی و ٣٩ هەزارهێکتار دارستانی نوێ و ٨٠٠ هەزارهێکتار داروەدەوەن بۆ پێشگیری لەپەرەگرتنی بیابان، هەمووی ئەمانە

هەنگاوەکانی سەرەتابوون کەبۆ بەدەست هێنانەوەی ئەم سامانە لەدەست چووە هەڵگیران. ٧٠٠ هەزارهێکتار بیابان بەناشتنی درەختانێک کە ڕەگەکانیان دەتوانێت بەرەو قووڵایی زۆربڕوات، ئاوەدان کراونەتەوە.
لەوەڕگەکان دەسبەجێ کەوتنە بەردەستی ئاژەڵداران. پووشانەو ئاوانەیەك کە ماڵیکان پێشتر لە بری کەڵك وەرگرتن لە لەوەڕگەو ئاو وەریان دەگرت هەڵوەشایەوە. وەزارەتی کشتو کاڵ بۆ گەشەپێدانی لەوەڕگەکان پلانێکی جێبەجێ کردو بۆ زیادکردنی ژمارەی بیرەئاوەکانو شوێنی ئاوخواردنەوەو پشتێری مەڕومالآت گەلآلەگەلێك دارێژرا.

## شەڕ بۆ ئاو:

لەساڵی ١٩٦٨دا ئاوەکانمان خۆماڵی کرد، هەم ئاوی سەرزەوی‌و هەم ئاوی ژێرزەوی، ڕۆشتوو یان وەستاو. دیسان لێرەشدا لەنەریتی هەخامەنشی‌و پەیامەکانی قۆرئان دەربارەی خاوەندارێتی گشتی بەسەرئاوەکاندا پەیڕەوی مان کرد.
بەداخەوە ئێران هەمیشە لەڕووی ئاوەوە لەتەنگانەدا بووە. تۆزێ پێشتر ئامارژەمان کرد کە داریوش پاڕابووەوە کە خواوەند وڵاتەکەی لەوشکەساڵی بپارێزێت.
لەکاتێکدا تێکڕای جیهانی بارینی ساڵانە ٨٦٠ میلی مەترە، ئێران تەنیا ٢٣١ میلی مەتر بارانی هەیە. بەپێی بارانی ساڵانە، پاشەکەوتی ئاوی ئێمە لە ٢٨٠ بۆ ٥٢٠ ملیارمەتری سێجا لە بەرزی‌و نزمی دایە، یانێ ٣٧٨ ملیارمەتری سێجا بەتێکڕا.
٧٣٪ ئەم بارانە دەبارێت بەسەردارستان‌و لەوەڕگەو دەیمەکاندا یان دەڕژێتە ناو دەریاو دەریاچەکان. ٢٧٪ ماوەی (تێکڕا ١٠٣ ملیارمەتری سێجا) لە بیرە ئاوەکان‌و ڕووبارەکاندا دەستی پێڕادەگات. لەساڵی ١٩٧٦دا ٦٦/٨ملیارمەتری

سێجای ئاو بەس بوو بۆ بەکارهێنانی لەکشتو کاڵو شارو پیشەسازیدا. کشتو کاڵ بەتەنیا ٢٦/٢ملیارمەتری سێجای پێویست بوو.
بەسەرنجدان بەم ژمارانە بە روونی دەردەکەوێت کەوشکەساڵییێك ئێمە لەگەڵ مەترسی بێ ئاوی بەرەو ڕوودەکاتو دوو وشکەساڵی یەك لەدوای یەك کارەسات دروست دەکات. هەروەها دەبینرێت کە زۆربوونی خێرای ژمارەی دانیشتوانو گەشەسەندنی کشتو کاڵو ئاودێریو پیشەسازی پۆڵاو کیمیای نەوتو پێویستی ڕوو لەزیادبوون بەوزەی کارەبا، پێویست دەکات سیاسەتێکی گونجاو سەبارەت بە ئاو ڕەچاوبکرێت. پێویستە لەو سەرچاوانەی کە هەیە بەباشترین شێوەپارێزگاری بکرێتو لەسەربنەمای قازانجی گشتی دابەش بکرێتو ئەگەر کرا بەدوای سەرچاوەی نوێدا بگەڕێن.
تاپێش لەساڵی ١٩٥٣ پێنج بەنداوی بچووك دروست کرابوو، کەسەرجەم بەبڕی سیازدە ملیار مەتری سێجای ئاوەوە، بەشی ئاودێری ٨٠٠هەزارهێکتار زەوی (کە ٤٠٠٠٠٠ هێکتاری ئەو زەوییانەی بوو کەزیندووکرابوەوە) و بەرهەمهێنانی ١٨٠٤میگاوات کارەبای دەکرد. لەکاتێکدا کە ناچارکرام ئێران بەجێ بێلم پێنج بەنداوی گەورەی دیکە لەقۆناغی جێبەجێکردندا بوو. تەنها یەکێك لەو بەنداوانە، یانێ بەنداوی رەزاشای مەزن،بڕیار بوو ١٥٠ هەزار هێکتار زەوی ئاودێری بکات و هەزار مێگاوات کارەباش بەرهەم بهێنێت. بەهۆی دووبەنداوی دیکە کەبڕیاربوو لەسەر ڕووباری کاروون دروست بکرێت، ٣٠٠٠میگاوات کارەبای دیکە بەرهەم دەهات. لێکۆڵینەوە بۆ بەکارهێنانی ئاوی ناوچەقسڵییەکانی ژێرزەویش لەگۆڕێ دا بوو.
بڕیاربوو لەڕێگای سازگارکردنی ئاوی دەریا لەکەنارەکانی کەنداوی فارس داو بەهۆی رەئەکتۆرێن ئەتۆمییەوە، لەهەوڵی دابین کردنی ئاوی زیاتردابین. دروستکردنی ناوچەیەکی پیشەسازی بۆ بەکارهێنانی ئەم ئاوەپێشێتی هەبووە، لەبەر ئەوەی دەمان ویست لەکەنارەکانی کەنداودا دروستی بکەین، کەئیتر ئاوی دەشتەکان تەنیا بۆ کشتو کاڵ بەکاربهێنرێت.

لەڕاستی دا دەمویست لەداهاتوویێکی دووردا پێداویستیەکانی ئاودێری بۆ ١٥ملیۆن هێکتار زەوی لەجیاتی ٣/٧ملیۆن هێکتاری ئێستا فەراهەم بکەم. بەڵام بۆ گەیشتن بەوەها ئامانجێك پێویستمان بەوزەی زیاتربوو. هەرچەندە دەكرا لەبەنداوەکانو سەرچاوەکانی دیکەی ئاوی وڵات نزیکەی ١٠٠٠٠مێگاوات کارەبا بەرهەم بهێنرێت بەڵام هێشتا نەمانتوانی بوو ئەوکارەبکەین.

لەساڵی ١٩٦٣ تا ١٩٧٧ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا لە ٢٣٣٨ملیۆن کیلۆواتە بەرزبووەوە بۆ زیاترلە٢٠ملیارکیلۆوات و توانایی ویزگەکانمان لە ٨٥٠ مێگاواتەوە بۆزیاترلە ٧٥٠٠ مێگاوات زیادی کردو بڕیاربوو لەداهاتوویێکی نزیکدا لەدوو ویزگەی کارەبای ناووکییەوە کەلەقۆناغی جێبەجێ کردندا بوون ٢٤٠٠ مێگاواتی دیکە بەرهەم بهێنرێت. پێشتر ئاماژەم پێدا کەئامانجی کۆتایی بەرهەم هێنانی ٢٥٠٠٠مێگاوات وزەی کارەبای ناووکی بوو.

کەواتە روونە کەهەرچەندە من بەوە تاوان باردەکەن کە "ئاوڕم لەکشتو کاڵ نەداوەتەوە" بەڵام پێچەوانەی ئەوشتە ڕاستە. لەوڵاتێکدا کە کەمی ئاو و شێ هەیە، تەرخانکردنی پارەی پێویست بۆئاودێری و تێرکردنی زەوی بەراستی زۆر قورس بوو و زیاتر لەوەی کەئێمە لەم ڕێگەدا ئەنجاممان دا کارێکی ئەوتۆ نەدەکرا.

# فەسڵی ١٠

## کاری سوپاکانی زانست و
## تەندروستی و برەوپێدان وئاوەدانی

سوپاکانی زانستو تەندروستیو برەوپێدانو ئاوەدانی کەشۆرش دروستیانی کرد، لەباشکردنی بارودۆخی گوندەکانوتەندروستیو پەروەردەو فێرکردنو سەرخستنی ورەی گوندنشینانو کۆمەڵگەی کشتو کاڵی دا بەگشتی دەورو نەقشێکی گرنگیان هەبووە. ئەم سوپایانە پێکهاتبوو لەو پیاوانەی کەبەرخزمەتی سەربازی کەوتبوونو ئەو ژنانەی کەخۆبەخشانە حەزیان لەیارمەتیدان لەو بوارانەدا دەکرد. کچانی گەنجیش لە رادەبەدەر شەوقو زەوق یان نیشان دەدا. لەکاتێکدا کەسەردانی یەکێك لە ناوەندەکانی راهێنانی ژنانم دەکرد پرسیم کێ ئامادەیە لەگوندەکاندا خزمەت بکات. وەڵامی هەموویان ئەرێنی بوو.
بەپێی ئەو ئامارانەی کەلەبەردەست دایە، پێش لەساڵی ١٩٦٣ لەنێوان ١٦ بۆ ٢٤ لەسەدی منداڵان لەلادێ کاندا دەچوونە قوتابخانەو باقیەکەی نەخوێندەوار بوون. لەکاتێکدا لەشارەکاندا ٧٤لەسەدی منداڵان دەچوونە قوتابخانە. یاسای خوێندنی سەپێنراو لەساڵی ١٩٤٣دا پەسەندکرابوو بەڵام لەبەر نەبوونی کەرەستەی جێبەجێ کردن تەنیا لەدەقێکی نووسراو دەچوو. لەپێوەری نیشتمانی دا لەسەدا ٨٥/١ی خەڵك نەخوێندەواربوون.

**سەدهەزارگەنج لەخەباتی دژی**
**نەخوێندەواری دا بەشداری دەکەن:**

پێم وابو کەدەکرێ ڕێگەی زاڵبوون بەسەرئەم گرفتە چارەسەرنەکراوەدا لەدڵی هەر لاوێکی ئێرانیدا پەیدابکرێت. بەمجۆرەی کەئەگەر داوامان لەوکەسانەی دەکرد کە مەرجەکانیان تێدابوو بۆئەوەی کەخۆیان ببەخشن بەفێرکردنی نەخوێندەوارانی لادێیی کەلەقوتابخانەش بێ بەری بوون، ئەوا هەموویان ڕازی دەبوون، ئەویش بەوەها شەوق ولەخۆبردووییێکەوە کەخێرا ڕێزوستایشی گشتی و تەنانەت وڵاتانی دەرەکیشی بۆلای خۆی ڕاکێشا و بووبە هۆی ئەوەی کە خەڵکانێکی زۆر سوپای زانستی ئێمەستایش بکەن.(خاڵی ٦).

ئەم سوپایە لەگەڵ سەرکەوتنێکی بێ وێنەی وا بەرەو ڕوو بووەوە کەبەڕای من لەدونیا دا وێنەی نەبووە. من لێرەدا تەنیائاماژە بەدەسکەوتەکان لەگوندەکاندا دەکەم: ژمارەی ئەوقوتابیانەی کەلەقوتابخانەکانی زانستدا بەشداری خوێندنیان کرد لەماوەی ٢٥ ساڵدا ٦٩٢٪ زیادی کرد. تەنیالەماوەی پێنج ساڵی یەکەم دا، ٥٢٠ هەزارکوڕو ١٢٨ هەزارکچ و ٢٥٠ هەزارپیاوو ١٢هەزارژن لەلادێ کاندا بەشداری خوێندنیان کرد.

لەمیانەی ئەم ماوەدا، بەرکەوتووانی خزمەتی سەربازی بەهاوکاری گوندنشینان زیاتر لە ١٠٧٠٠ قوتابخانەیان دروست کردو ٧٢٠٠ قوتابخانەیان نۆژەنکردەوە، ٩٥٠ مزگەوتیان دروستکردو ٨٢٠٠ مزگەوتیان نۆژەنکردەوە، ٥٠٠٠ حەمامی گشتییان دروستکرد، ٦٠٠٠٠کیلۆمەتر ڕێگای ناوچەیی و ٢٤٥٠٠ پردیان دروست و نۆژەن کردەوە، نزیکەی ٢٠٠٠٠ شاخەبۆریان خستەژێر زەوییەوە و زیاترلە ٨٧٠٠ مەزرایان دروست کرد، نزیکەی دوو ملیۆن ونیو لق نەمامیان ناشت، ٧٥٠٠ یانەی وەرزشییان ڕێکخست و زیاترلە ٥٠٠٠ سندۆقی پۆستەیان دانا.

تا ساڵی ١٩٧٨ سوپای زانست بیست‌وهەشت خولی بۆ پیاوانی گەنج‌و هەژدە خولی بۆ ژنان کردەوە کەتیادا زیاترلە سەدهەزار کەس راهێنران. زۆرێک لەبەرکەوتووانی خزمەتی سەربازی‌و خۆبەخشەکان بوون بەمامۆستایانێکی بەئەزموون‌و هەندێ کیان دەوری باشیان لە خانەکانی دادی گوندەکاندا گێرا. ئەم جۆرە لەپەروەردەو فێرکردن بۆ وڵات یان کۆمەڵگەی ئێرانی، یەك لەسەرسێی قوتابخانەئاساییەکان تێچووی هەبوو. هەڵبەت کارکردن لەلادێ کاندا بەشێوەی خۆبەخشانە بەرێوەدەچوو.

بەڵام چاکتروابوو کەئەم کارانە لەچوارچێوەی بەرپرسایەتی سوپای سێیەمدا (سوپای بروپێدان‌و ئاوەدانی) بێت (خاڵی ٨). ئەم سوپایە کاری زۆری بەئەنجام گەیاندو راست دووساڵ پاش سوپای زانست دامەزرا. لەبنەڕەتدا ئامانجەکانی ئەم دوو سوپایە بەتەواوی لێك جیاوازبوون.

## پەلاماری سوپای سێیەم:

هەرکام لەئەندامانی ئەم سوپایانە سەرەتا دەبوو "ناسنامە"ی ئەوگوندەی کەتێدا خزمەت دەکەن ئامادەبکەن. ئەم ناسنامەیە پرس نامەیەك بوو تایبەت بەبارودۆخی جۆگرافی‌و کشت‌و کاڵی‌و ئابووری‌و جڤاکی‌و فەرهەنگی ئەو گوندە. دوابەدوای ئامادەکردنی پرسنامەکە دەکرا گرفتە ناوچەییەکان دەسنیشان بکرێت.

وێنەیەك لە پرسنامەکەیان دەنارد بۆ وەزارەتی کشت‌و کاڵ کە ئەویش دەیتوانی بەرەبەرە "ناسنامە"ی گوندەکانی ئێران ئامادەبکات.

سەرئەنجام، خولێکی نوێ بۆ فێرکردنی تەکنیکە نوێکانی کشت‌و کاڵ دەستی پێدەکرد. بەرێنوێنی یەکێك لەئەندامانی سوپا، گوندنشینان وەشاندنی ئەو تۆوەی کە وەزارەتی کشت‌و کاڵ ناردبووی لە پارچە زەوییێکی لانیکەم هەزارمەتری چوارگۆشەدا تاقی دەکردەوە. لەم مەزرا نموونەییەدا، گوندنشینان باشترین رێگاکان بۆئامادەکردنی زەوی‌و چاندن‌و هەڵگرتن‌و ئاودێری‌و پەیین کردن‌و

بەربەرەکانیٔ لەگەلٔ نەخۆشییەکان فێردەبوون. لەباخچەیەکی نموونەیی دا، شێوازی دروستی ناشتنی نەمامو موتوربەکردنو هەلٔپاچینو وشکەلٔ کردن فێردەکران. جووتیاران چۆنیەتی هەواگۆرکیٔو پاکوخاوێنیو رووناکی پشتێرو گەورەکان فێردەبوونو لەچۆنیەتی کوتانو چاودێری کردنی ئاژەلآنی خۆیان رادەهێنران. ناوەندێك لاوانی هاندەدا بۆ ئەوەی پرۆژەگەلێك دەربارەی بەرهەمهێنانو هاوکاری کردن جێبەجیٔ بکەنو لەم رێگاوە ئەوان لەگەلٔ کێشەکانی کشتو کالٔیو ژیانی جڤاکی ئاشنادەبوون.

تەنیاکاتێك، خالٔی یازدەیەم (گەلآلەی ئاوەدانی شارەکان) جێبەجیٔ کرا کە سەربازانی سوپای سێیەم بانگهێشتی خزمەت کران.

هەندیٔ لەوخزمەتگوزاریانەی کەئەوان لە ٦٦٧٤٥ ناوچەی لادیٔ دائەنجامیان دا بەمجۆرەیە: دروستکردنی رێگەوبان، دروستکردنی جۆگەکانی ئاو، دامەزراندنی ناوەندێن پزیشکیو تەندروستی (لەوناوچانەی کەسوپای تەندروستی لیٔ نەبوو)، دروستکردنی حەمامی گشتی، قوتابخانە، کتێبخانە، گەیاندنی کارەبا، ئامادەکاری بۆ خزمەتگوزاری پۆستو تەلەفوونو تەلەگراف، دروست کردنی بینا، دووکانی هەرەوەزی، دامەزراندنی ناوەندەکانی فێرکردنی پیشەکانو تەنانەت بانکیش.

## رێکخراوی سوپای تەندروستی: پزیشکی لەرێگای تەلەفیزیۆنەوە:

سوپای تەندروستی (بەندی ٧) بەنۆبەی خۆی ئەم کارانەی ئەنجام دا: جۆمالٔ کردنو پاك کردنەوەی کانییەکان، هەلٔکەندنی بیری ئاو، دانانی ترومپای ئاو، دروستکردنی جۆگەو حەمامو هتد. ئەرکی راستەقینەی ئەم سوپایە دەرمانکردنی نەخۆشییەکانو پێشگیریو ریشەکێشکردنی نەخۆشییە گشتگیرەکانو دابین کردنی هەلو مەرجی گونجاوی تەندروستی بوو. ئەمە هەرئەوکارەی بوو کەلەجێبەجیٔ کردنیدا سەرکەوت. لەماوەی هەشت سالٔدا کۆی

خزمەتگوزارییەپزیشکییەکانی لادێ لەکەمتر لەیەك ملیۆنەوە بۆزیاتر لەهەشت ملیۆن حاڵەت زیادی کرد.

سەرکەوتنی ئەوان بەڕادەیەك گەورە بوو کەلە ١٩٧٤دا بڕیاردرا تەواوی خزمەتگوزارییە پزیشکیو تەندروستییەکانی لادێ بخرێتە ئەستۆی ئەوان. بەمجۆرە سوپایەك کەوەك ئامرازی شۆڕش پێکهاتو ئەرکی ئەوەبوو کەکەمو کورتیەکانی سیستەم قەرەبوو بکاتەوە، سیستەمی بۆلای خۆی ڕاکێشاو بوو بەڕێکخراوی سوپای تەندروستی بۆناوەندە تەندروستییەکانی لادێ.

لە ١٩٧٦دا ئەم ڕێکخراوە پێکدەهات لە ١٤٢٢ ناوەندی تەندروستیو دەرمانیو ١٢٤٠پزیشکیش لەم شوێنانەدا سەرقاڵی کارکردن بوون. لە گوندەکاندا ٤٠٠ تاقیگەی شیکاریی نەخۆشیەکانو ژمارەیەکی زۆر دەرمانگە لەهەمووشوێنێکدا هەبوو کەبەزۆری بەیارمەتی ئابووری خودی گوندنشینان دامەزرابوو.

یەکێك لەمەزنترین دەسکەوتەکانی سوپای تەندروستی لایەنی مەعنەوی ئەو دەسکەوتانە بوو و توانی متمانەی گوندنشینان بۆلای پزیشکی "رەسمی" رابکێشێت. پێشتر گوندنشینان ڕوویان لەدەرمانکارانی سوننەتی خۆیان دەنا. بەلاَم تا ١٩٧٨ ڕوویان لە "سەرباز" یکی سوپای تەندروستیو یان تەنانەت پەرستارێکی خۆبەخش دەنا.

ئەمە لە وڵاتێکدا ڕووی دەدا کەپێشتر ئەگەرپزیشکێك دەیویست دەرزی لە ژنێك بدات ئەوا دەبوو ئەم کارە لەپشتی پەردەوە و بەئامادەبوونی باوکی یان هاوڕاکەی ئەنجام بدات. لەکۆتایی دا دەبێت بڵێین کەئەم سێ سوپایە لەڕاستیدا سەربازانی شۆڕش بوون، سەربازانێکی کارامەو لێهاتوو لەچەندبواردا کەپشتیان لەهیچ شتێك نەدەکردو لەهیچ شەرێکدا هەڵنەدەهاتن. هەرکە ناوچەیەکیان پێدەسپێردرا، تائەو جێگای کە لەتوانایان دا بوو تێدەکۆشان هەلو مەرجی ژیانی دانیشتوان باشتربکەن.

سەربازانی ئەم سێ سوپایە مووچەیەکی وەك سەربازانی دیکەیان وەردەگرت کەگونجاو بوو لەگەڵ پلەکانیان، مامۆستایەکی زانکۆ دیتوو پلەکەی هاوپلەی ستوان بوو. کچانیش مووچەیەکی وەك ئەوانیان وەردەگرت.

نابێت لەبیربکەین کەلەم ماوەدا ولأتەکەمان بەرەبەرە دەوڵەمەندتر دەبوو. دەوڵەت پێداویستی زیاتری لەبەردەست دابوو و لەڕێگای کارگێڕیو یاساوە بۆ باشترکردنی ژێرخانی ولأت ئیشی دەکرد. قوتابخانەو کتێبخانەو نەخۆشخانەو دەرمانگەکان دروست دەکران. چالاکییەکانی ئەم سێ سوپایە زیاتربوو لەم کارانە. ئەوان ئامرازەکانی پێشکەوتنیان گەیاندە دوورترین شوێنو ئاوریان لەو وردەکاریانە دایەوە کەدەزگای کارگێڕی ئەوانەی لەبەرچاو نەگرتبوو بەلأم لەژیانی رۆژانەدا زیاتر لەپێشکەوتنی گشتی بایەخیان هەیە.

گرنگتر لەهەموو شتێك، ئەوان لەولأتێکدا خێراییان بە رەوتی پێشکەوتن بەخشی کەبەتەواوی پێویستی بوو. لەم ولأتەدا هەمووشتێك بەراستی لەسفرەوە دەستی پێکردبوو- لەسەدەکانی ناوەراستەوە - چونکە رووداونی شەڕو ئاکامەکانی هەموو دەسکەوتەکانی باوکمی بەفیڕۆ دابوو.

چاوەڕوانی بەکارهێنانی کەرەستەگەلێك بووم لەداهاتوودا کە زۆریارمەتی ئیشی سوپاکانی زانستو تەندروستی دەدا. بڕیاربوو سێ مانگی دەسکرد هەرکام بەسێ کەناڵی تەلەفزیۆنیەوە لەخولگەیەکی جێگیردا جێبگرن. لەم ڕێگایەوە "سەرباز" یان پەرستارێك کە لەگوندێکی دوورەدەستدا لەگەڵ نەخۆشییێکی کوشندە بەرەو ڕوو دەبوو دەیتوانی لەپسپۆڕانی پایەبەرزی تاران یان شوێنێکی دیکە ڕێنوێنی پزیشکی وەربگرێت. ئەم پسپۆڕە دەیتوانی ئەو پشکنینەی کە دەبوو بکرێت بۆ پەرستارەکەی روون بکاتەوە، یان نەشتەرگەرییەکە نیشان بدات. سیستەمێکی تەلەفزیۆنی لەم جۆرە ئەزموونو توانایی باشترین پرۆفیسۆرەکانو زانستی باشترین پزیشکانی لەبەردەستی دوورەدەست ترین ئێرانییەکاندا دادەنا.

لە هەمان کاتدا پلانێکی پەیوەندیو گەیاندن لەڕێگای دوورەوە کە سی ملیار دۆلاری تێدەچوو پەیوەندی ئێرانییەکانی لە دوورەدەست ترین گوندەکاندا

بەشێوەی ئوتۆماتیکی لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی دونیا مسۆگەردەکرد. دیسان لێرەشدا هیواداربووم کەلەڕووی پەیوەندییەوە ئێران بگەیەنمە ئاستی پێشکەوتووترین وڵاتان. ئەمە نیشانەیەك بوو لەشارستانیەتێکی مەزن.



# فەسڵی ١١

## شۆڕشی سپی وکرێکاران

دوومليۆن‌و نيو خێزانی لادێيی بوون بەخاوەن زەوييێك كەبە سەرييەوە كاريان دەكرد. (هەرخێزانێكی ئێرانی بەتێكڕا پێنج كەسە).

ناكری بڵێین كە گەورەماليكان، چ زانای ئايينی بووبێتن يان نا، لەم شۆڕشە رازی نەبوون. هەربۆيە، حاشالەوەی ناكرێت كە پێشكەوتنی بەردەوامی ئێمە بەناچاری لەسەربنەمای پيشەسازی بوونی خێرابوو. لە بيری ناكەم كەلە ١٩٦٣ بەدوا، ڕادەی ڕوو لەزيادبوونی لەدايك بوون نيشانی دەدا كەتا ساڵی ١٩٩٠ ژمارەی دانيشتوانی وڵات دەگاتە نزيكەی پەنجامليۆن كەس.

لە ١٩٥٦دا دانيشتوانی تاران ١٧٠٠٠٠٠كەس بوو و لە ١٩٧٨دا گەيشتە ٤٥٠٠٠٠٠ كەس. شارەگەورەكانی ديكەش بارودۆخێكی وايان هەبوو:

| | ١٩٥٦ | ١٩٧٨ |
|---|---|---|
| ئيسفەهان | ٢٥٥٠٠٠ | ١٠٠٠٠٠٠ |
| تەورێز | ٣٠٠٠٠٠ | ٩٠٠٠٠٠ |
| مەشهەد | ٢٥٢٠٠٠ | ٩٥٠٠٠٠ |
| شيراز | ١٧١٠٠٠ | ٧٥٠٠٠٠ |

هەرچەندە کە ئەم کێشەیە رەنگە تەنیا تایبەت بەئێران نەبێت بەڵام لەگەڵ خۆیدا گیرو گرفتی زۆر ئاڵۆزو شاراوەی هێنا.

## شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ کرێکاران:

پێش لەهەموو شتێ‌و گرنگتر لە هەمووان پێویست بوو بۆ ئامادەکردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی کرێکاران کاربکرێت. هەر بۆیە ناچاربووین لە بارودۆخی شارەکاندا هەندێ چاکسازی ئاڵوز ئەنجام بدەین. بە ناچاردەبوو زۆرێك لە ناوچە نیشتەنیەکان نوێسازی بکەینەوەو بەرلە هەموو شتێك پێویست بوو بەتوندی چاودێری نەخشەی بیناکانی ئەو کەسانەی بکەین کە دەیانویست بیناسازی بکەن.

زۆرکەس جگە لە قازانجی تایبەتی ئامانجێکی دیکەی لانەبوو.

کاتێك نرخی ماڵ‌و زەوی بەشێوەیەکی سەرسوورهێنەر بەرزبووە وەو بازرگانی زەوی‌و خانووبەرە دەستی پێکرد، سزادانیش بە رێوەچوو ( ئەمە خاڵی ١٨بەرنامەی ئێمە بوو وتەنیا لە ١٩٧٧وە جێبەجێ کرا). تەنیا رێگای پێشگیری لە خراپ بەکارهێنان ئەوەبوو کە دەوڵەت بۆ خۆی شوێنی نیشتەجێ بوون دروست بکات. هەر لەم پێناوەدا بوو کە پلانی بیناسازی شاری مان بەپێی رێساکانی جیهانی بەڵام لەئەندازەو پێوەرێکی نیشتمانی دا گەڵاڵەکرا. لەسەرەتادا، پلانێکی پێویست دەسبەجێ جێبەجێ کراو سەرئەنجام پلانی دیکە کەبڕیاربوو لە کاتی پێویستدا جێبەجێ بکرێت ئامادەکرا.

### پلانی پێویست بەمجۆرە جێبەجێ کرا:

بۆهاندانی دەوڵەمەندان هەل‌و مەرجێکی تایبەتی وەك گەشەپێدانی سندوقەکانی پاشەکەوت‌و سپاردە جێگیرەکان دروست کرا، هەر پلانێکی بیناسازی کە

پەسەنددەكرا بیناسازان متمانەیەكی بانكی یان بەدەست دەهێنا كەبتوانن قەرز وەربگرن. سەرچاوە ئابوورییەكان بە هۆی دامەزراندنی بانكێكی .خانووبەرەو سندوقی بانكەكانی ئێران بۆ وەگەڕخستنی سەرمایەو چاپو بڵاوكردنەوەی سفتەبایەخدارەكانەوە دابین كرا. بۆ كڕیارانیش قەرزی درێژماوەی خانووبەرە بە هەلومەرجی ئاسانەوە لەبەرچاوگیرا.

سەرئەنجام، لەرێگای هەرەوەزییەكانی خانووبەرە و كۆمپانیاكانی بیناسازییەوە قەرز بەوكەسانە دەدرا كەدەیان ویست خانووبەرە دروست بكەن.

بەپێی ئامارەرەسمییەكان، تاكۆتایی ساڵی ١٩٧٧ وەزارەتی ئاوەدانی ومەسكەن بە تەنیا ٣١٠٠٠ یەكەی نیشتەجێ بوونی كە پێكهاتبوو لەماڵی فەرمانبەرانو كرێكاران، بە تێچووی ١٤/٤ ملیارریاڵەوە دروست كردبوو. بینای ٤٠٠٠٠ یەكەی نیشتەجێ بوونی دیكە بە تێچووی ٦٧/٤ملیارریاڵەوە دەستی پێكردبوو. جیالەمانەش، ٢٠٥٦ پرۆژەی نوێسازی لەناوچەی شارو ٦٨٩٢ پرۆژە لەناوچەگوندییەكاندا جێبەجێ كرابوو.

پلان وا دانرابوو كەلەلایەن دەوڵەتەوە زەوی بدرێت بەوكارگەو كۆمپانیایانەی (كە خاوەندارێتی یان گشتی بوو) بۆ ئەوەی بیناسازی تێدابكەن تا فەرمانبەرانو كرێكارانیان بتوانن لەنزیكترین شوێنی كارەكەیانەوە نیشتەجێ ببن. كاتو وەختێك كەبەمجۆرە دەمایەوە دەرفەتی بەكرێكاران دەدا بۆئەوەی رۆژانە چەندكات ژمێرێك لەكاتی زیادەیان لەمەلەوانگەو شوێنەوەرزشییەكاندا ببەنەسەر.

٢١١٥ پرۆژە بۆ بەرژەوەندی لاوان جێبەجێكرا. لەوانە دروستكردنی قوتابخانەو زانكۆو نەخۆشخانەو دەرمانگەو ناوەندەكانی وەرزشیو ڕابواردنو هۆتێلو خێوەتگەكانی هاوینەو نموونەی لەم جۆرەبوو. هەروەها ٨٧٩ پرۆژەی دیكەش لەتەواوبوون دابوو.

لەهەمان كاتدا كەسوپای برەوپێدانو ئاوەدانی، لە ١٢ی جەنیوەری ١٩٦٤، سەرقاڵی دروستكردنو مودێرنیزەكردنی لادێكان بوو، گوندی ناوەندی ناوچەكان

دروست دەکران و کارەبا و تەندروستی یان بۆ دابین دەکراو لەگەڵ ڕێگاسەرەکییەکانی وڵاتدا پێکەوە دەبەسترانەوە.

لە ساڵەکانی ١٩٧٦و ١٩٧٧دا دوازدەملیۆن مەتری چوارگۆشەزەوی درابەو هەرەوەزییانەی کەشوێنی نیشتەجێ بوونیان دروست دەکرد. سەرئەنجام لەماوەی دەساڵدا ٥٤٠٠٠٠ قەرزی درێژخایەن بەبڕی ١٠٣ملیارریاڵ لەڕێگای لقەکانی بانکی خانووبەرەوە درا بۆ دروستکردن و تەواوکردنی خانوو باڵەخانە. بەڵام، دروستکردنی یەکەکانی نیشتەجێ بوون بۆ کرێکاران یەکێك لە لاوازترین خاڵی کارەکانی ئێمەبوو: سەرەڕای هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکمان نەمانتوانی بۆتەواوکردنی پرۆژەی خانووکانمان خشت و چیمەنتۆی پێویست بەرهەم بهێنین

## تەندروستی کرێکاران:

تەنیا دروستکردنی خانوو بۆکرێکاران بەس نەبوو ئەوان پێویستیان بەچاودێری و بیمەی کۆمەڵایەتیش هەبوو. لەم دووبوارە سەرەکییەدا پەنجاساڵی تەواو لەپاش وڵاتانی رۆژئاواییەوە بووین.

خاڵی شازدەیەمی شۆڕش کەلەڕاستیدا پەیوەندی بەژنانی دووگیان و منداڵانەوە (نزیکەی چوارملیۆن کەس لەساڵدا) هەبوو، مژدەی دەسپێکردنی قۆناغێکی نوێی لەباش بوونی بارودۆخی تەندروستی و بیوەیی لاوان دەدا. ئەم خاڵەهاوکات بوو لەگەڵ هاتنەدی چارەسەرکردنی نیشتمانی و دەسپێکردنی هەڵمەتی ریشەکێش کردن و پێشگیری لەنەخۆشییەگشتگیرەکان لەڕێگای کوتان و چاککردنی بارودۆخی ژینگەو راهێنانی تەندروستییەوە. لە داهاتوودا هەمووئێرانییێك دەبوو هەڵگری ناسنامەیەکی تەندروستی بێت کەلەودا بارودۆخی تەندروستی و ئەونەخۆشییانەی کە تووشی هاتووەو ئەوکوتانانەی کەبۆی کراوە تێداتۆماردەکرا.

هەمیشە لەسەر ئەوباوڕە بووم کەپاراستنی تەندروستی گشتی دەبێت ئامانجی سەرەکی هەموو دەوڵەتێك بێت. گەرچی ئەمڕۆ ئامـاژەدان بەو دامەزراوانەی کەبۆبەجێ هێنانی ئەم ئامانجە پێکمان هێنا ڕەنگە لەڕوانگەی هەندێکەوە شتێکی بێ مانا بێت، بەلاّم دیسان حەزدەکەم کورتەیەك لەوبارەوەباسبکەم.

کۆنترینی ئەم دامەزراوانە بریتی بوو لە: ڕێکخراوی شێروخۆرشیدی سووری ئێران (کە دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی باوکم)، ڕێکخراوی پاشایەتی بۆ خزمەتگوزاری کۆمەلاّیەتی، ڕێکخراوی پشتیوانی کردن لەدایکان ومندالاّن و ، بونیادی پەهلەوی. ئەم ڕێکخراوانە جیالەوەی کەچاودێریی لاوانی کەمئەندام و خاوەن پێداویستی یان دەکرد، ئەوانیشیان بۆپەرستاری و بەهاناوەچوونی کۆمەلاّیەتی و کارکردن بەئامێرو کەرەستەکان رادەهێنا و چاودێری و پرۆژەیاسا و راستکردنەوەیان بۆباشترکردنی هەل و مەرجی ئەوان پێشکەش دەکرد.

ئەو ڕێکخرارانەی دیکە کەبۆدابین کردنی تەندروستی چالاکییان دەکرد بریتی بوون لە: ڕێکخراوی خێرخوازی فەرەحی پەهلەوی، ڕێکخراوە خێرخوازییەکانی مەلەکەی دایك و شەمسی پەهلەوی و ئەشرەف پەهلەوی، ڕێکخراوی سەرانسەری نابینا و گوێ گرانەکان و ڕێکخراوی خۆش بژێوی خێزان.

ئێمە چوار ڕێکخراوی سەرانسەری مان هەبوو، یەکێك بۆپشتیوانی کردن لە مندالاّن، یەکێك بۆهەتیوان، سێیەم بۆکەڕەولاڵەکان و چوارەم بۆئیفلیجەکان و ڕێکخراوی دیکەش بۆیارمەتیدان بە گولان و تووش بووانی دەردەباریکە و بەربەرەکانێ لەگەڵ شێرپەنجە و گەیاندنی خوێن هەبوو کەهەمووی ئەوانە لەگەڵ وەزارەتەپەیوەندی دارەکانیاندا هاوکارییان دەکرد.

**چالاکییەکۆمەلاّیەتیەکانی شابانوو، بیمەی کۆمەلاّیەتی ئێمە:**

شابانوو لەزۆردامەزراوەی لەمجۆرەدا کاری دەکردو لەوئۆگرییە پاك و بێ غەل و غەشەیدا کەنیشانیدەدا هیچ بەربەستێکی نەدەناسی. نموونەیەکی لێ باسدەکەم.

هەرچەندە تیمارکردنی گولی ئیمرۆژە کارێکی زۆرئاسانە، بەلام سەر لەنوێ بە تواناکردنەوەی گولێکی دەرمانکراوو جێ خستنەوەی لەکۆمەڵگایەکی تەندروستدا هێشتا ئیشێکی دژوارە.

پابەندی بەشتەکۆنەکانو دەمارگیری دێرلەناو دەچێت. نەخۆشەکانی ئێمەش لەمە بەدەرنەبوون، چونکە پاش تیمارکردن لە نەخۆشخانە تایبەتیەکانی ئێمەدا لەلایەن کۆمەڵگاوە دوور دەخرانەوە. شابانوو رێگەچارەیەکی تایبەتی خستەروو: گوندێکی نموونەیی تەواویان بۆ دروستکرا. بەجۆرێکە هەمووگوندنشینانی دەوروبەری ئەم گوندە ئاواتەخوازی بوونو زۆری پێنەچوو کۆمەڵ کۆمەڵ سەردانی ئەوێ یان کرد. کاتێکە شابانوو سەردانی گوندی گولانی کرد شتێکی نەمابوو لەئامێزی گوڵەکاندا بخنکێت.

شابانو بۆ باش کردنو مۆدێرنیزەکردنی بارودۆخی ژنان لەگەڵ گیروگرفتی زۆر بەرەو ڕوو بووە وە کەلە دابو نەریتی بنج داکوتاوەوە سەرچاوەی دەگرت. ئەوهەمیشە رێگەچارەیەکی ئاشتی خوازانەی پەیدادەکرد. بۆنموونە، لە بەلووچستاندا کە رێگەیان بەکچان نەدەدا لەگەڵ پیاوان قسەبکەن، تەنیا ژنانی خۆبەخش لەسێ سوپاکە بۆ یارمەتی دانی ژنان ڕەوانەدەکرانو سەربازەکان تەنیا بۆخزمەت کردن بەپیاوان دەنێردران.

بەڵام سەرەڕای دژایەتی هێزە کۆنەپارێزەکان،ئەوان بەرەبەرە بەسەر زۆرێك لە دەمارگیریەکاندا سەرکەوتن. لەهەندێ لەناوچەکاندا نەتەنیا خولەکان بە تێکەڵاوی کرانەوە، بەڵکو ژنان لەلایەن پیاوانەوە تیماردەکرانو خوێندکارانی پزیشکیو بەهاناوەچوونی کۆمەڵایەتیو پەرستاران کەچاودێریی پیاوانیشیان دەکرد بەسەر ماتۆڕەوە هاتو چۆیان دەکرد. گۆڕانێکی گەورە بوو.

شابانوو بزوێنەری رێکخراوی پشتیوانی کردن لەمندالانی سەربەرێکخراوی جیهانی بوو و لەگەڵ بەرپرسانی دەزگای دادوەری دا یاسای تایبەت بەمندالانی ئامادە دەکرد. ناوبراو بایەخێکی تایبەتی بەنەخۆشخانەکانو زانکۆکانو چاودێری کردنی مندالانو کونترۆڵی خێزان دەدا.

هەموو ئەوڕێکخراوانەی کەشابانوو سەرپەرشتیاریان بوو هەوڵیان دەدا بەئاسانکاری کردن بۆ دەزگای کارگێڕی بارگرانییان کەم بکەنەوە. لەراستیدا سەرکەوتنی بەرچاویشیان ئەوەندە سەرسووڕهێنەر نەبوو چونکە ئەوکەسانەی کەخۆبەخشانە کاردەکەن هەمیشە زیاتر دڵ بەکاردەدەن و شەوق و زەوقی زیاتر نیشان دەدەن. چەند وشەیەکیش دەربارەی نەخۆشخانەی دڵ بڵێم کە دایکم دروستی کرد: ئەم نەخۆشخانەیە وەك یەکێك لەباشترین ناوەندەکانی نەخۆشییەکانی دڵ لەدونیادا ناسراوە.

خاڵی هەڤدەیەمی شۆڕشی ئێمە پەیوەندی هەبوو بەبیمەی کۆمەڵایەتی و مانگانەی خانەنشینی بۆ هەموو ئێرانییەکان.

یەکەمین ئامانجی بیمەکۆمەڵایەتی ئێمە بریتی بوو لەبیمەکردنەوەی هەمووکرێکاران لەبەرامبەر هەرچەشنەرووداو ونەخۆشی و لەکارکەوتوویێکدا، هەروەها بیمەکردنەوەی هەمووئێرانییەکان لەهەمووقۆناغەکانی ژیاندا. هەندێ لەئیشەکان تایبەت دەبوو بەهاوسەرانی گەنج و بەساڵاچووان و بنەماڵەکان. بە بەرەکەتی ئەم دامەزراوەیە من تەنانەت پشتیوانی کردنم لەهەندێ لەکچان و کوڕانی گەنج لەبەرچاوگرتبوو کەخاوەنی بەهرەو توانایی گەلێکی هیوابەخش بوون .

دەتوانم بڵێم کەیاساپەسەندکراوەکانی تایبەت بەبیمەی کۆمەڵایەتی ئێمە لەناو یاساکانی وەك خۆیدا لەدونیا زۆرپێشکەوتوو بوو. بۆنموونە لەو وڵاتانەیدا کەلە رووی کۆمەڵایەتیەوە پێشکەوتووترن، واباوە کەمانگانەی خانەنشینی نزیکەی لە سەدا ٥٠ تا ٦٠ی دوایین مووچەی خانەنشینکراو بێت. ئەم مانگانەیە لەیاساکانی ئێمەدا دەیتوانی لە ١٠٠٪ یش تێپەڕبکات. دەمزانی کەپشتیوانی کردن لەتوانای کڕینی خانەنشینان پێویستە: هەربۆیە نزمترین ئاستی مانگانەی خانەنشینی یەکسان بوو بە نزمترین هەقدەست و بەپێی خەرجییەکانی ژیانیش دەسکاری دەکرا.

## بەشداربوونی کرێکاران لەقازانجی کارگەکاندا:

چوارەمین بنەمای شۆڕش لەساڵی ١٩٦٣دا جێبەجێ کراو بووبە یەکێك لە پێشکەوتووترین یاساکانی جیهان : کرێکاران لەقازانجی کارگەکان بەشیان بەرکەوت. خاوەنکارەکان ناچاربوون لەگەڵ نوێنەرانی کرێکاران یان یەکیەتیەکانیاندا پەیمانی بەکۆمەڵ بۆ کارکردن ببەستن و ئەم پەیمانانەش دەرفەتی بەکرێکاران دەدا کە لە قازانجێکی پەیوەندی دار بە بەرهەمهێنان و دەسپێوەگرتندا بەشداربن. هەروەها کرێکاران مافی ئەوەیان هەبوو کەخوازیاری بەش لەوقازانجەی بن کە خەرجییەکانی لێدەر دەکرا.

تەنیا لە ساڵی ١٩٧٦دا، ٥٣٠٠٠٠ کرێکار لەکەرتی تایبەتی و دەوڵەتی دا ١٢ملیارریاڵ قازانجیان بەرکەوت کەبەرامبەر بوو لەگەڵ مووچەی یەك دوومانگیان . لەماوەی چواردەساڵدا سەرجەمی ئەو قازانجە پۆختەی کەلەم ڕێگەیەوە درابە کرێکاران ١٢٨ هێندە بوو.

بانکی خۆش بژێوی کرێکاران کەبەتایبەت بۆ قەرزدان بەکرێکارانی مووچەخۆر دامەزرابوو، یارمەتی دامەزراندنی چەند سەد سندۆقی هەرەوەزی کرێکاری دا. بەهۆی ئەم بانکەو هەرەوەزییەکانەوە بەملیارریاڵ یارمەتی ئەوکرێکارانەی درا کە دەیانویست خانوو بکڕن یان نۆژەنی بکەنەوە یان قەرزاربوون. ئەم بانکە بە سوودی ساڵانەی لە ٤٪ قەرزی دەدا.

بەمجۆرە یەکە گەورەکانی بەرهەمهێنان بەلە بەرچاوگرتنی هاوکاری نێوان کارو سەرمایە چالاکییەکانیان دەسپێکرد و هاوپەیوەندی نێوان خاوەن کارو تەکنیککارو کرێکاران بەهێز بوو. ڕێنمایمان کردن کە لەهەر کارگەیەکدا کۆبوونەوەی بەردەوام بکرێت و نوێنەرانی هەر سێی ئەم کۆمەلانە تێدا بەشداربن بۆ ئەوەی کێشە هاوبەشەکانی خۆیان بەباش لێك گەیشتنی نێوان ئەو ژن و پیاوانەی کە نیازپاکییان هەیە چارەسەربکرێن.

دانانی یاسای تایبەت بەکاروباری کرێکاران لەژێر رووناکی ئەم سێ بنەمایەدابوو

١- هەموو کرێکارێکی ئێرانی مافی کارکردن و کەلك وەرگرتن لەبیمەی کۆمەلأیەتی هەیە. ئەگەر بە هەرهۆیەك ئیشەکەی خۆی لەدەست بدات، ئەوا تا ئەوکاتەی کەیەکێك لەسەدان ناوەندی دۆزینەوەی کار ئیشێکی بۆ پەیدادەکات پێویستە مانگانەی ماوەی بێکاری پێبدرێت کە یەکسانە بەلانی کەمی ئەو هەقدەستەی کەبۆی براوەتەوە.

٢- لانیکەمی هەقدەستی زەمانەت کراوی کرێکارێکی ئاسایی هەموو سالێك بەسەرنجدان بە هێلکاریی خەرجییەکانی ژیان و بەپێی بەشە جۆراوجۆرەکانی پیشەسازی و بارودۆخی جۆگرافی شوێنی کارەکەوە دەسنیشان دەکرێت. پێویستە هەموودەزگاکان بەپێی پێوەرێکی دیاری کراو پیشەکان پۆلێن بکەن.

٣- ئەنجام و سوودی کار لەدیاری کردنی بڕی هەقدەستدا لەبەرچاودەگیرێت. گرنگی دان بەجێبەجێ کردنی وردی ئەم بنەمایە دەبوو بەرەبەرە داهاتی کار زیادبکات.

بەلأم دەست راگەیشتن بەراهێنانی پیشەیی، بەڕای ئێمە نەتەنیا مافی کرێکاری ئێرانی بوو، بەلکو لە ولأتی ئێمەدا (کە وەك زۆربەی ئەو ولأتانەی کە هەنگاوی بە پەلەیەیان بەرەو پیشەسازی دەهاویشت، تووشی کەم و کورتییێکی زۆر لەپسپۆران و تەکنیککاران و بەڕێوەبەرانی بواری جێبەجێ کردن هاتبوو)، لەو پێداویستیانە بوو کە دەبوو بێ چەندوچون دابین بکرێت. لە ١٩٦٣وە هەموو بیرمان لای ئەوەبوو کەلەهەموو پارێزگاکاندا دامەزراوەی راهێنانی پیشەیی دروست بکەین. ئامانج لەکردنەوەی ئەم دامەزراوانە تەنیا راهێنانی ئەو لاوانەی نەبوو کە دەیان ویست پیشەیەك فێربن، بەلکو دەبوو توانایی و کارامەیی کرێکارانی نیوەشارەزاش زیاتربکەن.

ناوەندگـەلێك بـۆفێركردنو راهێنـانی سـەرلەنوێ كرایـەوە، كـە بوونیـان بەقـەی قوتابخانەپیشەییەكانو كۆلێـژەكانی تـەكنیكی پێویسـت بـوو. هەرواكە لەیاسای كاردا بەروونی باسكرابوو،لەراستیدا هـەمووكرێكارێك مـافی هـەبوو لـەو راهێنـانو فێر كردنانەسوود وەربگرێت تاپلەكەی بۆئاستی ئەندازیارێك بەرزبێتەوە.

سـەرئەنجام، یەكیەتیـەكانی كرێكـاریو كۆمەڵـەی خاوەنكـاران لەگـەڵ رێكخـراوە دەوڵەتیەكاندا كەوتنە هاوكاری كردن. هەڵبەت ئەمە بەقازانجی خۆیـان بـوو چونكە ئامانج، پشتیوانی كردن لەبەرژەوەندی كریكاران بوو.

## بەشداری كرێكاران لە خاوەنداریێتی یەكەكانی پیشەسازی دا:

بـەڵام، ئـەو هەوڵانـەی كـە بۆجێبـەجێ كردنـی ئـەم یاسـاو رێسایە دەدرا هێشتا سەرەتای كاربوو. ئەو تێگەیشتنەی كە ئێمـە لەیەكسانی دیموكراتیك هـەمان بـوو، دەبـوو لەیەكسانی ئابووریـدا خـۆی بنوێنێـت. سـەرئەنجام، دەبـوو كرێكـاران لـە خاوەنـداریێتی كارگـەكانی شـوێنی كاریانـدا بەشـدارین لەبەرئـەوە هەڵسوورانی ئـەم كارگەیانە پشتی بەباسكی ئەوان دەبەست.

لەمانگی ئاگۆستی ١٩٧٥دا خاڵی ١٣ بوو بەیاسا. ئەم خاڵە بریتی بوو لەپـەرەدان بەخاوەنداریێتی یەكەكانی پیشەسازیو هاوبەشـی كردنـی كرێكـاران لـەودا. هـەموو یەكـە گـەورەكانی بازرگـانی كـەزیاتر لـەپێنج سـاڵ رابـردووی كاركردنیـان هـەبوو ناچـاركران لـە٤٩٪ی پـشكەكانی خۆیـان بفرۆشـن بـە كرێكـارانو فەرمانبـەرانی خۆیـان. كارگـە دەوڵەتیـەكانیش كەلـەم دوایانـەدا دامـەزرابوون دەبـوو لـە ٩٩٪ پشكەكانیان لەنێوان كاركەرانی خۆیان و دامەزراوەكانی دیكەو گوندنشینانو هتد دابەش بكەن (لەسەدایەكی ماوەی بۆ بەرێوەبەرایەتی لەبەرچاوگیرا بوو).

ئەم بنەمایـە، ئـابووری دیموكراتیكی تـەواودەكردو بڕیاربوو خـاڵێكی وەرچەرخان لـە گۆڕانكاریـەكانی پیشەسازیو ئـابووریو كۆمەڵایـەتی ئێران دا دروست بكـات. بەشـداریكردنی هــەموو دانیــشتوانو پــێش لەهــەموانیش چــینی كرێكـار، لــە

سەرمایەی دامەزراوە گەورەکاندا، وەك چیمەنتۆیەك لەبەرچاوگیرابوو کە خاوەن کارو تەکنیك کارو کرێکاری پێکەوە یەك پارچەدەکردو دەبووە هۆی ئەوەی کە مرۆڤێن زەحمەتکێش لەمە بەدوابن بە شەریکی خاوەن کارەکانیان. وەلەهەمان کاتدا، رێگە لە زۆرداریو جەوری سەرمایەداری دەرەبەگایەتی بگرێت وەك ئەوەی کەلەسەرەتای ئەم سەدەیەداو لەدونیای رۆژئاوا بەشێوەی " مافی پیرۆزی خاوەن کارەکان" سەری هەڵدا.

هەربۆیە لەسەرەتای کارەکەدا دژایەتییەکی زۆر بینرا. بەڵام ساڵێك دواتر، زۆربەی ئەو خاوەن کارانەی کە وەبەرجێبەجیْ کردنی ئەم یاسایە کەوتبوون تێگەیشتن کە: "کۆمپانیا هیچکات لەمەزیاتر قازانجی نەکردبوو!" کەواتە ناچاربوون دان بەوەی دا بنێن کە ئەم چاکسازیە بەزیانی ئەوان نەبووە.

رەنگە بتوانم ئامارەبکەم کە ئەم چاکسازیانە، داری لەدەست ئاژاوەچیانی کارکوشتەی مارکسیستو کۆنە پرۆپاگەندەچیەکانی حیزبی توودەو دەوڵەمەندانی زاڵم داخست. ئێمە نموونەیەك لە هاریکاریو هاوپەیوەندیو یەکیەتی نێوان کرێکارانو تەکنیك کارانو خاوەن کارەکانمان خستبووە بەرچاو. بەڵام وادیارە کەچارەنووسی وەها گەڵاڵەیەك شتێکی جیالەشکست نەبوو. ئایا کەسێك هەیەبەمن بڵێت بۆچی؟

لە سپتەمبەری ١٩٧٨دا خۆپیشاندانی توندوتیژانە هاوکات لەشارەکانی تارانو مەشهەدو تەورێزو شیرازو ئیسفەهان دا دەستی پێکردو زۆری پێنەچوو شێوەی ئاژاوەو تالانو بڕۆی بەخۆوەگرت. ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ سەرهەڵدانێکی چەکدارانە کە بووە هۆی دووبەرەکی نانەوەو خوێن رشتنو ئێرانی تووشی بارودۆخێك کرد کە رۆژنامەکانی دونیا ناوی "ئاژاوەی بێ چارەسەر" یان لێنا.

تاپێش لەوە، ١٥٣ کۆمپانیای پیشەسازی کەتایبەت بووبە چەند پشکدارێك، پشکەکانی خۆیان فرۆشتبوو بە ١٦٣٠٠٠کەس لە کرێکارانو گوندنشینان. کارمان دەکرد بۆ ئەوەی ٣٢٠ کاربرایەتی گەورەپشکەکانی خۆیان کەبەزیاترلە ١٧٠ملیارریالْ دەخەملێنرا بفرۆشن.

لە هەموو حاڵەتێکدا، کڕینی ئەم بەشانە بەهۆی قەرزی دەوڵەتیەوە ئاسانکاری بۆدەکرا. ئێمە قەرزی پێویستمان لەبەردەست ئەنجومەنی چاودێری بەسەر پەرەپێدان بە خاوەندارێتی یەکەکانی پیشەسازیدا دانابوو.

لەکۆتاییدا خراپ نییە لێرەدا ئاماژە بەهەندێ ژمارەبدەم:

پازدەساڵ پێش تێکڕای هەقدەستی مانگانە ژێر ٢٠٠٠ریاڵ بوو، نەزیاتر. لەساڵی ١٩٧٨دا تێکڕای داهاتی کرێکارێکی ئاسایی لە ١٠٠٠٠ریاڵ تێپەری کەدەبوو لە ٢٠٪ی قازانجی کارگەش لێ زیادبکرێت و لەبەر ئەوەی کەیاسای ئاگۆستی ١٩٧٥یش جێبەجێ کرابوو سوودی پشکەکانیش دەکەوتەسەری.

جیا لەمەش، کرێکار بەنرخێکی هەرزان ببوو بەخاوەنی خانووو خواردنیشی هەرزان دەسدەکەوت، لەبەر ئەوە دەوڵەت لەسەرانسەری وڵاتداو بۆهەمووان پاڵپشتی پێنج جۆر خۆراکی سەرەکی (نان و برنج و گۆشت و شەکرو ڕۆن) دەکرد. هەروەها فرۆشگاگەلێکیش هەبوو کە شتومەکەکانیان بەنرخێکی جێگیر دەفرۆشت. بەوجۆرەی کەبە منیان وتوە، زۆرێک لەم فرۆشگایانە لەئاژاوەو بشێویەکاندا سووتێنران. وە سەرئەنجام منداڵان لە خوێندنی بێ بەرامبەر سوودمەندبوون. لە ١٩٧٣دا، کاتێکە سەردانی کارگەیەکی شەکری نزیکی قووچانم دەکرد، ٨٠٪ کرێکاران ئوتۆمبیل و ٥٠٪یان خزمەت کاریان هەبوو.

نیشانەکانی پێشەکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی چینی کرێکارو جووتیار لە ئێراندا بەمجۆرە بوو.

# فەسڵی ١٢

## دادگا

کاری دادوەری لەئێراندا هەمیشە لەسەر شێوازێك نەبووە، لەبەرئەوەی تاماوەیەکی دوورودرێــژ داوەری کــردن دەربــارەی تاکــەکان پەیوەنــدی بــە دەســەڵاتو لاوازی ئەوانەوە هەبوو. خوشحاڵی خەڵك هەمیشە منی دەورووژاندو لەو نێوەدا ئەوشتەی کەمنی لەهەمووشتێك زیاتر شادمان دەکرد، رەزامەندیو شادمانی ئەو خەڵکە هــەزارەی بــوو کەســەرئەنجام لەســایەی خانــەکانی دادی ئێمــەدا (خــاڵی ٩ی راگەیاندن) بێ بەرامبەر دادپەروەری لە مافەکانیان دا جێبەجێ کرا.
هەروا کەدەزانین، بەخۆشییەوە باوکم لەئێراندا سیستەمی دادی بەئیلهام لە کۆمەڵە یاســاکانی نــاپلێۆن دامەزرانــدو بــەهۆی ئــەم گۆرانکاریــە شــێلگیرانەیەوە بــوو کەداوەری کردن لەئێراندا لەباری "مەزهەبی" چووە دەرەوە. تائەوکاتە کاروباری داوەری لەژێردەسەڵاتی لایەنی مەزهەبی دا بوو.
بەڵام بوونی سیستەمی دادی جیالەمەزهەب بۆئەوەی کە هەموو هاووڵاتیان بتوانن مافەکانی خۆیان بەدڵنیاییەوە وەربگرنەوە بەس نەبوو. لەهەموو شوێنێکی دونیا بارودۆخەکە بەم شێوە بووە، بەڵام لێرەدا ئەوەندە نایەکسانی لە رووی جێبەجێ کردنــی دادپەروەرییــەوە بەرچــاو بــوو، کەنــەدەکرا چاوپۆشــی لێبکــەیت. ئــەم

نایەکسانیە بەجۆرێ بوو کەگوندنشینی لەئاغاو بەگشتی لەشارنشینان جیادەکردەوە. گوندنشینان و جووتیاران، بەزۆری نەخوێندەوارو هەژارو بێ ئاگابوون. لەبەر ئەوەش لەناوچەیەکی دووره دەستدا دەژیان، هەرگیز هیوایەکیان بە دادپەروەرییەك نەبوو کەماڵ و منالیانی ویران نەکردبێت. ئەمە نموونەیەك لە " رۆژرەشی هەژاران بوو.

**داوەری لەنیشتگەدا:**

کێشە ئاساییەکانی گوندنشینان، لە چوارچێوەی ئەو پارچەزەوییەی کە هەیانبوو یان ناکۆکی لە گەل جووتیارانی دیکەدا لەسەرئاو ومەزراو مەڕوماڵات و کەرەستەکانی ئیشکردن کورت دەبووە وە. پارەیەك کەلەم ناخۆشییەدا جێی ناکۆکی بوو لەنرخی مەڕێك یان گایەك یان چەندهێکتارێکی زەوی جووتیارێك زیاتر نەدەبوو.

بۆچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، دەبوو سکالا ببەنە دادگای شار، کەئەم کارەش پێویستی بەوە بوو کەلەشاردا پارێزەربگرن و زۆرجار بۆ رۆشتنیان بۆدادگا ،کەبەزۆریش دووربوو و، ئامادەبوونیان لەقۆناغە سەرەتاییەکانی پێراگەیشتن و لێکۆڵینەوە لەداواکانیان دەبوو سەردانی شاربکەن. بۆ تێهەڵچوونەوە لەسکالا دەبوو سەردانی پارێزگا بکەن و بۆداوای یەك لای کردنەوەش لەدیوانی بالای ولات دەبوو سەفەری تاران بکەن.

کەواتە، گوندنشینان چ شەڕاشۆ بواێن و چ نەبواێن، زۆر بەکەمی حەزیان دەکرد بۆچارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان پەنا ببەنە بەریاسا. لەبری ئەوە روویان لە ساختەچیەتی و توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە دەنا، هەربۆیە ئەم کارەش پەرەی بەناکۆکییەکان دەداو سەرئەنجام دەکێشرایە بنکەی جەندرمە. هەروەها باری دۆسییەکانیش قورسایی دەخستە سەردادگاو پێراگەیشتن بەزۆربەشیان نە

بایەخی ئەوکاتەی هەبوو کە بۆی تەرخان دەکراو نەبایەخی ئەوخەرجییەی هەبوو کەلەسەردەستی خەڵکی دادەنا.
بەڕای من ڕێگەچارەی ژیرانە ئەوەبوو: لەجیاتی ئەوەی گوندنشین بڕوات بەدوای یاسادا یاسالای ئەو بێت، لەگوندەکەی خۆی.
جیا لەمەش، دەبێت دان بەوەی دا بنرێت کەهیچ کەس چاکتر لەخودی گوندنشینان توانای تێگەیشتن و چارەسەرکردنی گرفتەکانی ئەوانی نییە. پارێزەرێکی دیارو بەرچاوی شارنشین بۆتێگەیشتن لەوشتەی کەریش سپییکی شوێنەکە بەتەواوەتی لێ تێدەگات و بەئەقڵ چارەسەری دەکات لەگەڵ گرفت بەرەورووە چونکە ریش سپی رابردووی کارەکە دەزانێت و لەهۆکارەسەرەکییەکانی ناکۆکی ئاگادارەو بەزمانی لایەنە ناکۆکەکانیش قسەدەکات.
گوندنشینان ئەگەر کاری پێڕاگەیشتن بەناکۆکییەیاساییەکانی شوێنەکەیان دەدرایە دەست کەسانی جێی متمانەیان خۆشحاڵ دەبوون. بەمجۆرە پێش بە لەکیس چوونی کات و پارەو وزەیان دەگیراو لەقورسایی باری دەزگای دادپەروەری و خەرجییەکانی دەوڵەتیش کەم دەبووەوە.

## سەرکەوتنی ژیریی خەڵك : خانەکانی داد

کارەکە بەمجۆرە دەستی پێکرد. یەکەمین " خانەی داد" لەدیسامبری ١٩٦٣لەگوندی مێهیار لەنزیکی ئیسفەهان کرایەوە. سەدان خانەی دیکە لەدوای ئەو دامەزران. تاکۆتایی کارەکە ١٠٣٥٨خانەی داد بۆچارەسەرکردنی کێشەوناکۆکییەکان لە ١٩٠٠٠ گوند لەسەرانسەری وڵاتدا کرایەوەو زیاتر لە دەملیۆن کەسی لەبەرچاوگرت.
خانەی داد، دادگای گوندبوو. هەرخانەیەك پێنج دادوەری هەبوو کەبۆماوەی پێنج ساڵ و لەلایەن دانیشتوانەوە لەنێو متمانەپێکراوانی شوێنەکەدا هەڵدەبژێران.(دەوڵەت دەستکاری هەڵبژاردنی ئەوانی نەدەکرد).

لەبەرئەوەی ئەم دادوەرانە خۆبەخش بوون کاری داوەری کردنیان بێ بەرامبەر ئەنجام دەداو گیرۆدەی داوی ڕێوڕەسمی ئاڵوزو بیسوود نەبوون. ئەوان سەرپشك بوون لایەنە ناکۆکەکان بانگهێشت بکەن یان بۆخۆیان بڕۆن بۆلای ئەوان، مافی ئەوەیان هەبوو کەگوێ لەشایەتەکان بگرن‌و لێکۆڵینەوە لەراستییەکان بکەن‌و دەیانتوانی لەڕای خاوەن ڕایان‌و شارەزایان کەڵك وەرگرن.

سەرکەوتنی خانەکانی داد، بێدرەنگ‌و بەرچاوبوو. لە ١٩٦٥دا بە ١٨٠٠٠٠سکاڵا راگەیشتن کەبە لێخۆش بوونی لایەنەکان کۆتایی هات. ئامارەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٧نیشانی دەدا کەخانەکانی داد سێ ملیۆن ناکۆکییان چارەسەرکردبوو، کەئەگەر لەرێڕەوی ئاساییەوە پێڕاگەیشتنی بۆبکرایێت ئەوا ساڵانێکی زۆری دەخایاندو زیانێکی ئابووری زۆری بە دەوڵەت‌و لایەنی ناکۆك دەگەیاند.

دەربارەی ئەم سەرکەوتنە دەبێت لە رووی چەندوچۆنیەوە داوەری بکرێت. بە قسەی هەندێ لە مافناسان، ئەو بڕیارانەی کە لەخانەکانی داد دا، بەهۆی داوەرانی خەڵکییەوە دەردەچوو هەمیشە ژیرانەو راستی‌و دروستیان نموونەو لەسەربنەمای ئەقڵ‌و ژیری بوو. بەرجەستەترین پارێزەران لەم داوەری کردنانە کەبەهۆی گوندنشینانی ئاساییەوە ئەنجام درابوو سەریان سووڕمادەما. لەکاتێکدا کەمن زۆر کەمتر تووشی سەرسووڕمان هاتم.

لێرەوە بوو کەبڕیاردرا (جوولای ١٩٦٦) ئەم سیستەمەش لەشارەکاندا پەرەپێبدەین، لەبەرئەوە لە شارەکانیشدا کێشەبچووکەکان کەم نەبوون. هەشتا "شورای داوەری" دامەزرا کەدیسان هەرکام پێنج داوەری هەبوو کە لەناودانیشتوانی هەربەشێك لەشاردا وبۆماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێران.

وەزارەتی داد لە نێو دادوەرانی رابردووو داهاتووداو لەنێو پارێزەرانی پلەی یەك‌و دوودا، راوێژکارانێکی بۆئەم شورایانە دەسنیشان دەکرد هەتا لەکاتی پێویست داو لەبواری مافەکاندا راوێژی لەگەڵدا بکەن. بەلام بڕیاری کۆتایی لای هەمان داوەرانی هەڵبژێراو بوو. ئەم دادوەرانە خۆبەخش بوون‌و لەبری ئەم خزمەتە

پارەیان وەرنەدەگرت. ئەم شورایانە لەقوتابخانەکانو شارەوانییەکان یان لەماڵانی خۆیاندا ئیشەکانیان بەڕێ دەکرد.

## دادپەروەری لەخێزاندا:

تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٧، ٢٨٣ شورای داوەری لە٢٠٣شاردا دامەزرابوو کەبەگشتی ١٢ملیۆن کەسی لەبەرچاودەگرت. ئەم شورایانە ٧٥٠٠٠٠ دۆسییەیان بەرازی بوونی دوولایەنی ناکۆکو پارێزەرەکانیان بەئەنجام گەیاندبووو لەبەر ئەم سەرکەوتنە، لە ١٩٧٧دا بڕیاردرا سنووری دەسەڵاتی ئەم دادگاو شورایانە فراوانتر بکرێت. ئەم دامەزراوانەی شۆڕش میراتگری دەسەڵاتی دادوەری دادگاکانی بەرایی رابردوو بوون کە ئیتر نەمابوونو بێزاریو ناڕەزایەتی چارەسەر نەکراویشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو.

ئەمە دووەمین نموونەی سەلمێنراوە لەباشێتی شۆڕش – دامەزراوەیەکی نوێ شوێن دامەزراوەیەکی کۆنی گرتبووەوە. هەربەو جۆرەی کە سوپای تەندروستی جێگای خزمەتگوزاری دەرمانیو تەندروستی لەگوندەکاندا گرتەوە، شوراکانی داوەریو خانەکانی دادیش شوێنی دادگاکانی بەرایی یان گرتەوە.

لەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ جووتیاران دا بەزۆری دەربارەی خانەکانی داد بەوردی پرسیارم لێدەکردنو هەمووجاریش بەمنیان دەگوت کەبڕیارەکانیان زۆرباش و لەجێی خۆیدایە. لەبەرئەوە نابێتە هۆی رەنجاندنی هیچ کەسو قەبووڵکردنیشی لەرووی ناچارییەوە نییە. ئەمە دادپەروەرییێك بووکەلەناو خێزان دا بەهۆی لێهاتوویی ریش سپییەکانەوە جێبەجێ دەکرا. ئەوان لە زەمینەو رابردووی کاروبارەکانی ئەم شوێنە ئاگاداربوونو لەوشوێنەش دا خەڵکی دەیانزانی کەلەرووی ئابووریو کاتەوە بە قازانجیانەو بۆیان دەمێنێتەوە.

ئەگەر چارەسەرکردنی دوسیەیەکی بەرواڵەت بێ بایەخ بدرێتە دەست کەسانێك کەلەبیروبۆچوونی کەسانی دەسەڵاتدار لەوشوێنەدا ئاگادارن، رەنگە رەهەندی

چاوەڕوان نەکرا بەخۆوەبگرێت. ئەم کەڵك وەرگرتنەو، ئەگەر ئازایەتی وتنیم هەبێت ئەم بەکارهێنانەی ئەقڵی جەماوەر لەقووڵترین ئاستی دا، بێ گومان دەبوو بەبڕیارێکی شۆڕشگێڕانە بێتە ئەژمار. هەڵبەت قەبووڵمە کەتائاستێك ئەزموونێکی بێ باکانەش بوو.

لەبەر ئەوە ئێمەمتمانەمان بەپیاوانێك لەناوخودی خەڵکدا کردو داوامان لێکردن کەبەپێی ویژدانیان داوەری بکەن و ئەوانیش داوەری کردنی باشیان بەئەرکی خۆیان زانی.

بەمجۆرە، توانای داوەری کردنی خەڵك بەدیموکراتیکترین شێوەی لواو، بووبە بەشێك لەئەرکەکانی دەوڵەت. وە بەم جۆرە بووکە دووان لەبنەماکانی من، یانێ بەشداری خەڵك و نەمانی ناوەندێتی جێبەجێکرا. جیالەمانەش، سەلماندمان کەنەتەنیا لەگوندەکاندا بەڵکو لەشارەکانیشداو لەناوخەڵکدا، کۆمەڵێکی هەڵبژاردە هەیە، کەحیزبی رستاخیزی ئێمە دەیویست ئەم کۆمەڵە هەڵبژاردەیە بەدەسەڵاتی یەکسانەوە بێنێتە مەیدان. وەها کۆمەڵێکی هەڵبژێراو کەئێستا دەبێت زیانی زۆری بەرکەوتبێت ناکرێ بەئاسانی لەناوببرێت.

بەڵگەیەك کەمن سەبارەت بەدادپەروەری دەیخەمەروو هەرئەمەیەو هێشتاش هەرماوە. وڵامی من بۆمێژوو هەروایە.

# فەسڵی ١٣

## شۆڕشی سپی لە پەروەردەو فێرکردندا
## داکۆکی لە شارستانیەتی ئێرانی

دادپەروەری و یاسا پەیوەندی بە ئێستاو هەندی جاریش بە رابردووەوە هەیە. بەڵام بەگومانم ئاشکرابوو کەمن هەمیشە بیرم بەلای داهاتووە وە بوو: هەم لەبەر پێویستی ئەرکەکەم و هەم لەبەر ئەوەی کە روانین بۆ داهاتوو بەشێکە لەسروشتی من.

داهاتوو هی نەوەی نوێیە و کەواتە پاش دابین کردنی تەندروستی، دۆزی پەروەردەو فێرکردن دەبوو پلەی یەکەمی گرنگی هەبێت.

گومانم وایە کە بارودۆخی فەرهەنگی وڵاتەکەم بەوجۆرەی کەبنەماڵەی پەهلەوی بوون بەمیراتگری لەرستەیەکدا کۆکردوەتەوە: لەسەردەمی دەسەڵاتی قاجاڕدا، بەزەحمەت لەسەدا یەکی دانیشتوانی ئێران خوێندەوارییان هەبوو. لەولاتێکدا کە فارابی و رازی و حەلاج و ئیبن سینا و برایانی غەزاڵی و حافێزو سۆهرەڤەردی و عومەری خەیام و فردەوسی و روزبێهان بەقەلی و زۆریکی تری بەخشیوە بەدونیا، تەنیا لەسەدا یەکی خەڵك خوێندەواربوون.

لەبەرئەوەی سەرەتای هەرئیشێك دژوارە و بەخاوی دەڕواتەپێش، سەرژمێری

چوارملیۆن منداڵەی کەدەبوو بڕۆنە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، تەنیا ١٧٢٠٠٠٠ کەسیان توانی ئەم کارەبکات. ٢٢٨٠٠٠٠ کەس لەمنداڵانی ئێرانی دەبوو بەنەخوێندەوار بمێننەوە لەبەرئەوەی کەقوتابخانەو مامۆستای پێویست مان بۆئەوان نەبوو.

هەنگاوی شۆڕشگێڕانە بۆژێرو رووکردنی کاروباری بەڕێوەبردنی وڵات پێویستییێکی بێ ئەملاوئەولا بوو. پێشتر سەبارەت بەسوپای زانست دواوم (خاڵی ٦ راگەیەنراوە کەمان). ئەم سوپایە بەراستی لەبەرئەوەی دروستکرا کەئامرازێك بێت لەدەستی شۆڕشدا بۆپەرەپێدانی پەروەردەو فێرکردن بۆ دوورترین لادێ کانی وڵات. ئەمەش کارێك بوو کەلە ژیانی ئەمڕۆی ژنانو پیاوانداو لەژیانی داهاتووشییاندا پێویستییێکی حاشاهەڵنەگرە.

## ژمارەکان پێشکەوتنی ئێمە نیشان دەدەن:

پێشتر ژمارەگەلێکی تایبەت بەکومەڵگەی لادێیم هێناوەتەوەو باسم کرد کەسوپای زانست – وەك دووسوپاکەی دیکە– لەگەڵ دەوڵەتدا هاوکاری دەکرد، نەئەوەی کەجێگەی دەوڵەت بگرێتەوە. یەکێکیتر لەپرۆژە نیشتمانییەکان دروستکردنی قوتابخانەی گەڕۆك بوو هەتا لەگەڵ کۆچەراندا بگوێزنەوە بۆلەوەڕگەتازەکان. لێرەدا ئامارە بەهەندێ ژمارەدەکەم کەئەنجامی پازدەساڵ تێکۆشانی پاكوبێگەردی سوپای زانستو ئاکامی پازدەساڵ کاری بەردەوامی دەوڵەتو قەوتابخانەی کۆچەریەکان دەخاتەروو:

ڕێژەی زۆربوونی پازدەساڵەی ژمارەی قوتابیان لە:

| | |
|---|---|
| باخچەی ساوایان | ١٣٥٠٪ |
| قوتابخانەکانی سەرەتایی | ٥٦٠٪ |
| قوتابخانەکانی ناوەندی | ٢٦٣٪ |
| قوتابخانەکانی ئامادەیی | ٣٣١٪ |
| قوتابخانەکانی تەکنیکی و پیشەیی | ١٥٥٠٪ |
| قوتابخانەکانی سوپای زانست | ٦٩٢٪ |

ژمارەی تەواوی قوتابیانی ئێرانی لە ١/٥ملیۆن کەسەوە بۆ ١٠ملیۆن کەس لەساڵی ١٩٧٨دا بەرزبووەوە. سوپای زانست لەم زیادبوونەدا زیاترین پشکی هەبوو، لەبەرئەوە کاریگەری بوونی ئەم سوپایە زۆر زیاتر بوو لەفێرکردنی رووت و، شەوقی فێربوونی دەدا بەقوتابیان. دووبارە سوپاسی ئەم سوپایەدەکەین کە خوێندنی سەرەتایی گوندەکانی لە ٣٩/٤٪ وە لەکۆتایی قۆناغی ١٥ساڵەدا گەیاندە لە ٥٢/٨٪ کەهاوسەنگ بوو لەگەڵ ڕێژەی سەدی دانیشتوانی گوندەکاندا. سەرئەنجام، بوودجەی پەروەردەو فێرکردن بەرێژەیەك بەرزبووە وە کەپێم وانییە لەزۆرێك لەولاّتاندا شتی وا بووبێت.

بوودجە لە:

| | |
|---|---|
| بەرنامەی سێیەمی ئاوەدانی(١٩٦٣تا١٩٦٧) | ٤٥ملیارریاڵ |
| بەرنامەی چوارەمی ئاوەدانی(١٩٦٨تا١٩٧٢) | ١٧٢ملیارریاڵ |
| بەرنامەی پێنجەمی ئاوەدانی(١٩٧٣تا١٩٧٧) | ٥٥١ ملیارریاڵ |

لەخەملاندنی بەرنامەی شەشەم دا(١٩٧٨تا ١٩٨٢) بوودجەی بەرچاوی ٢٥٠٠ تا ٢٧٠٠ملیارریاڵی پێش بینی کرابوو. بە دووری دەزانم کەوەها بوودجەیەك هەرگیز دابین ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا وردبوونەوە لەم ئامارانە نیشانی دەدات کەلەکۆتایی بەرنامەی شەشەمدا، ١٣٧٣٠٠٠٠ فێرخوازمان دەبێت کەلە ٤٠٪ زیاترە لەئێستا. ئێستا دیارنییە چی بەسەرئەم کچ و کوڕانەدا دێت؟

## ڕاگەیەنراوی گۆڕانکاری لەبواری فێرکردندا:

فێرکردن بێگومان باش بوو. بەڵام دەبوو لەڕووی چۆنیەتیەوە باشتر بکرێت و پێویست بوو کەلەگەڵ پێداویستییەکانی ژیانی نوێ لەئێراندا بگونجێت. لەساڵی ١٩٦٨دا ئەم ئامانجە لەبەڵگەنامەیەکدا بەناوی "ڕاگەیەنراوی گۆڕانکاری لەبواری فێرکردندا" کەلەکۆنگرەی ڕامسەردا ئامادەکرابوو ڕاگەیەنرا. ئەم ڕاگەیەنراوە خاڵی دوازدەیەمی شۆڕشی سپی بوو.

لێرەدا ئاماژێیەك بەرێنماییە سەرەکییەکانی دەکەین کە لەکۆنگرەکەدا پێشنیازکرا: دەبێت بابەتێن فرەچەشنتر بوترێتەوە وشێوازەکانی وانەوتنەوەش بەگوێرەی ڕۆژ جێبەجێ بکرێن، بەجۆرێکە لەگەڵ پێداویستییەراستەقینەکانی ئەمڕۆ و سبەی ئێرانییەکاندا بگونجێت. لەم ڕووەوە لەلایەك بەفێرکردنی مێژووی دێرین و نوێی ئێران، بە پەرەپێدانی فەرهەنگ، بەزمانی فارسی و داب و نەریت و فەرهەنگی گشتی و لەلایەکی تر، بەفێرکردنی پیشەیی و تەکنیکی بایەخێکی زیاتر درا. ئەم بابەتانە شوێنی خۆیان لەتەنیشت بابەتەکۆنەکانی ئامادەیی دا کەپێداچوونەوەشیان تیاکرا بوو کردەوە.

لە ڕووی کاروباری بەرێوەبردنیشەوە بەرەوکەم کردنەوەی دەسەڵاتی ناوەند هەنگاومان دەنا. زۆرێك لەو کۆلیژانەی کەلەتاراندا کۆببوونەوە گوێزرانەوە بۆ شارەگەورەکانی پارێزگاکان.

ڕاسپاردەیەکی گرنگی دیکەی کۆنگرەکە ئەوە بوو کەپەلە بکرێت لەفێرکردنی هونەری و تەکنیکی لەهەموو ئەوبوارانەی دا کە دەشێت. تائەم کاتە شێوازی نوێی فێرکردن پەیدابوو (بیستنی و دیتنی، تەلەفزیۆنی، خوێندنی ئێواران، خولەکانی کۆتایی خوێندەوارکردن و هتد). بەم شێوە ئەوسێ کەناڵەی کەلەفەسڵی تایبەت بەسوپای زانستدا باسم کرد باشترین کەرەستەی فێرکردنی لەرێگای تەلەفزیۆنەوە دەخستەبەردەست هەمووگوندەکانی وڵات.

لە ١٨ زانکۆ و ١٣٧ دامەزراوەی فێرکردنی باڵادا، مامۆستایان دەبوو بەشێك لەکاتی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوە تەرخان بکەن و پلانەکانی فێرکردنی خۆیان لەگەڵ چالاکی کردەیی دا تێکەڵ بکەن. ئەوان هەروەها ڕاسپێردران کەلەگەڵ بەشەکانی ئابووری و جڤاکی دا لەپەیوەندی دا بن بۆئەوەی لەدوایین پێویستیەکانی ئەوان بە تەکنیککارو ئەندازیارو مافناس و پزیشك و بەرێوەبەرو هتد ئاگادارین.

وەرزشیش ئاوڕی لێدرا بووە وە.

وتوویانەکە:" وەرزش ئیرادە بەهێز دەکات" و من نەمدەتوانی یادی قارەمانانی خۆمان واتا بوێرانی ئێرانی دێرین لەبیربکەم. رێبازی قارەمانێتی هەمیشە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی هاوپەیوەندی هەستی نیشتمانی بووە و قەڵغانێك بووە لە بەرامبەر هێزە تێکدەرەکاندا.

دروستکردنی خێرای یاریگاکان، مەلەوانگەکان و ناوەندە وەرزشییەکانی دەوڵەتی و تایبەتی، ڕوو لەزیادبوونی ژمارەی گۆڕەپانەکانی وەرزش لەنزیك قوتابخانە و کارگەکان و رێکخستنی کێبڕکێکان و بەشداری بەردەوام و رێك وپێك لەچالاکییە وەرزشییەکانی نێونەتەوەیدا، هەمووی ئەمانە دەبێت ئەو دەرفەتە بۆ ئێمە بڕەخسێنن کە لەپاڵ باشترین وەرزشکارانی جیهاندا دەوری جێی شانازی خۆمان لەبەشە گەورەکانی وەرزشدا بگێڕێن.

سەبارەت بەم بابەتە، دەبێت بڵێم کەئێران لەیارییەکانی ئاسیای ساڵی ١٩٧٤دا پلەی دووەمی بەدەست هێنا و لەپاش ژاپۆن هات و لەهندستان و چین کەدانیشتوانیان بیست ئەوەندەی ئێرانە پێش کەوت.

دەبێت ئەم راستییە دووپات بکەمەوە کەئامادەیی و زانکۆکان ئەرکی ئەوەیان هەبوو کە دانیشتوانی ئێران، واتا پیاوان و (ژنان)ێك کەبنیات نەرانی ئێرانی دوارۆژبوون پەروەردە بکەن. ئەوان دەبوو ئامادەبن بۆ بەرەو روبوونەوە لەگەڵ گیروگرفتەکانداو نەتەنیا توانایی بەڵکو ئیرادەی پێویستیشیان هەبوایێت. ئەمە هەر ئەو شتەیە کەناوی نیشتمان پەروەری لێدەنێم.
یەکێکی دیکە لە لایەنەکانی بنەمای ١٢ تایبەتە بەچاکسازی لەکارگێڕیدا کەدواتر قسەی لێوەدەکەم.

## پەروەردەو فێرکردنی راستەقینە، سەربەست و سەپێنراو قوتابیانی بەرجەستە:

پەروەردەو فێرکردنی بێ بەرامبەرو سەپێنراو لەبنەڕەتدا بەفەرمانی باوکم پێکهات. بەڵام بەداخەوە کەرەستەی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە ئامادەنەبوو. پێش لەجێبەجێ کردنی خاڵی ١٥، پەروەردەو فێرکردنی بێ بەرامبەری سەرەتایی و قوتابخانەکانی سوپای زانست هەبوو. گەورەترین ئاواتم ئەوەبوو کە ئەم خاڵەهەموو قۆناغەکانی خوێندن بگرێتەوە. بۆ هەشت ساڵی یەکەمی قوتابخانە خوێندنی بێ بەرامبەرمان پێکهێنا. پاشان هەرقوتابییێکی کچ یان کوڕ کەدرێژەی بەخوێندن دەدا، ئەگەر ئامادە دەبوو بەقەی ئەو ماوەی کەلەدوای هەشت ساڵەکە دەیخوێند، ئیش بۆ دەوڵەت بکات تێچووی خوێندنیان لێ نەدەسەند.
ئەگەر ئەم فێرخوازانە لەپاش تەواوکردنی خوێندن نەیان دەویست کەئیش بۆ دەوڵەت بکەن دەبوو تێچووی ئەوماوەیە لە خوێندن بدەن. بەهۆی ناچارکردنی فێرخوازان بۆخزمەت کردن بەدەوڵەت بۆماوەی چەندساڵ لەدوای تەواوکردنی خوێندن، نەتەنیا نەدەبووینە هۆکاری راگرتنیان بەڵکو خزمەتێکمان بەرامبەر ئەوانیش ئەنجام دەداو بەمجۆرە ئیش و داهاتێکی باشیان بۆ دابین دەبوو.

کاریگەری ئەم یاسایە لە ١٩٧٨دا ئەوە بوو کە ٧٤٠٠٠٠٠ فێرخواز لەباخچەی ساوایان و قوتابخانەکانی سەرەتایی و تەکنیکی و ئێواران و گەورەسالاّندا بەبێ بەرامبەر دەیان خوێند. بۆ شەش ملیۆن کەس لەوانە هەموو رۆژێك لەقوتابخانەدا ژەمێك خواردنی بێ بەرامبەر دابین دەکرا.

بەگشتی ١٨٥٠٠٠ خوێندکار لە ٤٨ زانکۆداو نزیکەی ١٠٠٠٠٠ خوێندکار لەزانکۆکانی دەرەوەی ولاّتدا سەرقاڵی خوێندن بوون کە ٥٠٠٠٠ کەسیان لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەیانخوێند. زانکۆکانی شیرازو ئیسفەهان لە رووی جوانی ناوەوەیان لەدونیادا کەم وێنەبوون. شوێنەکەیان بەوردبینیەوە دەسنیشان کرابوو ونەخشەی بیناکانیان لەو پەڕی وردبینیدا داڕێژرابوو. بڕیاربوو زانکۆیەکی سێیەمیش لەهەمەدان دا دروستبکرێت کەلەودا دەبوو بەزمانی فەرەنسی بخوێنرێت.

زۆربەی خوێندکاران جگە لەبوورس، دەرماڵەی خوێندنیشیان پێدەدرا. ئەوکەسانەی کەلەکۆتاییەکانی دەیەی پەنجادا لەدایك ببوون بێ ئاگابوون لەوەی کە باب و باپیرانیان چ گیروگرفت گەلێکیان بڕیوە. ئەوان پێیان وابوو کەلەبەردەستدا بوونی باشترین کەرەستەکان شتێکی ئاساییە.

ئەمڕۆ بیرلەوە دەکەمەوە کە رووداوەکانی ٧٩-١٩٧٨تا رادەیەك دەبێت بە بەرهۆی ئەم راستییەی بزانم کە تێدەکۆشام زۆرخێرا هەنگاوبنێم. دەمویست دەرگای زانکۆکان بە رووی هەمووواندا ئاوەڵابکەم بێ ئەوەی کەشێوەیەکی تا رادەیەك توند بۆ بژاردن بگرمەپێش: تاقیکردنەوەکانی چوونە زانکۆ زۆرئاسان بوو. ئاندرەمالرۆ هەمیشە بەمنی دەگوت:" هەموو ولاّتێك پێویستی بەدەهەزارکەسی بەرجەستە هەیە". بەرای من ئەو راستی دەکرد. هەڵەی من لەوەدابوو کەبەباشی ئەم هەستەم لەناو میللەتەکەمدا برەوپێنەدا کەلەناو ئامێرداران و کرێکاران و کانزاکارانیش دا" کەسانی بەرجەستە" پەیدادەبن. تاساڵی ١٩٧٩ گشت لاوەکان دەیانویست ببنە خوێندکار.

لە روانگەی ئێمەوە زۆرگرنگ بوو کەلاوانی وڵات بەهەستێکی دەروونیی قایمو بەهێزەوەو هەڵبەت بەزانستی تەکنیکی باشیشەوە بۆ رووبەرووبوونەوە لەگەڵ دونیای ئەلێکترۆنیو کیمایی داهاتوو ئامادەبکەین. هەربۆیە هەموو هەوڵەکان بۆئەوەبوو کە لاوان بەئاسانی بچنە زانکۆ.

زۆربوون ئەوباوکانەی کەهەرگیز لەگوندەکانی خۆیان پێیان وەدەر نەنابوو و نەیان دەزانی کورەکانیان لەچ شتانێك بەهرەمەندن: ژیانێکی ئاسوودە لەشارێکی گەورەدا وبەزۆریش لەشوێنەدڵگیرەکانیدا، بەلەبەردەستدا بوونی کتێبخانەو تاقیگەو دەرفەتی گەشت کردن بۆ دەرەوەی وڵات، ئەوان جگە لەخوێندن کارێکی تریان نەبوو.

هەندێ کەس بۆهەبوونی ئەم جۆرەشتانەی کەتازە دەرکەوتبوون ئامادەییان نەبوو و بۆ بەرەو رووبوونەوە لەگەڵ خۆش بژێوی رواڵەتی لەژیانی نوێ خۆیاندا سازو ئامادە نەبوون.

هەربۆیە هەندێ جار لەشیان قورس دەکردو یان تەنانەت شەڕیان دەفرۆشت. ئەوان بەهەوڵدانێکی زۆرکەم زۆرشتیان بەدەست هێنابوو پێیان وابوو کەزۆر سروشتییە داوای شتانی زیاتریش بکەن. نارەزایەتی زۆرجار دەربڕی روانگەیەکی ئیدەئالیستییە دەربارەی ئەو گرفتو کێشانەی کەرێگەچارەی راستەقینەیان دواتر، بە هۆی ئەزموونەوە، خۆی نیشان دەدات. ئەم خوێندکارانە راست وەك منداڵانێکی بێ تام بەجۆرێك نارەزایەتیان دەربڕی کە سیستەمی زانکۆیی ئێرانیان تووشی بشێوی کرد. هەنووکە ئەم خوێندکارانەن کە یاسا دەسەپێنن لەبەرئەوە لەپازدەساڵی دا مافی دەنگدانیان پێدراوە. زۆرێك لەمامۆستایانی زانکۆ تووشی دڵساردی هاتوونو وڵاتیان بەجێ هێشتوە یان لەحاڵی بە جێ هێشتن دان لەبەر ئەوە دەسەڵاتیان لەناو چووە. تەنیا لەتاراندا ١٢٠٠ کەس لە ٢٠٠٠ مامۆستای زانکۆ داوای خانەنشینی پێش لەکاتی دیاریکراویان کردووە.

ئێستا ئەگەر پەروەردەو فێرکردن، لاوانی ئێمە لە رووی تەکنیکی و فیکرییەوە سازو ئامادە نەکات، ئەگەر فێرکردنی زانستی سەردەم رابگیرێت، ئێران بەشێوەیەکی پڕمەترسیانە بەردەبێتەوە بۆناو دەسەلآتەکانی پلەی پێنجەم.

## داکۆکی لەفەرهەنگی ئێران:

هەرگیز پێم وانەبووە کە فەرهەنگ ماف تایبەتی توێژێن تایبەتە، هەروا کەبینرا ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان وەگەڕخست تا هەمووکەس بتوانێت کەڵك لەپەروەردەو فێرکردن وەربگرێت. لەناو ئەو ئەرکانەیدا کەشابانوو لەدڵەوە جێبەجێ کردنی لەئەستۆگرت، بەتایبەت ئەوگری زۆری بۆبەشی ئەدەب و هونەر نیشان دەدا. لەنێوئەرکەکانی دیکەدا سەرەڕای هەلومەرجی دژوار توانی ئەم ئەرکانە بەباشی ئەنجام بدات: پاراستنی داب و نەریتی هونەریی سەردەمی دێرینمان، یارمەتی بە پەرەپێدانی فەرهەنگ، زیادکردنی دامەزراوەی فەرهەنگی و کتێبخانەکان، رێکخستنی کیبڕکێ و پیشانگاو فستیڤاڵەکان و هاندانی تواناییە نوێکان.

ئەم تێگەیشتنەی کە هەرچی پەیوەندی بە رابردووەوە هەیە کۆنەپەرستی و دژی پێشکەوتنە یان باوی نەماوە،لە نێو هەندی لەچینەکانی سەرمایەداری شاریدا برەوی هەبووو دەبووە هۆی ئەوەی کە فەرهەنگی ئێرانی بێ بایەخ نیشان بدرێت و کەلەپووری هونەری رابردوو لەبیربکرێت.

بۆ زیندووکردنەوەی فەرهەنگی ئێرانی بەهەموو رەسەنایەتی و جوانییێکیەوە دەبوو رێگاگەلێك پەیدابیێت. بۆ نموونە، بنەمای بەرواری ولآتمان گێڕایەوە بۆ دەسپێکردنی سەردەمی هەخامەنشیان، بێ ئەوەی کە بەرواری کۆچی وەلابنێن، ئێمە لەگەڵ دوو بەرواردا ژیاوین. بەرواری مێژوویی و بەرواری مەزهەبی. هەروا کە ئەمساڵ، ١٩٧٩، ئێمە هەوڵمان دا رێوڕەسمی دەسپێکردنی ساڵی نوێ بەرێوە نەبەین، بەلآم نەمانتوانی.

سەبارت بەگۆڕانکارییەکانی سیستەمی پەروەردەی وڵات پێشتر قسەم کردو وتم کەلەسیستەمی خوێندنی قوتابخانەکاندا شوێنێکی تایبەتی بۆ شێعرەکانی شێوازی کۆن تەرخان کرا. بە بەرەکەتی تەلەفزێون، موسیقای کۆنی ئێرانی نەتەنیا لە فەرامۆشی ڕزگاری بوو بەڵکو بوو بەجێگای ستایشی زۆرێك لەخەڵك. هاوکات، دەروونی ئێمە دژی کۆنەپەرستی بوو وشابانویش بزوێنەری هونەری نوێ‌و فستیڤاڵەکانی شانۆیەك بوو کە هونەرمەندانی زۆرئازاو پێشکەوتووی کۆدەکردەوە.

لەکاتێکدا زۆر بەپەلەسەرقاڵی بیناسازی بووین، لە ڕووی ئەندازیارییەوە گیرو گرفتی جدی سەری هەڵدا. لەم بارەشەوە وەك بوارەکانی دیکە، زۆرحەزمان دەکرد کە کەم‌و زۆر لە نموونەی ڕۆژئاوا پەیڕەوی بکەین. کەسانێکە سەرقاڵی بیناسازی بوون بینا ئێرانییە ڕەسەن‌و بەرجەستەکان‌و هەندێ جاریش گوندێکی کۆنیان وێران دەکرد بۆ ئەوەی بینای نوێ دروست بکەن کەنەتەنیا هیچ پەیوەندییێکی لەگەڵ گوندو خەڵکی ئێراندا نەبوو، بەڵکو زەوقی ئەو کەسەش کە دروستی دەکرد جێگای گومان بوو.

شابانووبەزۆری لەوەها حاڵتێکدا دەچوو ناوبابەتەکەوە هەتا بیناسازان هانبدات کەلەجیاتی ڕووخاندنی هەندێ لەخانووەکان‌و گوندەکان‌و دروستکردنی ڕیزە خانووێکی لێك چوو لەجیاتیان، هەندێ لە گەرەکەکان‌و گوندەکان نوێسازی بکەنەوە. بەڵام هەر بیانییێك کە ئێرانی دیوە دەزانێت کە ئێمە بەپێکهێنانی چاکسازی‌و هاوسەنگی لەشێوازە نوێ کاندا دەرئەنجامی باشمان دەسکەوتووە.

## فەسڵی ١٤

# گۆڕانی کارگێڕی
# بەرهەڵستکاری دەزگای کارگێڕی

دەزگای کارگێڕی یان بەلاٌی دونیا، لەئێراندا تائاستی پلەی دامەزراوەیەك بەرزبووەتەوە. تۆزێ پێشتر ئامارژەم کرد کەبەشێکی گرنگ لەخاڵی ١٢ پەیوەندی بەچاکسازی لەبواری کارگێڕیدا هەبوو. ئێمەدەمانزانی کەلەم بەشەدا دەبێت لەگەڵ: جۆرە دێویکی چەندسەر، نامەو نامەکاری بەردەوامو سستیو ئەمڕۆبڕۆو سبەی وەرەوە، بەرەو رووببینەوە. ئێمە دەروست بووین بەچاکسازی ئەخلاقیو مەعنەوی لە شوێنێکدا کەلە زۆرلایەنەوە، دوژمنی هەرجۆرە گۆڕانکارییێك بوو.

**گۆڕان لەبواری فێرکردندا، مەرجی پێویست بۆگۆڕانکاری لە کارگێڕی دا:**
بە باوڕی من ئەرکی دەزگای کارگێڕی خزمەتکردنی ولاٌتە. فەرمانبەرانی دەوڵەت دەبێت لە بەرژەوەندی گشتی ئاگاداربنو هەست بە بەرپرسایەتی بکەن بۆئەوەی کاروباری ولاٌت بەوجۆرەی کەپێویستە بەرێوە بچێت. بەلاٌم ئێمە ناچاربووین لە

دوولایەنەوە گۆڕانکاری بکەین: واتا هەم لەشێوازی بەرەو روو بوونەوەی دەزگای کارگێڕی لە هەمبەر خەڵکداو هەم لەهەڵسوکەوتی خەڵکدا بەرامبەر بەم دەزگایە.
گۆڕانی کارگێڕی لەرادەبەدەر پێویست بوو چوونکە قەبارەی کاری ئەم دەزگایە لەبەر زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانو گەشەی ئابووری وڵاتو جێبەجێ کردنی بەرنامەی سووککردنی باری ناوەند، بەردەوام رووی لەزیادبوون بوو. ئەم سێ هۆکارە گەشەسەندنی خزمەتگوزاری گشتیو دامەزراندنی فەرمانگەی نوێشی لەگەڵدا بوو.
ئێمە بەتەواوەتی لەدژوارییەکانی ئەم هەوڵو تێکۆشانە ئاگاداربووین. دەبوو هێرش بۆسەر ریشەی کەمو کوورییەکان ببەینو هەربۆیە گۆڕانکاری لەکارگێڕیو فێرکردندا، لەچوارچێوەی بنەمایەکدا خرایەروو. ئەو یاساو رێساو ئیشانەی کە تایبەت بوو بەزانکۆکانو خوێندنی باڵاو دامەزراوە پەروەردەییەکان بە بەشێك لەگۆڕانی کارگێڕی دادەنرا، لەبەر ئەوە ئامانجی ئەم یاساو رێساو فرمانانە یارمەتی دانی ئێرانییەکان بوو بۆگەیشتن بە گەشەو پێگەیشتوویی لەرووی هزرو ئاکارەوە.
پێویستە لەسەرخاڵێك جەخت بکەمەوە: سوپاکانی زانستو تەندروستیو برەوپێدانو ئاوەدانیش بۆ هێنانەگۆڕی شێوازی بیرکردنەوەی نوێ لەوڵاتداو بەرگری کردن لە دەستێوەردانی دەزگای کارگێڕی دامەزران.
ئاواتی من ئەوەبوو کە سیستەمی پەروەردەو فێرکردن کە بەراگەیەنراوی رامسەر گیانی بەبەرداهاتەوە، بتوانێت بە بڵاوکردنەوەی ئەم شێوازەنوێە لەبیرکردنەوە لەناو منداڵانی سەرەتاییو فێرخوازاندا، ببێتە هۆی بەهێزکردنی بناغەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەو زیادکردنی ئینتیمای خزمەت کردن بەوڵات بێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی وهەروەها نەمانی دەمارگیری بەرامبەر بە دونیای مودێرن.
بۆ گۆڕانکاری لەدەزگای کارگێڕیدا ئەنجومەنێکی ناوەندی پێکهات کە بۆهەموو وەزارەتو دامەزراوەیەکی دەوڵەتی لیژنەیەکی رەوانەدەکردو ئەم لیژنەیەش دەسەڵاتی هەبوو شێوازەکانی کارکردن بە بارێکی ئاقڵانەدا بگۆڕێت، رێنماییە بێ

سوودەکان هەڵبوەشێنێتەوەو شێوازەکانی بەڕێوەچوونی کارەکان لەگەڵ پێداویستیەنوێ کانی شۆڕشی ئێمەدا بگونجێنێت.
ئاشکرایە کە ئەم لیژنانە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان داو دەرئەنجامیشی هەبوو، لە وانە: هەندێ لەخزمەتگوزارییەکان بڵاوەیان پێکراو ئیتر لەناوەندێکەوە جێبەجێ نەدەکران، شێوازی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان هەڵوەشێنرایەوە یان کورت کرایەوە، شێوازەکانی کارکردن بەرێخستنی ئەو سیمینارانەی کەلەودا بەڕێوەبەران‌و بەرپرسانی دام‌و دەزگاکان‌و نوێنەرانی فەرمانبەران تێدا ئامادەدەبوون، نوێ کرانەوە. لەهەرشوێنێك کە کرا بۆباشتربەڕێوەچوونی کاروبارەکان لە کەمپیوتەر کەڵك وەرگیرا.

## بەرهەڵستکاری کەللەڕەقانەی دەزگای کارگێڕی

## "چاو وگوێی" پاشا:

بەڵام لەکۆتاییدا دەبێت دانی پێدابنرێت کەبەگشتی لەماوەی ساڵەکانی ٧٨-١٩٧٥ دەزگای کارگێڕی لە بەرامبەر ئەم شەپۆلەدا بەرهەڵستی کرد. بەڵام بەم جۆرەیە کە دێوەزمەکە شێوەکەی گۆڕاو هەندێ جاریش سیمایەکی پێشکەوتنخوازانەو جاروباریش ڕەنگی نەریتی‌و جێی شانازی بەخۆوەگرت.
ئێمە لەساڵی ١٩٥٩دا دەزگای پشکنینی پاشایەتیمان دامەزراندبوو. ئەم ڕێکخراوەیە، لەراستیدا ئەو دامەزراوەیەی کە لەسەردەمی هەخامەنشی دا بە " چاو و گوێی شا " ناوبانگی هەبوو بەشێوەیەکی ئەمڕۆییانە زیندووی دەکردەوە. یان دەکرێ بیشوبهێنین بەدەزگای سویدی پێراگەیشتن بە سکاڵاکان "(Ombudsman) . کۆمەڵێ مروڤی داوێن پاك، کە راستەوخۆ وا مدەری من بوون، لە سەرانسەری وڵاتدا دەگەڕان‌و چاودێربوون بۆئەوەی گیروگرفت‌و کەم‌و کورتیەکان بدۆزنەوە. هەمووئێرانییەکان دەیانتوانی سەردانی " پشکێنەرانی پاشایی" بکەن‌و ئەوان لەو دواخستن‌و نادادپەروەرییەی کەلە جێبەجێ کردنی

پـرۆژە سەرانـسەری‌و ناوچـەییەکاندا تێبـینی دەکـرا یـان لەدواخـستن‌و نارێـك‌و پێکییێك کەلەبـەکارهێنانی سـامان‌و دارایـی گـشتی دا بەرچـاو دەکـەوت ئاگـادار بکەنەوە.

دزی‌و بەفیڕۆدانی سامانی گشتی‌و درۆکردن لەکۆنەوە وەك بەشێك لەژیان دانراوە، لەم رووەوە پێم وابوو کەباشترین رێگای کۆتایی هێنان بەوەها دزێوییێك، رێگری کردنیانـە. لەپێوەنـدی لەگـەڵ هەنـدێ لـە فەرمانبـەرانی دەوڵەتـدا، تـەنیابوونی پشکێنەرانی پاشایی وەك جۆرێك لەویژدان وابوو.

ئەم دامەزراوەیە لەساڵی ١٩٦١دا هەڵوەشایەوەو لـە ٧ ی نۆڤامبری ١٩٧٦دا لـەژێر نـاوی "کومیـسیۆنی پـشکنینی پاشـایەتی " دا سـەرلەنوێ ژیایـەوە، کـەپێکهاتبوو لەنوێنـەرانی دەزگاکـانی کـارگێڕی، حیزبـی رسـتاخیز، ژوورەکـانی بازرگـانی‌و پیشەسازی و سەرچـاوەکان‌و سـەرئەنجام راگەیەنەگـشتییەکان. ئـەم کومیـسیۆنە ئەرکی ئەوەبوو کەلێکۆڵینەوە لەپلانی وەزارەتەکان‌و چاودێریی جێبەجێ کردنیان بکات، هەروەها بڕیاربوو کەرێ لەهەڵەکانیش بگرێت، کەموکورتیـەکان دەسنیشان بکـات، کۆتـایی بەکەمتەرخـەمی بهێنێـت‌و هەڵـەکان راسـت بکاتـەوەو ئەگەرپێویستیشی کرد سەرپێچی کاران سزابدات.

ئەم کومیـسیۆنە شێوازێکی نـوێ بـوو بۆپـشکنین‌و جیاکردنـەوەو چارەسـەرکردنی کاروبارەکانی وڵات‌و لەروانگەی منەوە ئەرکەکەی زۆرشوێن دانەرترو زیاتر لـەوەی کـە وڵاتـانی رۆژئـاوایی لەبارەیـەوە رەخنەگرانـە دەدوان، دۆسـت‌و دوژمـنی نەدەناسـی. لەبەرئـەوەی رەخنـەکانی نـەیاران زۆر بەکـەمی پـشت بەوشـتانەی دەبەسـتێت کەبـە چـاودەبینرێت. بـەڵام بەداخـەوە، وەك زۆرێـك لـەدواین تەگبیرەکانمان، ئەم کومیسیۆنەش دەرفەتی نەبوو بەرهەم بدات.

لـەناو هەمووچاکسازییەکاندا، گـۆڕانی کـارگێڕی پێویـستی بـەکاتی زیاترهـەبوو و تەنیا لەرێگەی گۆڕانکاری تـەواو لـە شێوازی جێبـەجێ کردنـی کارەکان‌و رەفتاری خەڵکـەوە بـەدی هـات. ئەگـەر بـەبیری بێنینـەوە کەهـەر لەوکاتـەدا ئێمـە لەهـەوڵی ئـەوەدابووین کەقورسـایی کاروبارەکـان لەسـەرناوەند کـەم بکەینـەوە —

کەبەناچاردەبوو ژمارەی فەرمانبەران زیادبکرێت – ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەلەم بوارەشدا لەگەڵ کات لەشەڕدا بووین، لەبەرئەوە سەرنەکەوتن لە گۆڕانی کارگێڕی دا سەرئەنجامێکی خراپی لێ پەیدادەبوو.

بۆئەوەی بتوانین وەها چاکسازییێك بکەین پێویستمان بەدەرفەتی لەبارهەیە. لەم ساڵانەی دواییدا، من کاتی پێویستم نەبوو، چونکە زۆرینەی خەڵك منیان لەتەنگانە خستبوو ودوژمنایەتیان لەگەڵم دەکرد. بەم باسانەش کەکردمان، دەزگای کارگێڕی نە تەنیا ئێمەی لە ململانێ لەگەڵ کاتو جەماوەری خەڵکدا یارمەتی نەدا، بەڵکو بەپێچەوانە!

# فەسڵی ١٥

# ئـــــــــازادی ژنـــــــان

لە پێکهاتەی ماددی و مەعنەوی ئەوشتەی دا کەپێم دەگوت "شارستانیەتی مەزن" بەرپرسیایەتی ئەخلاقی و کردەیی ژنانی ئێران لەگەڵ پیاواندا هاوسەنگ بوو. هاوکات کە دەبوو بایەخی تایبەتی دەوری دایك لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا لەبەرچاوبگیرێت.
دادپەروەری و ئەقڵی دروست فەرمانی دەکرد کە ژنانیش لەهەمان ئەومافەسیاسیانەی کەپیاوان هەیان بوو سوودمەندبن. لێرەوە بوو کەبنەمای پێنجەمی ڕاگەیەنراوی شۆڕش سەری هەڵداو چاکسازی لەیاسای هەڵبژاردندا، مافی هەڵبژێران و هەڵبژاردنی بەژنانیش بەخشی.

### ئازادی ژنان:

پێویستە بەبیری خوێنەری بێنمەوە کەپێش لەشۆڕشی ئێمە، لە ماددەی ١٠ یاسای هەڵبژاردندا هاتبوو کە: کەسانی لای خوارەوە مافی دەنگدانیان نییە: ژنان، ئەوکەسانەی کە تەمەنیان لەژێر تەمەنی یاساییەوەیە، ئەوانەی کە یاسا ڕێگەیان پێنادات یان لەژێر سەرپەرشتی و بەخێوکردنی کەسانی تردان، ئەوانەی کەبەهۆی

کەمترخەمییەوە مایەپووچ بوونە، گەمژەوگێژو وێژەکان، ئەوانەی کەپیشەیان سواڵ کردنە، ئەوانەی کەلەلایەن دادگاوە بڕیاریان لەسەردراوە، دزان و ئەوانەی دیکە کەکاری نابەجێ دەکەن و یاسای ئیسلامیان پێشێل کردوە...

شێوازی بیرکردنەوەی ئەو بەناو ئایدولۆژیستانەی کە بەزۆری زۆرداری دەستیان بەسەردەسەڵاتی ئیسلامدا گرتووە بەمجۆرەیە. ئایا ئێمە کەدەممان لەتێکۆشانێك دەکوتا کە وڵاتمان دەخەینەسەر رێگای پێشکەوتنی راستەقینە ، دەمان توانی دایك و خوشك و هاوسەرو کچ مان لەریزی تاوانباراندا دابنێین؟ لە قورئاندا شتی وەها نییە.

مافەکانی ژنان لەئیسلامدا زۆر زیاترە لەوەی کە هەمووان پێیان وایە. بۆ نموونە، ژنان هەمیشە ماف سەربەخۆیی تەواویان لە ئابووری و باڵادەستیان بەسەرساماني خۆیاندا هەیە. هەندێ بیروبۆچوونی دواکەوتووانەی تایبەت بەپلەو پایەی ژن لەکۆمەڵگادا، لە رووی نەزانیەوە، بەهەڵە لەچاوی ئیسلامدا دەیبینن.

ئێمە کە میراتگرانی فەرهەنگ و شارستانیەتێکین کەهیچکات ژنی بەشتێکی بێ بایەخ دانەناوە، لەم بارەوە باوڕمان وایە کە بەپێی گیانی راستەقینەی مەزهەبەکەمان و رابردووی وڵاتەکەمان هەڵس وکەوتمان کردوە.

لە چەندهەزارساڵی رابردوودا، نەریتی ئێرانی، فریشتەسەرەکییەکانی دابەش کردبوو بۆ دووکۆمەڵ، کۆمەڵێکە پێکهاتبوو لەسێ پیاو وکۆمەڵێك بریتی بوو لەسێ ژن کەهەردوولایان خاوەنی ماف یەکسان بوون. لە دینکردا، پەرتووکی گەورەی نەریتی کۆنی ئێران، هاتووە کەژنان: ماف پارێزگاری کردن لەسامانی خۆیان هەیە، دەتوانن لەکێشەیاساییەکاندا نوێنەری هاوسەرانیان بن، دەتوانن سەرپەرشتیاری منداڵێك بن کەباوکی ئەوی لەمیرات بێبەش کردبێت، دەتوانن دادوەرو داوەر بن و تەنانەت لەهەندێ حاڵەت دا ئەرکەکانی زانای ئایینیش لەئەستۆبگرن.

لەبەر ئەم هۆکارە بوو کەشێلگیرانە لەدژی ئەوشتەی کەبەڕای من پووچ و نادادپەروەرانە بوو راپەریم. ئەگەر ئیشەکەم هەڵەبوو، چاوەڕێ دەبم تائەوکاتەی

بێت کە روون ببێتەوە لەبە نەشیاو زانینی جەستەیی و یاسایی نیوەی دانیشتوان لە ژیانی ئەمڕوییدا، چ پێشکەوتنێن بەدی دێت.

## قسەکانی عەلی لەبیرچوونەتەوە:

دەبێت دانی پێدابنێم کەئەگەر ژنان دەست و ڕوخساریان دەربخەن یان مەلەبکەن یان وەرزشی وەك ئێسکی و باسکەبکەن، ئەوان بەنوێنەری شەیتان نازانم. بەلام دەبێت بڵێم کەنموونەگەلێك لەخواپەرستی دوو روویانە لەئەدەبی ئێمە و خەڵکانی تریشدا هەیە. ئەگەر هەندێ لەژنان حەزیان بەچارشێوکرد، لە روانگەی منەوە هیچ هۆکارێکی نەبوو کەوە ها نەکەن. بەلام بۆچی دەبێت نیوەی لاوانمان لەچێژی وەرزشەکان بێبەش بکەین؟

کۆنەپەرستانی کۆمەڵگەی ئێمە تێناگەن کەبەدروستکردنی یاریگا و مەلەوانگە دەکرێ لەدروستکردنی نەخۆشخانە دووری بکەین و بێوەیی و تەندروستی خەڵك یەکێك لەبەنرخترین سامانەکانی هەرنەتەوەیەکە.

هەروەها بۆ هەرژنێك کەبەپێی داب و نەریتی ئێرانییەکان چارشێوبپۆشێت، ئەوا لێخوڕینی ئوتۆمبیل و ئیش کردن لەفەرمانگە یان لە پیشەی پزیشکی و پارێزەریدا زۆر دژوارە و لەکاتێکدا کەژنانی ئێران لەماوەی پازدەساڵی رابردوودا ئەم کارانەیان بەسەرکەوتنەوە ئەنجام داوە. ژنانی ئێمە وەزیرو باڵوێزو دادوەرو مامۆستای زانکۆ بوون، بۆسەرۆکایەتی ئەنجومەنی شارهەڵبژێران، پلەی نوێنەرایەتی و سەناتۆرییان بەدەست هێنا، کران بەسەرۆکی فەرمانگە و پیشەسازییەکان، دەورێکی مەزنیان لەخەبات دژی نەخوێندەواری و لەسوپای تەندروستی دا گێڕا. بەلام لەپێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیدا کە هەندێ لە مەلاکان لەهەوڵی دروستکردنیدان ئیتر هەمووی ئەمانە بۆ ژنان ناکرێت.

وە سەرئەنجام، دەبێت ترس لەوەش هەبێت کەناچارکردنی ژنان بۆ کەڵك وەرگرتن لەچارشێوو گەڕانەوە بۆ دەمارگیریەکانی رابردوو، ڕێگا بەژنان نەدات کەبتوانن

منداڵانی خۆیان بۆ چوونەناو سەدەی بیست ویەکەم ئامادە بکەن. کاتێك نیوەی دانیشتوانی وڵاتێك لەفێربوون و قەبووڵ کردنی بەرپرسایەتی بێبەش بکرێن و بکێردرێنەوە بۆ رابردوو، زیان بەتەواوی کۆمەڵگە دەگات.
دوارۆژ بینان دەڵێن تاکۆتایی ئەم سەدەیە بەهۆی بەکارهێنانی ئامێرە خۆکارەکان، ئێمە لەهەفتەدا سێ چوار رۆژێك زیاتر کارناکەین. لەوەها کۆمەڵگەیەکی بەختەوەردا ژنانێك کە پۆشش رێ لەوەرزش کردنیان دەگرێت چ دەکەن. چۆن دەتوانین لە داهاتوودا کۆمەڵگەیەکی شادو دڵخۆش دروست بکەین کەلەودا منداڵان دایکانێکیان هەبێت کەلەکفنی رەش دا بن؟
پێشتر ئاسازەم کرد کەلەوساتە وەختەدا کەبەپشتیوانی خوا چاکسازییەگرنگەکانمان لەبواری ئابووری و جڤاکی و سیاسیدا کەوتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە چ ئاژاوەو بشێویکی "رەش" لە جوونی ١٩٦٣دا رووی دا. ئەم بشێویانە زۆری نەخایاند چونکە ئەقڵ سەرکەوت و بەبەرەکەتی ئەم چاکسازیانە ئێران پلەوپایەی خۆی لە تەنیشت وڵاتەهەرەپێشکەوتووەکاندا بەدەست هێنا. زۆربەی پێشەوایانی ئایینی ئێمە لەم راستییە تێگەیشتن و لەیارمەتی دانمان درێخییان نەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، دووساڵ بەرلە ئێستا کام مەلا دەنگی ناڕەزایەتی بەرزکردەوە؟
حەزناکەم ناوی کەسێك بێنم و تەنیا دەمەوێت بۆچوونی خۆم بڵێم کەزۆرێك لە مەلاکان لەگەڵ "عالی جەنابی قۆم" هاوڕانین. دژایەتی کردن لەگەڵ گۆڕانکاریدا بە تەواوەتی لەگەڵ فەرموودەکانی عەلی دا ناتەبایە کەدەڵێت:" منداڵنتان بەگوێرەی سەردەمی ئەوان پەروەردە بکەن."

## دادپەروەری، کرۆکی ئیسلامە:

لێرەدا پێویستە بەبیری بێنمەوە کەبەپێی یاسای بنەڕەتی ئێمە پاشا سوێند دەخوات کە:" لەبرەوپێدانی مەزهەبی جەعفەری دوازدە ئیمامی دا هەموو هەوڵ و

کۆششی خۆی وەگەڕبخات." من باوڕم وایە کەهیچکات لەبەرگری کردن لەمەزهەبی شیعە تەنەخیم نەکردوە، بەتایبەت لەپەیوەندی لەگەڵ فیتنەو ئاژاوەدا کەمەتریالیستە خوا نەناسەکان وەڕێیان دەخستو بەرلەوەی کەپیاوانی ئایینی ئێمە بکەونە ژێرکاریگەری بەناو مارکسیزمی ئیسلامیەوە.

هەرواکەگوتم، بیروباوڕی مەزهەبی من پشتی بەدەقەکانی قورئان بەستووە، هەربۆیە باش دەزانم کەهەندێ لە "گەورەپیاوانی ئایینی" ئێمە کە راڤەکارو زانان لەمانای نێوەرۆکدا، قورئان بەگوێرەی بارودۆخو کات و لەبەرژەوەندی خۆیان دا راڤەدەکەن. بەڵام ئەوان هەرچەندەش لە بواری ئایینیداو لە بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵی دا بەرجەستە بن، ناتوانن ئەوە بسەلمێنن کەئیسلام بەشداری کردنی یەکپارچەی کۆمەڵگەی بۆ بڕیاردان لەسەرکاروبارەکانی حکوومەت بەرەوا دانابێت، یان ئەوەی کەپێغەمبەر لەگەڵ دیکتاتۆری پرۆلتاریاو دیکتاتۆری شاراوەی بەرپرسانی ئایینی یان حکوومەتی ئاژاوەدا هاوڕا بووبێت.

نێوەرۆکی پەرتووکی ئاسمانی ئێمە دژی نەفرەتو مرۆڤ کوشتنو تۆڵەسەندنەوەو دزیو تاڵانو بڕۆیەو هەمووی ئەم کردارانەش ئیدانەدەکا بەڵام لەمارسی ١٩٧٩وە لەوڵاتی چارەرەشی من دا کەنقومی "ئازارو گومرایی" (سوورەتی سیو سێ قورئان) هاتووە، هەمووی ئەمانەشێوەی یاسایی بەخۆ وە گرتووە. من بەراستی باوڕم وایە کە دادپەروەری سەرچاوەی پاکی ئیسلامە. کاتێکە هاوپەیوەندی جڤاکیم لەسەرانسەری وڵاتدا رێکخست، ئەوکاتەی کەشۆڕشی سپی ئێمە مافو مۆڵەتە تایبەتیەکانی هەڵوەشاندەوەو دابەشکردنی دووبارەی سروەتو سامانی باشترکرد، هەنگاو بەهەنگاو لەپەیامی روونی قورئان پەیرەویم کرد.

لە روانگەی منەوە، بیروباوڕی مەزهەبی کاکڵەو کرۆکی ژیانی مەعنەوی کۆمەڵگەیەو بەبێ ئەوەش هەمووکۆمەڵگەکان هەرچەند لەرووی ئابووریشەوە پێشکەوتووبن رێ ون دەکەنو هاوسەنگییان تێکدەچێت. بیروبڕوای راستەقینە باشترین پاڵپشتە بۆرەوشت ساغیو هێزی دەروونییو لەهەمبەرگیروگرفتەکانی ژیاندا باشتر مرۆڤ دەپارێزێتو، بۆهەر نەتەوەیەک بەهێزترین پاسەوانی دەروونیی

دادەنێت. هیچ مەزهەبێك نییە کەبەپێی ئەوکۆمەڵگەیەك بتوانێت بڵێت کەخۆی لەبەندوداوی باوڕ رزگارکردبێت و پارێزراوبێت. ئەو هەولاّنەی کەتائێستا بۆ رزگاری هەندێ لە نەتەوەکان لەکۆت وبەندی باوڕ لە گۆڕێدا بوو. هەموویان بێ ئاکام ماونەتەوە.

خەڵکی ئێمە خوشبەختی ئەوەیان هەبووە کەلەژێر دروشمەکانی یەکێك لە پێشکەوتووترین بنەماکانی مەزهەبی دا ژیان بکەن: مەبەستم بنەما پیرۆزەکانی ئیسلامە کەلەهەر قۆناغێکی پێشکەوتنی تاکەکەسی و جڤاکی دا، رێگەی پێشکەوتن نیشان دەدات. تەواوی ئەو کەسانەی کە بەشداریی شۆڕشی ئێمەیان کردو باوڕیان پێی بوو بەراستی دەتوانن لەم راستییەی کەئەو شۆڕشە لەناوەرۆکی ئیسلامەوەئیلهامی گرتبوو هەست بەشانازی بکەن.

خۆزگەو ئارەزووی من بۆ برەوپێدانی ئەم ئایینە لەناو میللەتەکەماندا تێکەڵ بەهیچ جۆرە دژایەتییێك بەرامبەر بەئایینەکانی دیکە نەبووە. بەڵکو بەپێچەوانە، مێژوونووسان رۆژێك ناچاردەبن ئەم راستییە قەبووڵ بکەن کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی پاشایەتی کردنی من نەرمونیانی و لێبوردەیی بوو. لە سەردەمی کورشەوە، ئێران بەردەوام پەناگە بووە مەگەر لەسەردەمانی ئاژاوەو پشێویەکاندا کەهێزو دەسەلاّتی ناوەندی لەبەرامبەر تاقمی جۆراوجۆردا لاواز دەبوو. ئەمڕۆش هەرئەم بارودۆخە پێشهاتووە.

ئێمە بەرامبەر بە هەموو ئەوکەسانەی کەلەم ولاّتەدا ژیاون و لەئایینی دیکە پەیڕەوییان کردوە ئەوپەڕی رێزمان لەبەرچاو گرت، لەبەرئەوەی ئەوان بەشێك بوون لەکۆمەڵگەی ئێران و هەموئایینەکانیش جێگای رێزن. بەلاّم ئێمە کۆمەڵگەیەك بەرێ ون کردوو ولادەر دادەنێین کەلەباوڕی ئایینی خۆی وازی هێنابێت و لەگەڵ هەموو ئەوشتانەی کەجێگای رێزوخۆشەویستی ئێمەن و، لەگەڵ هەموو ئەوشتانەی کە ئێمە بەوپەڕی توانا مانەوە پارێزگاری و بەرگریمان لێکردەوە، شەڕدەکات.

# فەسڵی ١٦

## بەرەنگاری لەگەڵ ئاوسان و قازانج پەرستی و گەندەڵی

هەرکە بەرژەوەندی گشتیم لەپێش بەرژەوەندی تایبەتیەوە دانا، کەسانێکی بەرچاو لەناو خەڵکدا دژایەتی کردنی منیان دەسپێکرد. ئەم کارە ساڵانێك پێش لەیەکگرتنی سوورو ڕەش بوو کەبووە هۆی ئەوەی یەکپارچەیی وڵات لەمەترسی بکەوێت.

لە بەرنامەی جێبەجێ کردنی شۆڕشی سپی دا دووئامانج لەبەرچاو گیرابوو کەگەیشتن بەو ئامانجانە کاریگەری لەسەرباجگران و ئەوکەسانەی دادەنا کەپارەی پێویستیان نەبوو و لەرێگای چەکەوە خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون. لای من روون بوو کە هەڵمەت بردن بۆئەوکەسانە، هەڵمەتە بۆسەرلایەنە بە هێزەکان.

لەبەرئەوە خاوەنی سامانێکی زۆر – و سەرئەنجام دەسڕۆیشتوویی زۆر– بوون، جگە لەکۆکردنەوەی سروەت و سامانی زۆر بیریان لەهیچ شتێکی تر نەدەکردەوە وچۆنیەتی بەدەست هێنانی ئەم ماڵەش بەلایانەوە گرنگ نەبوو. ئەم دووئامانجە لەخاڵەکانی ١٤و ١٩ی شۆڕشی سپی ئێمەدا پێناسەکرابوو. ئەم دووبنەمایە لەلایەك پەیوەندی بە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئاوسان و قازانجپەرستییەوە هەبوو و لەلایەکی تر بەرەنگاری لەگەڵ گەندەڵی و سەرچاوەکانی. لەپاڵ چاکسازی کردن لە

بواری زەوی‌و زارو ئازادی ژنان‌و بەشداربوونی کرێکاران لەقازانجی کارگەکاندا، ئەم دووبنەمایە بوو کەبەتایبەت بوو بەهۆی ئەوەی کەدوژمنانی میللەت لەدژی من یەکبگرن.

خاڵی ١٤ (راگەیەنراو لەئاگۆستی ١٩٧٥دا) پەیوەندی لەگەڵ جێگیرکردنی نرخەکان‌و بەرەنگاری لەگەڵ ئاوسانی ساختەدا هەبوو وئامانج لەم کارەش دابین بوونی بەرژەوەندی بەکارهێنەکان بوو. برەوپێدانی ئەم بنەمایە بۆ لەناوبردنی ئاوسان‌و پێشگیری لە بەرزبوونەوەی خێرای تێچووی ژیان پێویستییێکی بێ ئەملاوئەولابوو . خەرجی ژیان لەچرکەساتێکەوە کە تێکڕای داهات بەرزبوونەوەی بەخۆوەبینی (لەساڵێکدا٤٠٪ زیادی کرد) پێش بینی دەکراو بەرزبوونەوەی ئاستی ژیانیش، بەرزبوونەوەی ئاستی بەکارهێنان‌و سەرئەنجام بەرزبوونەوەی بڕی هاوردەکردنی بەدوای خۆیدا هێنا. هەڵبەت بازرگانیکردنێکی قازانجپەرستانە لەم نێوەدا بەرچاوبوو.

## هەڵاوسانی مەترسیدار:

لەگەڵ ئەوەی کەئاستی نرخەکان لەسەرەوە بوو، ئاوسانی سەرچاوە گرتوو لەم گرانییە – ئاوسانی ٢٠٪ – بۆ ئابووری‌و هاوسەنگی کۆمەڵایەتی مان مەترسیداربوو. ئەویاسایانەی واهەبوون بۆپێشگیری لە بەرزبوونەوەی نرخەکان بەس نەبوو.

لێرەدا پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کەلەزۆرێك لەوڵاتانی رۆژئاوایی دا. قازانج پەرستی بێ سنوور، مامەڵەکردنی بێ پارەو بەچەك، قۆرخکردنی ماددەخاوەکان، زۆربوونی دەڵاڵەکان‌و پێشبڕکێیەکی پیس لەنێوان هەقدەست‌و نرخەکاندا، هۆکارێکی شوێن دانەربووە لەبەرزبوونە بەردەوامی هەڵاوساندا. هەر ئەم شتە خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکە خاوەنی بایەخێکی بنچینەیی‌و مەزنی وەهایە کە هەڕەشەی لێك هەڵوەشان لەو دیوی دونیای کۆمۆنیست دەکات.

لە ١٩٧٥وە تا سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ تا رادەیەك پێش بە هەڵاوسان لەئێراندا گیرا. دابەزینی نرخی خەرجی ژیان بە رێژەی لە ٥٪ و وەستانی بەرزبوونەوەی قەبارەی ئەوپارەی کە دەستاودەست دەکرا، بێ ئەوەی کە ببێتە هۆی دابەزاندنی گەشەی ئابووری، یارمەتی پێشگیری لە هەڵاوسانی دا. بەڵام لە ساڵی ١٩٧٧ دا نرخی پێداویستیەسەرەکییەکان دیسان بەرز بووەوە. یاساو رێسای سەرانسەریو ناوچەییو شارەوانییەکانو هەروەها رێنماییەکانی پەیوەندیدار بەدیاری کردنی نرخو جێگیرکردنی نرخەکان لەبەرچاو نەدەگیران. لە خۆڕایی هەوڵماندا ویژدانی کۆمەڵایەتی کاربرایەتیە گەورەکانی تایبەت بە فرۆشتنی خواردەمەنیو پێداویستییەسەرەکییەکانی رۆژانە لە خەو هەستێنین. ئەوجا بۆ دەسبەسەراگرتنی نرخەکان داوای یارمەتیمان لەخوێندکاران کردو ئەمەش هەڵەیەکی گەورە بوو.

سەرەڕای ئەم هەوڵانە، نرخەکان روویان لەزیادبوون نا. چونکە کردەوەی توند ڕەوانەی هەندێ لە خوێندکارانی چاودێر، لەگەڵ هەڕەشەو گوڕەشەی بەڕێکەوتو بێ ئاگاییان لەراستیەکانی بازرگانی زۆرێك لە دووکاندارانی بێزارکرد. ئەم دووکاندارانە لەلایەك گیرۆدەی فرۆشگا گەورەکان بوون کە بەردەوام داوای نرخی زیاتریان بۆ کاڵاکانیان دەکردو لەلایەکی تر گیریان بەدەستی ئەوگەنجە تووڕەو بیانوگرانە کرد کە وردەفرۆشەکانیان ناچارکرد شتومەکەکانیان بە زەرەر بفرۆشن.

## سزای قورسو ڕەوا:

هەندێ لەبازرگانانی بازار بەخەیاڵی ئەوەی کە زوڵمیان لێکراوە بیانووێکیان بۆ پڕۆپاگەندەی ژەهراوی لەدژی خاڵی ١٤ پەیداکرد.

بۆ سزادانی سەرپێچی کارانی خاڵی ١٤ ، دادگای تایبەت دامەزرا کە بڕیارەکانیان بڕیاری کۆتاییو پێداچوونەوەی تیانەدەکرا. تەنیا لەمانگەکانی ئاگۆستو سپتەمبەردا، هەشت هەزارکەس لەوانەی کەیاساکانی دژی قۆرخکردنو قازانج

پەرستیان پێ شێل کردبوو سزادران. بڕیارەکانی دادگا قورس و قایم بەلأم بەزۆری دادپەروەرانە بوو. هەموو هەوڵی ئێمە ئەوە بوو کەزەبرێك لەگەورە سەرپێچی کاران بدەین و لەئاستی خوارەوشدا بۆنموونە تەنیا چەند کەسێك سزابدەین. خاوەن کارگەکان و فرۆشگەزنجیرەییەکان بەقورسی سزادران. مۆڵەتی کارکردنی هەندێ کەس دەستی بەسەرداگیراو هەندێ کەسیش خرایە بەندی خانە.

کۆمپانیا نێونەتەوەییەکانی بێگانە، بەرپرسانی یەکیەتیە پیشەییەکان، ژوورەکانی بازرگانی، شارەوانەکان و فەرمانبەرانی پلەبەرز سزادران. دەست بەسەر بەملیۆن تەن کالأ و شتومەکدا گیرا کە بەمەبەستی قازانجپەرستی هەڵگیرابوون و بەونرخانەی کەیاسا دیاری کردبوو فرۆشران. هاوکات، رێساورێنمایی نوێ بۆچاودێری کردن بەسەر بازاردا دەرکرا. بەلأم لەگەڵ ئەمانەشدا، بەو پێیەی کەگوتم، ئەنجامی کۆتایی نەرێنی بوو.

## بڕیاری ئاشکراکردنی سروەت و سامانی فەرمانبەرانی پایەبەرز:

خالی نۆزدەیەم (دوایین خاڵ کەلەسالی ١٩٧٧دا راگەیەنرا) تەواوکەری خالی چواردەیەم بوو ودەبوو هۆی ئەوەی کە زنجیرەیەك بڕیار جێبەجێ بکرێت هەتا کۆمەڵگامان لەبەرامبەر هەرجۆرە کەڵکی خراپ وەرگرتنێك دا بپارێزرێت. لەوانە خراپ سوودوەرگرتنی ئابووری لەرێگای برادەرایەتیەوە کە یەکێك لەبەلأگەورەکانی ناو هەموو دزێویەکان دادەنراو دەبوو بەرەنگاری ببینەوە.

لەوەبەدوا بۆ وەرگرتنی پلەیەکی بالأی دەوڵەتی، پێویست بوو کە وەزیران و پارێزگاران و فەرمانبەرانی پلەبەرز و شارەوانە کان و هاوچەشنی ئەمانە، سروەت و سامانی خۆیان و هاوسەرو منداڵانی کەم تەمەنیان ئاشکرابکەن. ئەو ماڵ و سامانەی کەبەشێوەی پشك هەیانبوو یان دەبوو بیگۆڕن بۆ چەکی قەرزی خەزێنە (بە سوودی لە ١٣٪ دوای باج لەسەردانان) یان دەبوو لەو بانك و کۆمپانیا و

ریكخراوانــەی دا كەدەوڵــەت دەسنیــشانی كردبــوو دابنرێــت. ئــەم بارودۆخــەش تائەوكاتەی كەلەو پێشە دەوڵەتیەدا خزمەتیان دەكرد بەردەوام دەبوو.

بەرەنگاربوونــەوەی گەنــدەڵیش لــەم چوارچــێوەیەدا جێــی دەگــرت و ئامانجیــشی ئــەوەبوو كــە بــەرەنگاری لەگــەڵ گەنــدەڵی دا، بەشــێوەی یــەكێك لــە كۆڵەكــەكانی تــەكووزی كۆمەڵایــەتی و مەعنــەوی لەئێرانــدا جێبكــەوێت. بەدڵنیاییــەوە دەتــوانین بڵێین كە ئەم خاڵە تــەنیا ئەوداهاتانــەی دەخستەمەترسیەوە كەنایاســایی بوونیان وەك رۆژ روون بــوو. بــەهیچ جــۆر نــەمان دەویــست بــەرەنگاری ئــەو هاوولاتیانــەی ببینەوە كەبەلەبەر چاوگرتنی یاساو بەهۆی توانایی و لێهاتوویی و زەحمەتكێشانی خۆیانەوە دەوڵەمەند ببوونەوە. بەڵكو بەپێچەوانە! هەركەس بێ فرِوفێڵ دەوڵەمەند ببــووەوەو باجــەكانی دەداو یارمــەتی بەگەشــەی ئــابووری نیــشتمانەكەی دەدا، نموونەیەكی باش بوو بۆ هاوولاتیانی دیكە.

نــەریتی "بەرژەوەنــدی خــوازی" كــە لەســەربنەمای لەبەرچــاوگرتنی خزمایــەتی و برادەرایــەتی دامــەزرابوو، زیــانی زۆری بــەولات گەیانــدبوو كــە دەبووبڕۆخێــت و ریشەكێش بكرێت. دەبوو هەمووكەس تێبگەیەنرێت كەبەهیچ كەسێك لــە پیشەی دەوڵەتی یان كاروباری پارێزگاكانــدا لەســەربنەمای خزمایــەتی یــان دۆســتایەتی و لەبــەرهاورێی هاورێیــانی پیــشەیەك نادرێــت كەلەورێگایــەوە دەوڵەمەنــد ببێتــەوە، مەگەر بۆخزمەت كردن و خزمەتگوزاری لەرێی راستییەوە. لە گەل ئەوەشدا هەڵبەت پێویست بوو كە بە بەرپرسانی باڵای دەوڵەتی – و ئەوانی تریش– مووچەیەكی پێویست بدرێت بۆئەوەی بتوانن ژیانێكی شیاو وگونجاو لەگەڵ پلەوپایەكانیاندا هەبێت.

مانایــەك كــەمن لەدیموكراسی تێگەیشتبووم بــەمجۆرە بــوو ، هەرلەســەرئەم رێبازە بووكەبنەماكانی شۆرِشی ئێمە، لەسەربنەمای یەكسانی لە مافدا، بۆهــەموو كەسێك بەبێ جیاوازی مافی كۆمەڵایــەتی و ئابووری و ئــەركی وەك یــەكی زەمانــەت دەكرد و هەرگیز مەبەستمان فریودانی خەڵك نەبوو، بــەڵكو هــەنگاوێك بــوو بــەرەو پاراستنی بەرژەوەندی خەڵك.

من باوەڕم وابوو کە جێبەجێ کردنی بەردەوامو ڕێكوپێکی ئەم نۆزدەخاڵە دەیتوانی بەرەبەرە فەرمانبەرانی دەوڵەتو بەرپرسانی باڵای وڵات بکات بەخاوەنی ڕێزو شکۆیەکی مەزنی مەعنەویو ئەوان لەپێش چاوی خەڵکانی تردا بەنموونە نیشان بدات. ڕەنگە دەمان توانی لەم ڕێگایەوە وبەمجۆرە گەندەڵی ڕیشەکێش بکەین.

## گەندەڵی بێ هۆکارەکانی دروست نابێت:

جیالەهەرجۆرە باسو وتووێژێك سەبارەت بەراستییەکانی بوونی گەندەڵی لەدونیای بازرگانی دا، حەزدەکەم ئەم خاڵە روون بکەمەوە کە سەرهەڵدانی گەندەڵی گرێدراوی بوونی هۆکارەکانیەتیو تەنیا ئێرانییەکانیش نەبوون کە دەبوونە هۆکاری گەندەڵی. لەراستیدا دەبێت دووپاتی بکەمەوە، بەپێچەوانەی ئەوشتەی لەم بارەوە وتراوە و نووسراوە، گەندەڵی تەنیا تایبەت نییە بەمامەڵە دەوڵەتیەکان. لەبەرئەوە لانی کەم دووجار بەتوندی کاردانەوەی خۆم نیشان داو فرۆشیارانی دەرەکیم لەوەئاگادار کردەوە کە: وڵاتی ئێران ئەو شوێنەنییە کە بکرێ شێوازەباوەکانی رۆژئاوای تێدا بەکار بێنیت.

یەکێك لەم کاردانەوانە تایبەت دەبوو بەمامەڵەیەك لەگەڵ کۆمپانیایەکی نێونەتەوەیی دا کەبڕیاربوو تۆڕێکی تەلەفوونی ڕێگای دوور لەئێران دا وەگەڕبخات. بۆمان دەرکەوت کەنوێنەرانی ئێمە بڕی ئەو دوازدەملیۆن دۆلارەیان دزیوە کە دەبوو بدرێت بەدەلاڵە ئێرانییەکان. یانێ زۆر بەئاسانی هەڵیان گرتبوو ولەناوخۆیاندا دابەشیان کردبوو. دەوڵەتی ئێران بە پێداگرییەوە داوای کرد کە پارەکە بگەڕێتەوە بۆخەزێنەی دەوڵەتو ئەم کارەش کرا.

سەبارەت بەکڕینەکانی سوپاش هەرئەم شێوازە توندوتۆڵەمان بەکار دەهێنا. لە سەرەتادا داوامان لەو وڵاتانەی دەکرد کەچەکیان پێمان دەفرۆشت بۆئەوەی بەهای چەکەکانیان هەر بەوجۆرەی کەبەسوپاو هێزی دەریاییو ئاسمانی خۆیان

دەفرۆشت بۆئێمەش هەربەو نرخەدایبنێن. لەبەر ئەوە بەهەرحاڵ پێشنیارەکانی ئێمە لەگەڵ ئەوەی کە بازارگەرمییێکی زیاتری بۆ کارگەکانی بەرهەم هێنانی چەك وچۆڵ پێکدەهێنا، یارمەتییێکی گەورەش بوو بۆئەو وڵاتانەی کەهەناردەکاری چەك وچۆڵ بوون.

پێشنیاری کڕینی هەشتافڕۆکەی ئێف ١٤مان بەکارگەی گرۆمێن لەئەمریکا داو سەرئەنجام بەسەرسووڕمانەوە روون بووەوە کە ئەم کۆمپانیایە دەیەوێت بڕی بیست وهەشت ملیۆن دۆلار بدات بە دووبرا بەناوی "لاوی" کەلەم مامەڵەیەدا هیچ دەورێکیان نەبوو. بێ چەن و چۆنی داوامان لەگرۆمێن کرد کەئەو ٢٨ ملیۆن دۆلارە بخاتە خەزێنەی دەوڵەت و ئەوانیش لەجیاتی ئەم بڕەپارەیە کەرەستەی پێویست یان بەئێمەدا. لەبەرئەوەی کەئێمە فڕۆکەی ئێف چواردەمان بە "نرخی دەوڵەتی" کڕیبو وفرۆشتنی ئەم هەشتا فڕۆکەش ڕێگای بە گرۆمێن دەدا کەبڕی ٢٨ملیۆن دۆلار بەناڕەوا ببەخشێت، سەرم سووڕمابوو کە کارگەی گرۆمێن بۆ فرۆشتنی ٢٦٠ فڕۆکەی لەم جۆرە بەهێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکان چی کردبوو.

ئەوکاتەش کە ویستمان بۆ دروستکردنی تۆڕی مێترۆ لەگەڵ فەرەنسیەکاندا مامەڵە بکەین هەر ئەم ڕێگەمان گرتەپێش و هۆشداریمان دایە نوێنەرانمان کە :" هیچ جۆرە کۆمسیۆنێك لەگۆڕێدا نییە" و ئەوانیش قەبووڵیان کرد.

لەکاروباری بازرگانی لەنێوان وڵاتاندا، شێوازێکی دروستمان گرتبووە پێش. هیچ مامەڵەیەکی ناڕاست و گوماناوی لەگۆڕێدا نەبوو. لەم بارەوە حەزدەکەم مەتەڵێك بەبیری ڕۆژئاواییەکان بێنمەوە کەبەزۆری خۆیان پشتی پێ دەبەستن و بڵێم:" کوێرەی خۆت مەبەو چاوساغی خەڵکی".

کاتێك گەندەڵی پەرەی سەند نەتەنیا لەئاستی دەوڵەت دابوو بەڵکو داوێنی یەك بەیەکی میللەتیشی گرتەوە. هەرکات ئەم کەسانە لەفەرمانبەرانی دەوڵەت بوون – کە پلەوپایەی خۆیان بۆ قازانجپەرستی بەکاردەهێنا – بێ هیچ جۆرە دوودڵییێك بەتوندی سزایانم دەدا. لەناو بەرپرسانی باڵای دەوڵەتدا هەن کەسانێك کە هۆکاری تەواویان بۆ بیرهاتنەوەی ئەم رەفتارەی من لا هەیە.

جیالەوشتەی کە وتمو جێبەجێم کرد، بەلاّم پێویستە بلّێم کە گەندەلّی لە سروشتی مرۆڤدایە. ئەم دیاردەیە گەرچی لە رۆژهەلاّتی ئەورووپاشدا وەك ولاّتانی رۆژئاوایی دەبینرێت بەلاّم لە راستیدا لە ولاّتانی رۆژهەلاّتی ئەورووپادا، کەسێکی دەسڕۆیشتوو نە دەتوانێت بیست ملیۆن فرانك لەسەرمێزی قوماری گازینۆیەك دابنێتو نەدەتوانێت وەك هەندێ لە نەیارانی من، ڤیلایەکی جوانو رازاوەی هەبێتو مەلەوانگەی تێدابێت. گەندەلّی لەگەلّ ستانداری ژیاندا پەیوەندی هەیە.



# فەسڵی ١٧

## بونیادی پەهلەوی و سامانی من

بەپێی ئەوەی کە مامۆستا نمونەکەی لەسەر رادەنووسێت بۆ ئەوەی فێرخواز لەرووی بنووسێت، بە پێویستی دەزانم تۆزێك دەربارەی بونیادی پەهلەویو سروەتو سامانی خۆم قسەبکەم، کەئەگەر بەپێی بابەتە بێ نێوەرۆكو هەڵەشەکارانەکانی رۆژنامە ئەمریکییەکان بێت، ئەوا ئەم سروەتو سامانەزۆرە. بەڵام راستیەکەی شتێکی دیکەیە.

لەساڵی ١٩٥٨دا بونیادی پەهلەویم دامەزراندو کۆمەڵێك ئەرکی فەرهەنگیو چاکیم خستەئەستۆی. لەساڵی ١٩٦١دا ئەم بونیادەم بەفەرمی کرد بە خاوەنی پێکهاتەیەکی بەڕێوەبەریو کەرەستەی پێویستیشم بۆ دابین کرد بۆئەوەی بتوانێت ئەرکەکانی خۆی بەباشی ئەنجام بدات. ئەم پێکهاتەیە چاودێری دەکرد بەسەر سروەتو سامانی تایبەتیو زەویو ماڵو موڵكو هۆتێلەکانوپشکەکانی دامەزراوەگەلی وەك بانکی ئاوەدانیو بیمەگشتی دا. ئەم بونیادە لەنیویۆرکدا بینایەکی گەورەی هەبوو کەبەخۆشییەوە داهاتی بەکرێدانەکەی بەتەنیا بەشی بەڕێوەبردنی ئەم بونیادەی دەکرد.

من کەلەپلەوپایەی خۆم وەك سەرۆکی فەخری دەستەی بەڕێوەبەری خوشحاڵ بووم، بەڕێوەبەرێکی گشتیو دەستەیەکی بەڕێوەبەریم بۆ بەڕێوەبردنی بونیاد

دەسنیشان کرد. ئەم دەستەیەش بۆخۆی لەژێرچاودێری کومسیۆنێکی تایبەت دابوو کەپێکهاتبوو لەسەرۆکی وەزیران، سەرۆکی ئەنجومەنی پیران و سەرۆکی ئەنجومەنی شورای میللی و سەرۆکی دیوانی بەرزی وڵات و چوارکەسایەتی دیکە کەلەبەرسیفاتی ئەخلاقی و مەعنەوییان جێگای ڕێزبوون. هەمووساڵێك ئەم کومیسیۆنە ڕاپۆرتێکی لەسەر کاروچالاکییەکانی بونیاد ئامادەدەکرد. لەم ڕاپۆرتەدا کاروبار وچالاکییەکانی ئابووری و بەڕێوەبردن دەکەوتە بەرباس و سەرئەنجام لە ڕۆژنامەگشتییەکاندا چاپ و بڵاو دەکرایەوە.

## ١٣٠٠٠ قەرزی شەرافەتی بە خوێندکاران:

بونیاد، کە چوارچێوەیەکی بەرینی لەخۆگرتبوو، زیاتر لەهەمووشتێك، دەسەڵات و توانایی خۆی لەبواری فەرهەنگی دا وەگەڕخست و خوێندکارانی زانکۆ بەکارهێنەرانی سەرەکی ئەم بونیادە بوون. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧دا بەپێی ئامار ١٣٠٠٠ خوێندکار لەوبنەماڵانەی کەماڤ خۆیان بوو، بەوەرگرتنی قەرزی شەرافەتی توانییان خوێندنی خۆیان چ لەناوخۆو چ لە دەرەوەی وڵاتدا تەواوبکەن. هەرچەند کە بوورسی دەوڵەتی بۆ خوێندن زۆر بوو بەڵام بوورسەکانی بونیادی پەهلەوی لەریزبەندی هەڵکەوتووانی ڕاستەقینەدا ئەژماردەکران.

یەکێك لەئەلقەگرنگەکانی بونیاد، دەزگای وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی کتێب بوو. تاساڵی ١٩٧٧ ئەم دەزگایە زیاتر لە٥٠٠ پەرتووکی لە بواری کۆمەڵناسی، ئایین، ئەدەب و مێژوو کەلەروانگەی نێونەتەوەییەوە بەبایەخ بوون و هەروەها ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی خۆمان کەنایاب بوون بڵاوکردەوە. هەموو ساڵێك لەکاتی نەورۆزدا بەباشترین کتێبی ساڵ (وەرگێڕاو نووسراو) کە لەلایەن لیژنەیەکی ئەکادیمیەوە هەڵدەبژێرا خەڵاتم دەدا. هەر لەو کاتەدا خەڵات بۆقوتابیانی سەرکەوتووی دەسکۆرتیش دەنێردرا.

جیالـە یارمـەتی دانـی ئـابووری بەناوەنـدەکانی چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ئـایینی کەلەگەڵ گیروگرفتی ئابووری بەرەو ڕووبوون، تێچووی پاراستن و نۆژەنکردنەوەی هەندێ لەمزگەوتـەکان و دابین کردنی پێداویستی ڕووناکی و گـەرمی لەقوتابخانـە ئایینیەکانـدا – بەتایبـەت لـەقۆم دا– بە هـۆی بونیادەوە جێبـەجێ دەبوو. دڵنیـام کەهیچ کەس ئەم خزمەتگوزارییانە لەبیرناکات.

## خانووسازی:

پێویـستە ئـەوەی لـێ زیادبکـەم کەهەنـدێ لەوڕێکخراوانـەی کەشـابانوو بـۆ بەرژەوەندی گشتی دایمەزراندبوو لە یارمەتییـەکانی بونیـادی پەهلـەوی کـەڵکیان وەردەگرت. هەروەها بونیاد بڕیاریداکە خانووسـازی بکات بۆ ئەوەی بە نرخێکی گونجـاو بـەکرێی بـدات تالـەم ڕێگایـەوە بتوانێـت قـازانج پەرسـتان ناچـاربکات نرخەکانیان دابەزێنن. تا ساڵی ١٩٧٧ نرخی کرێی خانوویەکی سێ چوار ژووری لەتارانـدا یەکسان بووبـە ٣–٤ هـەزار فرانـك لەمانگـدا. بونیـاد وەك یەکـەم قۆنـاغ، دروستکردنی شـەش هـەزار باڵەخانـەی بەکرێی مانگانـەی کەمـەوە لەئەستۆگرت و بڕیاربوو قۆناغەکانی دواتریش بەپێی دەسکەوتنی خشت و چیمەنتۆ یەك لـەدوای یەك جێبەجێ بکرێت.

## سامانی تایبەتی من:

نەتـەنیا بۆخـۆم سـوودم لـەبونیادی پەهلـەوی نـەدەبرد بـەڵکو لـەنۆامبری ١٩٧٨دا، بڕیارم دا سروەت و سامانی خۆم لەئێراندا ببەخشم بەبونیادی پەهلەوی. ئایا کات بۆوەها ئیشێك گونجاو بوو؟ بەڕاستی نازانم و بچووکترین بایەخیشی پێنادەم. مـن لەرووی باوڕی خۆمەوە ئەم ئیشەم کرد و ئیتر هۆکارێك بۆ بەداخ بوون نییە.

پێویستە ئەوەش زیادبکەم کە ئەم بەخشینە لایەنی تەرخانکردنی هەبوو. بۆئەوەی کە خوێنەری ڕۆژئاوایی لەبابەتەکە تێبگات پێویستە ڕوونی بکەمـەوە کەبەخشینی

لەم جۆرە نەدەگۆڕێت و نەدەگەڕێتەوە. ئەمە بەو مانایەیەکە بەڕێوبەرانی هەردامەزراوەیەک کەوەها ماڵوسامانێك دەکەوێتە ژێردەستیان تەنیا دەتوانن داهاتەکەی خەرجی ئەو مەبەست و ئامانجەی بکەن کە بەخشندەکە دیاری کردوە.
تائەوکاتەی کە لەئێران بووم هەرچەشنە سەرپێچییێك لەم بنەمایە بیریشی لێ نەدەکرایەوە. دڵنیانیم ئەو کەسانەی کە ئێستا لەئێران دەسەلاتیان بەدەستەوە گرتووە ئەم وردبینییەیان هەبێت و هێشتاش خەرجی خوێندنی ئەو لاوە ئێرانییانەی بدەن کەلە دەرەوەی وڵات سەرقاڵی خوێندنن .
لێرەدا ئاماژە بەمەتەڵێکی باودەکەم کە دەڵێت: مرۆڤ تەنیا دەتوانێت خۆی فریوبدات. ئەم ڕێسایە تەنانەت لە کاروباری ئایینیش دا وەڕاست دەگەڕێت.
چونکە بەهەرحاڵ، ئەگەر بڕیاربێت ڕۆژێك بگەڕێمەوە بۆئێران، لەبەر تەرخانکردنی ماڵوسامانەکەم ناچارم ئاستی ژیانم دابەزێنم و ئەگەر لەسەرتەختی پاشایش دەمامەوە دەبوو هەرئەم ئیشەبکەم. بەسەرنجدان بەوەی کەبۆخۆم بڕێ لەخەرجیەکانی دەربارم لەئەستۆ گرتبووو ئیتر نەمدەتوانی بەردەوام بم مەگەرئەوەی کە بوودجەی دەوڵەتی دەرباریان زیاتردەکرد.
لەبەرئەوەی پێم باش بوو لەجیاتی ئەوەی کەخۆم بخەمە بەرئاماژەی ناراستەوخۆ وهێرشی ناجۆامێرانە، ئیش بکەم، سێ یاچوارمانگ پێش لەتەرخانکردنی ماڵو سامانی خۆم بۆبونیادی پەهلەوی فەرمانێکم" دەربارەی ڕەفتاری ئەخلاقی بنەماڵەی پاشا" دەرکرد.
بە پێی ئەم فەرمانە هەمووسکالایەك لەدژی ئەندامانی بنەماڵەی ئێمەدەبوو بنێردرێت بۆ کومیسیۆنیکی پێکهاتوو لەسێ دادوەر کەلەلایەن وەزیری دادەوە دەسنیشان کرابوون. ئەم دادوەرانە لەبەر دەسەلاتی تایبەتیان، بۆچوونیان راست و دروست بوو وبڕیارەکانیان پێداچوونەوەی تێدانەبوو. سەبارەت بەم فەرمانە، کەئەندامانی بنەماڵەی ناچاردەکرد لەدادگا ئاساییەکاندا ئامادەبن، بە زۆری بەمنیان دەگوت چەقۆم داوەتە دەست خراپەکارێکی تووڕە و شەڕاشۆوە.
دیسانیش مێژوو داوەری دەکات.

# فەسڵی ١٨

# بەرەو شارستانیەتی مەزن

لە ئیشەکانی من بەزۆری بە دروستی رەخنەگیراوە. بەڵام ئەمڕۆ کەمن ئەو چاودێرانەی کە بۆ هەڵسەنگاندنی ئاشکرای ئەو گیروگرفتانەی کە لییان تێپەریم بیانەوێت خۆیان بەزەحمەت بخەن‌و، کەمترن ئەو کەسانەی کەلەخۆیان بپرسن ئایا ئێران بەبێ ئەو هەولانەی کە بۆپاراستنی هەبوونی داومانە دەیتوانی زیندوو بمێنێتەوە.

بەسەقامگیرکردنی سەربەخۆیی‌و یەکپارچەیی ولات لە ساڵەکانی ٤٦-١٩٤٥دا، توانیمان لەساڵی ١٩٥٣دا ئێران لەنزیك بوونەوەلە بشێوی‌و ئاڵۆزی رزگاربکەین. سەرئەنجام سەروسامانمان بە ئابووری ولات بەخشی، خەباتمان تا بەدەستهێنانی خاوەنداریێتی تەواو وبێ ئەملاو ئەولای سەرچاوەنەوتیەکانمان درێژەپێداو لەساڵی ١٩٦٣ بەدوا خەڵکی ولاتەکەمان – بەرزامەندی بەرفراوانی ئەوان– خستە سەررێگای نیازپاکی‌و پێشکەوتن.

## رێبازی توندڕەوانەی مارکسیزمی ئیسلامی:

بەرەو شارستانیەتی مەزن ناوی پەرتووکێکە کەلەساڵی ١٩٧٨دا بەیادی سەدەمین ساڵی لەدایك بوونی رەزاشای مەزن‌و بەیادی دامەزرێنەرو رێبەری ئێرانی نوێ

لەتاراندا بڵاوم کردەوە. لەم بەرهەمەدا بەپەنابردن بۆنیازپاکی و نیشتمان پەرەستی هاونیشتمانانم نەتەنیا تیرۆریزم، بەڵکو ئەوشتەش کەبەدژی تیرۆریزم ناسراوە، بەهەموو ئاسەوارێکی نەرێنییەوە، ئیدانە کراوە. تیرۆریزم و دژی تیرۆریزم لەرواڵەتدا ئامانجی هاوبەشیان هەیە: ئیفلیج کردنی هەموو پێشکەوتنەراستەقینەکانی کۆمەڵایەتی و لەناوبردنی کۆڵەکەکانی کۆمەڵگە. ئەمە راست حەزو ئارەزووە بۆلەناوبردن و وێرانکردن کەرێبازی توندرەوانەی مارکسیزمی "ئیسلامی" لەوەوە سەرچاوەدەگرێت. مرۆڤێکی ئیماندار ناتوانێت بیر لە پەیوەندی لەگەڵ کومۆنیزم دا بکاتەوە کە ئامانجێکە پێویستی بەحاشاکردن لەمەزهەب هەیە.

مارکس دەنووسێت : " پرۆلتاریای نوێی سازو ئامادە بەمارکسیزم، لەرێگای زانستییەوە، لەگەڵ رەش بیرکردنەوەی مەزهەبی دا دەجەنگێت و مرۆڤ لەباوڕ بەژیانی دوارۆژ رزگار دەکات... مەزهەب تلیاکی گەلانە." سوپاس بۆخوا کەهەموو مەلاکان پیلانگێرانی سیاسی نین.

کەسانێك لەوان دەناسم کەتەنیا یەك ئامانجی لەسەردایەو ئەویش خزمەتکردن بەخوایەو، تەنیا ئەرکێك بۆخۆی دەناسێت و ئەویش بەرزکردنەوەی لایەنی دەروونی کەسانێکە کەئیمانیان بەخواهەیە. خوایەك کە خاوەنی ئاسمانەکان (قورئان سوورەتی یازدەیەم). بەهەرحاڵ ئەمانە نەیانتوانی رێ لەسەرهەڵدانی تاقمێك بەناوی "مارکسیزمی ئیسلامی" بگرن کەبانگەشەیان دەکرد کومۆنیزم بەتەواوی خراپ نییەو تەنانەت "هەندێ لەئەندامانی ئەم رێبازەش" دەتوانێت "بەسوود" بێت. بەڵی، بەڵام بۆکێ؟

ئێستا چی بەسەر ئەوئیماندارانەدا هاتووەو دێت کەلەم یەککگرتنە رووخێنەرە دوورییان کرد؟ ژمارەیەك گۆشەگیری و خواپەرستییان هەڵبژاردوە و، چاکەخۆازی کەسانی تریش بوو بەهۆی ئەوەی کە گیرۆدەی دڵرەقیی "میلیشیای شۆڕشگێڕ" و بەزۆریش توندوتیژی دادگاکانی بەناوئیسلامی ببەن کەبێ ئەوەی داوەری بکەن بەناوی "خواو شۆڕشەوە" سزادەدەن. چۆن دەکرێت شۆڕشێك هاوکات هەم

کۆمۆنیستو هەم نیشانەی دەسەلاتی بەتواناکانو هەم ئیسلامیو هەم کشتگیربێت؟

ناکۆکییێک لەمەئاشکراو روونتر بیری لێ ناکرێتەوە. چۆن دەکرێ قسەکانی پێغەمبەرو یاساکانی خوا لەگەلٚ قسەی پروپووچی پرۆپاگەندەچیانێکی خۆسەرتێکەلٚ بکرێت کەلەرێگای هێزێن ماندوونەناسەوە لەدژی بنەما ئەخلاقیەکانی مرۆڤ شەردەکەن؟ ئێمەلەسەر دووریانێك بووینو دەبوو هەلٚبژێرین. من ئەورێگام هەلٚبژارد کەبەرەو بەرزایەکان دەرۆشتو دەگەشتە شوێنە دوورە دەستەکان. ئامۆژگاریو هۆشداریەکانمان کەلە ئەزموونی مرۆڤ و دامەزراوەکانی دەستی ئەوەوە سەرچاوەی دەگرت لەبەرچاو نەگیرا. لە بەرامبەردا رێگای نکوٚلی لێکردنو دەست تێکەلٚ کردن لەگەلٚ رێبازی جۆراوجۆری کۆمۆنیستیدا بەباشتر زانرا.

ئەو مەلایانەی کەلەگەلٚ میلیشیای خوانەناس دا دەستیان تێکەلٚ کردو قورسترین بەرپرسایەتیان لەئەستۆگرت، لەئێستادا ناچارن نرخێکی زیاتر بۆ شۆرش بدەن بۆئەوەی فریوکاریو دلٚرەقیو رووخێنەربوونی زیاتری خۆیان بە بەراورد لەگەلٚ هاوکەژاوەکانیان کەلەمەترسی ئەوەدان ببن بە بەندیو بارمتەی ئەمان، نیشان بدەن. رەنگە کەسێك لەخۆرا هاواربکاتو جنێوبدات، رەنگە لەسەرئەو باورە بێت کە دەتوانێت بساچێت یان نارەزایەتی دەرببرێتو پاشەکشێ بکات. بەلام هەرئەوەی کەیەکەم هەنگاوی نایە ئەم رێگا نەفرەتیە ئیتر گەرانەوەی بۆ نییە. ئیتر زۆردرەنگ بووە و، ئەم گرێ مەترسی دارە هەرگیز ناکرێتەوە. ئەو مەلایانەی کە ئێستا ساچاون، سبەی خۆیان بەتەنیا دەبیننەوە. لەبەرئەوەی کەیاسای مارکسیزم ئەوەی دەوێت سبەی ناچارن خۆبەدەستەوە بدەنو هیچ کەسێك بۆداکۆکی لەوان دەست هەلٚنابرێت. مێژوو تەنیا لەئەوان لەبەر ئەو تاوانانەی کە ئەنجامدانی سەپا بەسەریانداو ئەو بەرپرسایەتیە ترسناکەی کە "بەناوی خوا"وە خستیانە سەرشانی خۆیان یاددەکات. لەهەمووی خراپتریش ئەوەی کە: لە کۆتاییدا

مەزهەب دەبێتە ئامرازی دەستی میلیشیای خوانەناس، ئەویش بەناوی دەسەڵاتی خەڵکەوەو بەگوێرەی بنەماکانی کومۆنیزم.

## باری ئامادەیی بەردەوام:

بە دڵنیاییەوە ڕێگای گەیشتن بە شارستانیەتی مەزن بێ کەندوکۆسپ نەبوو و هیچکات من نەمگوتبوو کە بەئاسانی پێی دەگەین. چونکە ڕێگایەك بوو بەرەو هەوراز. ڕێگایەکی بەرەو ژوور کەکەس نەیدەزانی ئەوپەڕی کوێیە.

کەواتە شارستانیەتی مەزن چییە؟ شارستانیەتی مەزن ڕاست پێچەوانەی ئاراستەی ئەو بارودۆخە چەپەڵەیە کە حکوومەتی زۆرینەی خەڵكو کەسانی داشۆڕاو لەهەستی بەرپرسایەتی دەیانەوێت وڵات بەرەو ئەوەی ببەن. یەکەم جار هەوڵدانێکە بەرەوپێکەوەژیانو ئارامیو هەلو مەرجێك کە دەرفەتی کاروکۆشش دەدات بەخەڵك. میللەتێکی نوێخواز ڕێگا بەخۆی نادات هەتا بە پەیڕەوی لەئامۆژگارییەکانی فریو کارانێك کە لەگێروگرفتەکانی بەردەم خۆیانو ڕێگەی زاڵ بوون بەسەریاندا بچووکترین ئاگاییان نییە دەست لەتێکۆشانی بەکۆمەڵی خۆیان هەڵبگرن. هەر میللەتێكو لەسەروی هەموویانەوە میللەتی ئێران، بە هەڵکەوتەی جوگرافی تایبەتیانەوە، ئەگەر بیەوێت بەرەو شارستانیەتی راستەقینە بڕوات، پێویستە بەردەوام لەباری ئامادەییدا بێتو نەك هەڵبەت بەقسەی لنین لەباری "شۆڕشی بەردەوام" دا. هەموو میللەتێك خاوەنی ئەومافەو بێگومان ئەو ئەرکەیە کە بگاتە شارستانیەتی مەزن یان بۆی بگەڕێتەوە.

شارستانیەت بۆ خۆی پێویستە بە تەواوی لەگەڵ سروشتی خەڵکدا بگونجێت، لەبەر ئەوە تەنیا لێکدانەوەیەکە لەهەمان ئەو سروشتە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کەئێران تەنیا دەتوانێت بەدابو نەریتە گشتگیرەکانی بابو باپیرانی خۆی وەفادار بمێنێتەوە. ئەم دابو نەریتانە لەراستیدا هەمیشە لە تێکەڵی بەهاو بایەخە جۆراو جۆرەکان سەرچاوەی گرتوە. ڕۆحی تایبەتو پاکی ئێرانییەکانیش باشترین

بەرهەمی شارستانیەتەکانی دیکەی ڕاکێشاوە. خەڵك خۆیان بە هۆکارێکی جیاوازو دوورخراو لەدەسکەوتە ماددییەکانو داهێنانەکانی گەلانی دیکە دانانێن. کۆمەڵگەیەکی مرویی گۆشەگیر، کەلە دەروونەوە بەهۆی دابو نەریتی ڕۆژانەو دەمارگیرانەوە لەقاڵب درابێت، لەهەر ڕوانگەو مەبەستێکەوە کە سەیری بکەین تەنیا لەناوچوون چاوەڕێی دەکات. بەڵام لەشارستانیەتی مەزن دا، یەکەم جار، ماف هەڵبژاردن هەیە. لەم ڕووەوە بەردەوام تائەوجێگەی کە دەکرا، ڕامگەیاندووە کە خەڵکی ئێران دەبێت لەهەمان کاتدا کە لەگەڵانی دیکەوە فێردەبن، پێویستە خۆیان لەتووش بوون بە حاڵەتێن فەوتێنەر بپارێزن. ئەم گەلە هەمیشە لایەنە نکوڵی لێکراو نەرێنیەکانی بەناو "شارستانیەتی" کەلە دەروونی خۆیاندا هەڵگری تۆوی لەناوچوونو داڕمانە لەخۆی دوورخستوەتەوەو دیسان لەم کارە بەردەوام دەبێت. کۆمەڵگەیەك کە ڕۆحی خۆی لەدەست دەدات ئیتر ناتوانێت بمێنێتەوە. لەنیشتمانێکدا کەوەها کۆمەڵگەیەك ژیاوە، دیسانیش خەڵکێك هەردەژیت کە خۆیان هەر بەوناوە ناودەبەن، بەڵام ئەم ناوە ئیتر لە فریو زیاتر شتێکی تر نییە.

### ئا یادەکرا سەربکەوین؟

لەو کاتەدا ئاراستەکردنی خەڵکەکەم بەرەوشارستانیەتێکی مەزن ئاواتێك بوو کەلە ماوەی سی وحەوت ساڵ دەسەڵاتداریمدا لەدڵم دا ڕەگی دا کوتابوو. ئەمرۆ، دەڵێن کەبە تەواوی شکستم خواردوە. بەسە بارودۆخی ئێرانی پازدەساڵ پێش لەبەرچاوبگرین، بۆ ئەوەی بکرێ ڕاستگۆیانە بوترێت کە ڕێگایەکی دووروردرێژمان بڕیوە.

ئەنجامەکان پێشکەوتنی ئێران دەسەلمێنێت کەبەقسەی هەندێ کەس ڕەوتەکەی زۆر خێرابوو. لەسەرەتای شۆڕشی سپیەوە (١٩٦٣)، کۆی داهاتی گشتی وڵات لە ٣٤٠ملیۆنەوە بۆ ٥٦٨٢ملیۆن ڕیاڵ بەرزبووەوە.کە دەکرێ بڵێین تەنیا لەماوەی پازدەساڵ دا داهاتمان ١٦ هێندە زیادی کرد. قەبارەی پارەی پاشەکەوت کە

بەڵگەی پایەداربوونی ئابووری گشتییە، لە ٤٥ملیارەوە بۆ ١٥٠٩ملیار ریاڵ بەرزبووەوە.

نرخی ساڵانەی گەشەی ئابووری، کە ساڵانێك باترین پلەی لە دونیادا هەبوو، گەیشتە ١٣/٨٪ لەساڵی ١٩٧٨داو تێکڕای داهاتی ساڵانەی تاك لە ١٧٤ دۆلارەوە لە ساڵی ١٩٦٣ دا بەرزبووە وە بۆ ٢٥٤٠ دۆلار. وڵاتی ئێمە، کەتاساڵی ١٩٧٣ لە ریزبەندی وڵاتانی دەوڵەمەندی سندوقی دراوی نێونەتەوەیی دا جێگایەکی نەبوو لە ١٩٧٤ بەدوا پلەی دەیەمی بەدەست هێنا. ئەوکاتەی موسەدیق جڵەوی کاروباری وڵاتی لەدەست دابوو، بوودجەی ئێران ٣٠ملیار ریاڵ بوو، واتا نزیکەی ٤٠٠ملیۆن دۆلار. دوایین بوودجەی ئێمە ٥٧ملیاردۆلار بوو کەتەنیا ٢٠ملیاردۆلاری لە داهاتی نەوت دابین دەبوو و باقیەکەی لەرێگای باجی خەڵکێکەوە دابین دەبوو کە دەوڵەمەند ببوونەوە.

من توانیم مافێك دابین بکەم کە جووتیارانی زۆرێك لە وڵاتان پاش چەند سەدە ناڕەزایەتی دەربڕین بە دەستیان هێنابوو و هێشتا لەهەندێ لە وڵاتان دا و تەنانەت لە هەندێ لە وڵاتانی سۆسیالیستیشدا وەها مافێك نەبووە بەنسیوی جووتیاران. هەندێ لەو مافەیاساییانەی کە کرێکارانی ئێرانی بەدەستیان هێنابوو تەنانەت لە وڵاتانی پیشەسازیو سۆسیالیستی دا وێنەی نەبوو. ژنانی وڵاتانی پێشکەوتوو لە رێگای ئازادی خۆیانو هەمان ئەومافە مەدەنیو سیاسیانەی کەبە جارێك درا بەژنانی ئێران دەیان ساڵ خەباتیان کرد. ئەمەش لەکاتێکدایە کەدەزانین بارودۆخی ژنی ئێرانی ئەمڕۆ بەچ شێوەیەکە.

وە بەڵام پەروەردەو فێرکردنی دەوڵەتی بەهەستانو تەکان گەلێکەوە چووە پێش کە زۆر خێراتر بوو لەئەورووپا یان ویلایەتەیەکگرتووەکان کە سەدوپەنجا ساڵی خایاند هەتا هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە لەخۆبگرێت. تەنانەت نەیارانیشم ناچارن ئەم راستییە قەبووڵ بکەن لەبەرئەوە هەمیشە ژمارەی قوتابیانی ئێرانییان کەلەدژی من خۆپیشاندانیان دەکرد بەدەیان هەزارکەس دەخەملاند. کۆلەکەکانی

ئەو شارستانیەتە مەزنەی کەئێران دەیویست دووبارە پێی بگات لێرەدا جێی گرتووە.

کێ لەم هێزە دەئالۆزکا و ڕێی لێ ون دەبوو یان دەترسا و دەشلەژا ؟ بە رای من هیچکەس. بەڵام وادیارە ژمارەیەکی زۆر وایان لێهاتبوو وبەدڵنیاییەوە لەم بارەوە تادەیانتوانی زێدەرەوییان دەکرد. بە بۆچوونی من گرفتی ئیشەکە هەرلێرەدا بوو کە پرسەکە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کەلەرووی سیاسی و جڤاکی و ئابوورییەوە پەیوەندی ریشەیی هەبوو هاوتایی پەیداکردبوو. ئایا دەیان هێشت سەرکەوتووبم؟ باسەکە لەمەدایە.

کێ دەتوانێت قسە لەئارمان شار بکات؟ ئەمڕۆ باشتروایە کەئەم زاراوە لەرووی تێفکرین و هۆشیاریەوە بەکاربێنین. "ئارمان شار" بەمانای رۆشتنی بەرەوسەرو بەرەو شارستانیەتی مەزن نییە، کە ئێمە دەروەست بووین لەبە جێ گەیاندنی. بەڵکو ئاوابوونێکی سەرلێ شێوێنە، لەژێرناوی پێشکەوتن بەرەو نەمان و بە سووک دانانی پێداویستییەسەرەتاییەکانی هاووڵاتیان و ئاواتی راستەقینەی هاونیشتمانان. ئەمە، لەراستیدا، بەئارمان شارێکی خراپ دەگات. رووداوەکانی ئەمڕۆ ئەو بیروباوڕانەی ئێمەی کە هەمیشە قسەمان لێوەدەکرد ناگۆڕێت. لەبەر ئەوە دۆزەکە بەتەواوەتی پێچەوانەیە.

هەر ئەوەی کە دەمارگیری کۆنەپەرستانە لەگەڵ شێوەیەك لە "پێشکەوتن" کە گونجاوە لەگەڵ کوشتن و سوتاندن و لەناوبردن یەکی گرت و، ناڵێم دەستی تێکەڵ کرد، مەرگی میللەتێك بەدوای خۆیدا دێنێت کەبۆ خۆی قوربانی بەڵاو وەیشومەی لەوجۆرە بووە، ئەگینا رەنگە تەنیا ببێتە هۆی زنجیرەیەك کاردانەوەی توندوتیژانە و هیوابڕاوانە. بەڵام ئەگەر میللەتێك بەتەواوی ملی کەچ کرد بۆ حکومەتی تیرۆرو بێ مانایی و پووچی، کە بارودۆخی ئەمڕۆی ئێران وەهایە، تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت دەکرێ فریوی بدەیت. من ئەگەر لەگەڵ میللەتەکەمدا درۆم بکردایێت هەرگیز نەمدەتوانی لەبارودۆخێك کەلە ١٩٥٣دا تووشی میللەتەکەم هاتبوو و دیسانیش هەوڵ دەدەن گیرۆدەی ئەو بارو دۆخەی بکەن، رزگاری بکەم.

**چەند نموونەیەك لە مێژوو:**

ئەمڕۆ شارستانیەتی مەزنی ئێمە وەك ئەفسانەیەكی لێهاتووە كەوادەردەكەوێت لەگەڵ مەرگدا هاودەم لێوەستاوە. بەلاّم لە راستیدا وەك ئەو رووبارە مەزنانەی كەلەژێر كێوەكاندا نابینرێن‌و خەیاڵ دەكەن لەناو چووە، هێشتا درێژە بە ژیانی خۆی دەدات‌و بە دەركەوتنی لەناكاوی خۆی هەمووان تووشی سەرسووڕمان دەكات. ئەم رەوتە بە پشت بەستن بەبایەخەكان‌و داهێنان‌و تێكۆشان‌و بیركردنەوەو توانایێك كە رەگی لە شارستانیەتی ئێرانی دایە، دیسان بەهۆی ئازارو سەركەوتنە ماددی‌و مەعنەوییەكانی خەڵكەكەمانەوە لەدایك دەبێتەوە. هەرچەند كەهەندێ لەم تایبەتمەندییە ئەرێنیانە، لەمڕۆدا بەهۆی فریودانی خەڵك‌و دووڕوویی‌و رۆحی تۆڵەسەندنەوە پێشێل كراوە، بەلاّم دڵنیام كەلەناو نەچووەو رۆژێك سەرلەنوێ سەر هەڵدیننەوە.

كاتێكە مۆتەكەرەشەكان لەژێرئالاّیەكی خوێناویدا لەو وێرانانەی كە هێشتا دووكەڵیان لێ بەرزدەبێتەوە سەماو تەراتێن دەكەن، كاتێكە خەڵكانێكی گێل‌و گەمژەو ترساو بەسەرساامییەوە لەو وێرانییە گەورەیەی كە بەهۆی مشتێ دەمارگیرو كەللە رەقی شێواوەوە پەیدا بووە دەروانن، كاتێكە زیندانەكان بۆ ئاخنینی هەزاران ژن‌و پیاوی بێ تاوان بچووك دەبێتەوە، كاتێكە بەگوللەی ئیعدامی "پیرۆز" ی بەكۆمەڵ لافاوی خوێن هەڵدەسێ، ئەوكات خەڵك، بێ ئەوەی بیانەوێت روو لەرابردووی نزیك یان دوورترو پڕشانازی خۆیان دەنێنەوەو لەقوولاّیی دڵیان دا تۆوی هیوا دیسان دەپشكوێت. راكێشانی گێژاو بێگومان بەهێزە، بەلاّم راكێشانی مێژوو هەمیشە بەهێزترە. كێنت دو گۆبینو بەباشی دەڵێت:" ئەقڵی دروست‌و ژیری چرای رێگای كورش‌و جێنشینانی بووە، هەربۆیە كەڵكی خراپ وەرگرتن لە ئایین‌و دڵڕەقی بەرامبەر بەخەڵك هەتا سەرنەبوو."

باسەكە لەمەدایە كە چەندە دەخایەنێت تا خەڵكی رێ ون كردووی ئێران تێبگەن كەبە دوای تراویلكە دا رۆشتون و ئێستا لەناوجەرگەی بیاباندا دەیساچێنن.

# فەسڵی ١٩

## بارودۆخی سوپامان

زۆرجار گوتوومە کەهیچ بەرزە فڕینێکی فراوان خوازانە لە مێشکماندا نەبووەو چاومان نەبڕیوەتە ئاوو خاکی ئەوانی تر. بیرمان لەوە نەکردوەتەوە هەتا بۆچوونە سیاسیی و کۆمەڵایەتیەکانی خۆمان بەسەرئەوانی تردا بسەپێنین. چالاکییەکانی نوێنەرانی ئێمە لەڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هەمیشە بەئاراستەی میانەڕەویو ڕێك کەوتنو ئاشتی دا بوو. هیچ کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە میللەتی ئێمە لەحاڵی گەشەکردنی تەواودا بوو. ئێران پێویستی بەئاشتی بوو وئێمەش بە گوڕو تینەوە، نە تەنیا بۆخۆمان بەڵکو بۆهەمووان بەدوای ئاشتیو ئارامی یەوە بووین.

هەرچۆن بێت مانای وردی سیاسەتی سەربەخۆیی ئێمە ئەوە بوو کەپێویستمان بە سوپاو چەكوچۆڵ هەبوو. دەمویست بەو شێوەی چەکدارپین کە ئاسایشی ئێمە لەوبەشەی جیهاندا پێویستی پێی بوو. نەخشەکانم لەم بارەوە شاراوەنەبوو، بەڵکو بەپێچەوانە هەمووکەس ئاگای لێ بوو. ئەکرێ بڵێین کە نە بە دڵنیاییەوە — بەڵکورەنگە — هەر ئەم ئاگاداربوونە لەنەخشەکان هۆکاری سەرەکی رووخانی من بوو.

دەبوو دەسەڵاتی سەربازیمان لەساڵی ١٩٨٢دا بەمجۆرە بێت: بڕیاربوو سوپامان لە ٥٤٠٠٠٠ کەسەوە بگاتە ٧٦٠٠٠٠ کەس کە پۆختەی دابەشکردنەکەی بەمجۆرەیە:

**تانك:**

١٥٠٠ دەبابەی "شێری ئێران" کە ئەندازیارانی بریتانی بە تایبەتی بۆ ئێمەیان داڕشت بوو. ئەم تانکانە، ئەگەر لەبەر بزوێنەری نوێ و تۆپی ١٢٠ میلی مەتری و نیشانەگرتنی لێزەری و زرێی تازەیان باشتر لەتانکەکانی دیکە نەبن، شتێك لەوان کەمترنییە.
٨٠٠ تانکی " چیفتن " خاوەن بزوێنەری بەهێزکراو و ئامادە بە هەمان تۆپ و ئامرازی نیشانەگرتنی پێشوو.
٤٠٦ تانکی ئێم- ٦٠ی ئەمریکی بەتۆپی ژیرۆسکۆپی ١٠٥ میلی مەتری. بەتەواوی مۆدێرن.
٤٠٠ تانکی ئێم- ٤٧ی نوێ بەتۆپی ٩٩ میلی مەتری کە توانایی گۆڕینی هەبوو بە تۆپی ١٠٥ میلی مەتری. ٢٥٠ تانکی " سکۆرپیون " ی پشکێنەر. هەر لەوکاتانەدا دەمانویست تانکی دیکەی هەرلەم جۆرە قەوینتی بکەین.
جیا لەهەزار نەفەرهەڵگری زرێپۆش و پێگەی چاودێری گەڕۆك، کەلەسەر شاسی ئەمریکی ئێم -١١٣ دادەنران، ٢٠٠٠ نەفەرهەڵگری زرێپۆشی رووسی مان کەلەسەر زنجیری (لمی) و تایە دەڕۆشتن و شتێکی کەم وێنەبوون. زۆرێك لەم نەفەرهەڵگرانە دەتوانن تۆپێکی ٧٣ میلی مەتری و چەکی دژەتانك هەڵبگرن.

**تۆپخانە:**

لە بنەڕەتدا دەبوو یەکەکانی تۆپخانەمان هێزیان هاوسەنگی تۆپخانەی ناتۆ بێت. کارگەی چەك سازی ئێمە دەبوو تۆپی ١٠٥، ١٢٠، ١٥٠ میلی مەتری و قورستریش دروست بکات.

## هێزی هەوایی:

٧٨ فڕۆکەی ئێف ١٤ ئامادە بە مووشەکی فۆنیکس بە بوردی ٩٠ مایلو رادارێك بە بوردی ١٥٠ مایل کە دەتوانێت هاوکات شەش مووشەك بۆ شەش ئامانج بهاوێژێت.

٢٥٠ فانتۆمی ئاسایی نوێ. کۆنترینیان هەڵگری بۆمبی لێزەری بوو و نوێترینیان هەڵگری ئامێری تۆمارکردن بوو کە دەیتوانی ئاراستەی مووشەکەکانی دوژمن بگۆڕێت.

زیاتر لە سەد فڕۆکەی Es F٥، نزیکەی سەد دانە ئێف ١٤ (یان ئێف ١٥ کە بەرهەمهێنانیان لەسەر بڕیاری بەرهەمهێنەرانی ئەمریکی وەستابوو)، ١٠٦فڕۆکەی ئێف ١٦ کە پێشتر بڕیاری کڕینی درابوو. لەسەروبەندی ڕێکەوتنی کڕینی ١٤٠ فڕۆکەی دیکەدا بووین.

٧ دەزگای ڕادار کە دەکرا بگوازرێتەوە بۆ هەواو ئەوپەڕی فڕینیان تا لانی کەم ٣٥٠٠٠ پێ بەرزدەبوونەوەو بە کڕینی ئەمانەش لەکڕینی ٣٠ دەزگای دیکە کەلەسەرزەوی دادەنرا چاوپۆشی دەکرا. هەروەها کەرەستەی دیکەی ئەلێکترۆنیکی بۆ چاودێری هەوایی.

٢٤ فڕۆکەی نەوت هەڵگری نوێی بوئینگ ٧٠٧ و ٧٤٧ کە دەیان توانی سووتەمەنی بگەیەنن بەیەکتر. من بەپێی پلانەکانی خۆم گۆڕانکاریم لەم فڕۆکانەدا کردبوو. ئەم کۆمەڵە فڕۆکەیە کەدەیان توانی لەئاسماندا سووتەمەنی بدەن ڕێگای بەمن دەدا کە زۆرترین ژمارەی فڕۆکەکان بنێرمە ئاسمانو بەمجۆرە دەست بە کاتەوە بگرم. دەمویست لانی کەم دوازدە فڕۆکەی دیکەی لەم جۆرە بکڕم.

٥٧ فڕۆکەی سی -١٣٠ بارهەڵگری سەربازی "هێرکولیس"ی پەروانەدار.

چەندسەد هێلیکۆپتێر. بینای کارگەیەکی دروستکردنی هێلیکۆپتێر لە ئێراندا لە

بەرەبەری تەواوبوون دابوو و ئەو دەرفەتەی بۆ ئێمەفەراهەم دەکرد کە کۆمەڵێك هێلیکۆپتێرمان هەبێت کە بێگومان هەموو وڵاتانی ناتۆ نەیان بوو.

جیالەمانە، هەندێ لە کارگەکانی ئێمە کە سەرقالی کاروباری پیشەسازی بەرگری بوون ئامادەبوون ئەم کەل‌و پەلانەی خوارەوە بەرهەم بێنن:

مووشەکی دژەهەوایی سام ٧ی (یەکیەتی سۆفیەت)، مووشەکی هەوا بۆ زەوی ماوریك ( ئەمریکی) بە بوردی دوازدە مایل‌و سازوئامادە بەکەرستەی زۆروردی نیشانەگرتن. بەمنیان وتووە کە ئەو کارگەی کە دەیویست لەشێرازدا مووشەکەکانی ماوریك‌و دژەتانکی تاو(TOW) دروست بکات لەناوچووە.

مووشەکەکانی دژەتانکی تاو. دەمویست ئەمریکییەکان لەدروست کردنی مووشەکی تاوی بەخێرایی ژێردەنگ کە کونترۆڵ دەکرا پاشگەز بکەمەوەو هانیان بدەم بۆ دروستکردنی مووشەکی تاوی بەخێرایی سەروی دەنگی لێزەری.

رۆکێتی دژەتانکی (یەکیەتی سۆفیەت)، سەکۆی هاویشتنی مووشەکی " دراگۆن"ی ئەمریکی کە بەشەپۆلی رادیۆیی ئاراستەدەکرێن بۆ پشتیوانی کردنی هێزی پیادە. بوردی ٥٠٠ مەتری ئەم مووشەکانە دەکرا بۆ ١٠٠٠ مەتر زیادبکرێت.

پێشتر سێ تیپ پەڕەشووت وانمان هەبوو کەتا ١٩٨٢ دەبوو بە پێنج تیپ یان زیاتر لە لەشکرێك.

## هێزی دەریایی:

چاوەڕوانییەکانی ئێمە بەمجۆرە بوو:

چوار کەشتی جەنگی ٨٠٠٠ تەنی، هەڵگری مووشەکی ستانداردی دەریا بۆ هەوا بەخێرایی سێ ماخ (سێ ئەوەندەی خێرایی دەنگ)و مووشەکی دەریا بۆ دەریای " هارپۆن" بە خێرایی کەمتر لەدەنگ کە دەمانتوانی بوردی ئاساییان بەیارمەتی هێلیکۆپتێر لە ٩٠ کیلومەترەوە بۆ ١٥٠ کیلۆمەتر زیاد بکەین. ئێمەلەبیری ئەوەدا

بـووین کـەخێرایی ئـەم هارپۆنانـە لـەدەنگ زیاتربکـەین و هاویشتنیـشیان لـە ژێردەریاییەکانەوە لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بوو.

١٢ کەشـتی جـەنگیی زۆر خێـرای ٣٠٠٠ تـەنی هـەڵگری مووشـەکی هـارپۆن کەبە هۆڵەندو ئاڵمان مان راسپاردبوو.

١٢ کەشتی " کومباتان ٢" ی فەرەنسی.

٣ ژێردەریایی ئەمریکی کە قەوینتی مان کردبوو.

٩ ژێردەریـایی کـەبڕیاربوو بەوڵاتێکی ئـەورووپی، رەنگـە کۆمـاری فیـدراڵی ئـەڵمان قەوینتی بکرێت.

٥٠ هێلیکۆپتێری دەریایی

کۆمەڵێك لە کەشتییەکانی نەفەرهەڵگرو نەوت هەڵگرو پشتیوانی و هتد.

ژمارەیەك فڕۆکەی دوورەفڕی پشکێنەری " ئوریـون" (بەرهـەمی لاکهیـد) کە دەبوو هێزی دەریایی کەڵکی لێوەربگرێت و هەروەها وڵامدەری هێزی هەوایش بێت.

هێزێکی دەریـایی لـەمجۆرە نەتـەنیا توانـایی پاسـەوانی کردنـی لـە کەنـداودا هـەبوو بەڵکو دەیتوانی بڕوات بۆ دوورترین کەنارەکانی زەریای هیندیش.

چەندجارێك بڕیـاری خـۆم بـۆ خۆبـواردن لـە هـەبوونی چەکی ئـەتۆمی، کـە ئـامرازی کۆمەڵ کوژییە، دەربڕیبوو. هێزەکانی ئێمە کە چەك و چۆڵی ئاسـاییان پێبـوو تـا ساڵی ١٩٨٢ نەتەنیا دەیان توانی لـە بەرژەوەندییەکانی ئێمـە لـە کەنـداوی فارسـدا پاریزگاری بکەن بەڵکو دەیان توانی لە سەقامگیرکردنی ئاشتی لە زەریای هیندیش دا بەشداربن.

باڵوێزی یەکیەتی سـۆفیەت لـە چەك وچۆڵی ئێمـە نیگـەران نـەبوو بەڵکو نیگـەرانی لـەوە بـوو کـە دەزگاکـانی ڕاداری هـەوایمان دەیـانتوانی لەوشـتەی کەلـەو دیـو سـنوورەکانمانەوە لـەقووڵایی ٥٠٠ کیلۆمـەتری ناوخـاکی یەکیـەتی سـۆفیەت دا رووی دەدا ئاگاداربن. بەبیری ئەوم هێنایەوە کە یەکیەتی سۆفیەتیش بە یارمـەتی مانگە دەسکردەکانی دەتوانێت هەموو ئەوشتانەی کەلەسەرانسەری خـاکی ئێمـەدا روودەدات ببینێت.

ئێران لەم بەشە لەدونیادا تەنیا ولاّتێك بوو کە دەیتوانی هێزێکی بەمجۆرە بۆ پێشگرتن سازو ئامادە بکات. لەراستیدا سوپای ئێمە دەیتوانی لەم ناوچەدا، کە بایەخێکی ستراتیجی تایبەتی بۆ رۆژئاوا هەیە، هەرجۆرە " نائارامییێکی ناوچەیی" رابگرێت یان هەر لەسەرەتادا لەناوی ببات. تەنیا ئێران بوو کە پارەی پێویستو هێزی مرۆیی، بەتایبەت هێزی مرۆیی، بۆئەم کارە لەبەردەست دابوو، لەبەرئەوە بەبێ بوونی هێزی مرۆیی پارە بایەخی نییە. بەلاّم هاوکات لەگەڵ ئاشکرابوونی پلانە سەربازییەکانم منیان بە خۆ بەزلزان تاوانبارکردو لەبەر خەرجیە ئەفسانەییەکانی بەرگری کەوتمە بەر لۆمەکردن. هەربۆیە حەزدەکەم ئەم بابەتە تۆزێ روون بکەمەوە.

پێش لەهەموو شتێك نابێت لەبیربچێت کەلەکاتی هاتنەدەرەوەم لە ئێران ١٢ملیار دۆلار دراوی دەرەکیم بۆ میللەتەکەم بەجێ هێشت.

رەنگە بەلای ئەوروپییەکانەوە جێ سەرسووڕمان بێت، بەلاّم دەبێت بڵێم کە ئێمە نەمان دەتوانی ئەم پارەیە لە ناوخۆی ولاّتدا خەرج بکەین یان بۆ پێداویستیەکانی خەڵك لەبواری بەکارهێناندا کالاّو شتومەك هاوردەبکەین. بۆ خەرج کردنی ئەم پارەیە لەرێگای گەشەپێدانی ناوخۆییدا پێویستمان بەئامێرو کەرەستەو ماددە (بەتایبەت پۆلاّ) هەبوو وئەمانەش کەرەستەگەلێك بوون کە دەبوو لە دەرەوە هاوردەی بکەین.

سەرەڕای بەدواداچوونو هەولّی بەردەوام، ژێرخانی ولاّت (رێگاکانی ئاسن، جادەکان، بەندەرەکان) وەك پێویست گەشەی نەسەندبوو. ئەمە بەومانایەیەکە هاوردەکردنێکی زیاتر لەوەی کەتا ئەو رۆژە لەرێگای دەریاو هەواوە یان لە رێگای تورکیاو رووسیاو باقی دراوسێ کانەوە جێبەجێ دەکرا مسۆگەر نەبوو. بەندەرەکانمان بە هۆی کەشتییەوە قەپات ببوو وهەرکەشتییێك دەبوو شەش مانگ چاوەڕێی داگرتنی بارەکەی بکات.

جیا لە کەموکورتیەکانمان لە بواری ماددەی خاو و کەلوپەلو ئامێرەکانی پەیوەندی دا، کەموکورتیشمان لە تەکنیککاردا هەبوو. ئێمە زیاتر لەیەك ملیۆن

بیانی مان دامەزراندبوو. پێشتر ئاماژەم بەوە کرد کەئیمەئاوڕمان لەپەروەردەکردنی ئەندازیاران وسەرپەرشتیاران‌و کارگێڕان‌و کرێکارانی لێهاتوو دابوەوە بەڵام زیاتر لەوانەمان پێویست بوو.

سەرئەنجام، هاوردەکردن سەرەڕای هەموو شتێك، زیادبوونێکی لە رادەبەدەری بەخۆ وە بینی‌و بووە هۆی هەڵاوسانێك کە دەمویست بەهەر نرخێك بووە مەهاری بکەم.



# فەسڵی ٢٠

## سیاسەتی دەرەكی ئاشتیخوازانە
## هاوپەیوەندی وڵاّتانی كەنداوی فارس و زەریای هیند

ئامانج و دەسكەوتەكانی سیاسەتی ناوخۆییم شرۆڤەكرد. دیتمان كە چۆن هەڵكشانی خێرای ئابووریمان یەكەم جار بەهۆی بەفیڕۆدان و نەشیاوی موسەدێقەوەد تووشی بێ سەرەو بەرەیی هات و چۆن توانیمان ئێران لەگۆشەگیری رزگاربكەین. بەلاّم ئەگەر لەم بەشە لەدونیا كە ئێران پێگەیەكی زۆر گرنگی هەیە، نەمان توانیبا ئاشتی و ئارامی نێوان میللەت ودراوسێ كانی بپارێزن، ئەوا بەهیچ یەك لەئامانجەكانی شۆڕشی شاو خەڵك نەدەگەیشتین.

پەیوەەندی ئێمە لەگەڵ یەكیەتی سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەلاّتكەوابوو، ئامانجی سەرەكی سیاسەتی دەرەكی من هەبوونی پەیوەندی لەسەربنەمای رێزی دراوسێتی بوو لەنێوان ئەو وڵاّتانەی كەلەچواردەورماندا بوون.

یەكەم جار، هۆی سەركەوتنی من وەك هەر سەربازێكی دووربین، ئەوەبوو كەلەشەڕ دەترسام. دووەم ئەوەی كە، لەو بارودۆخانەی دا كە هەمیشە پڕبوولە رەنج وماندوویەتی ، چاودێریم دەكرد كە دراوسێ كانمان بە هەمان ئەو شێوەی كە ئێمە رێزیان لێدەگرین لەگەڵ ئێمە هەڵس وكەوت بكەن. هەرچەند كەئێمە بەتەما

نەبووین لەگەڵ هیچکەسدا شەڕبکەین، بەڵام دەبوو هەمووان تێبگەیەنین کەئەگەر لە هەرلایەکەوە دەسدرێژی بکرێتە سەرمان ئەوا ئێران توانایی هەیە بەباشی بەرگری لەخۆی بکات.

بە روون بوونەوەی ئەم خاڵە، ناکۆکییە سنوورییەکانمان لە گەل یەکیەتی سۆڤیەت دا بەچەشنێك چارەسەرکرد بووەهۆی رەزامەندی هەمووان. دابەشکردنی ئاوی رووباری ئەرەس (٥٠/٥٠) بەپێی یاساکانی نێونەتەوەیی بەرێوەچوو و بەنداوێکی گەورە لەسەر ئەو رووبارە دروستکرا کە وزەی کارەبا بەرهەم دەهێنێت و ئاو دەگەیەنێتە ناوچەیەکی بەرفراوانی کشت وکاڵی. لەگەڵ سۆڤیەتییەکان سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووین بۆئەوەی لەسەر ئەم رووبارە بەنداوێکی دیکە دروست بکەین هەتا کارەبای زیاتر بەرهەم بێنین و زەوی کشت و کاڵی زیاتر لەناو سوودمەندبکەین. بەرهەم هێنانی کارەبای هاوبەشمان لەیەك ملیۆن کیلۆوات زیاتردەبوو.

زۆربوونی قەبارەی ئاڵ و وێری ئێمە لەگەڵ رووسیا ئەم وڵاتەی کردبوو بە هاوبەشی سەرەکیمان. ئێمە گازمان هەناردەی رووسیا دەکرد و رووسەکانیش کارگەیەکی باشی توانەوەی ئاسنیان لەئیسفەهاندا دامەزراند. ئەمریکییەکان لە سەردەمی ئایزنهاڤێردا نەیان توانی خۆیان بۆ پێکهێنانی ئەم ئیشە لە ئێراندا رازی بکەن. رووسەکان بۆ دۆزینەوەی ئاسن و خەڵووزی بەردین لە باکووری بیابانی ناوەندی (باشووری خوراسان) و نزیکی کرمان دا یارمەتی ئێمەیان دا. لە کۆتاییدا ئەوەی کە، قەبارەی ئەو کاڵاوشتومەکانەی کەلە رۆژئاواو لە رێگای رووسیاوە دەهاتە ئێران ئێگجار زۆرببوو.

پێویستە ئەوەش زیادبکەم کە بایی چەندملیۆن روبل کەل وپەلی سەربازی پێشکەوتوومان لەرووسیا کڕی و لەبیری ئەوەدابووین کە برێکی بەرچاویش چەك وچۆڵ لە چیكوسلۆڤاکیا بکڕین.

دەمەوێت بە کەڵك وەرگرتن لەم دەرفەتە ئەوە بەبیر بێنمەوە کە لە چیكوسلۆڤاکیا، وەك وڵاتانی دیکەی رۆژهەڵاتی ئەورووپا، هەمیشە بەگەرمی و یەك رەنگییکی

زۆرەوە پێشوازییان لەمن دەکرد. لەناو هەندێ لە رێبەرانی ئەم وڵاتانەدا – واتا چیکوسلۆڤاکیا و بولگاریا و پۆلاندو هەنگاریا و رۆما– دۆستانێکی زۆرنزیکو باشم هەبوو. بەتایبەت لە چاوپێکەوتنەکانم لەگەڵ بەرێز چائوشسکۆدا بیرەوەری خۆشم هەیە. ئەو هیچکات، تەنانەت ئەوکاتەش کەلەئێران رۆشتم، روانگەو بۆچوونی بەرامبەر بەمن نەگۆڕا. بەرای من چائوشسکۆ پیاوێکە کە بۆپاراستنی سەربەخۆیی وڵاتەکەی لەهیچ هەوڵو تێکۆشانێك تەنەخی ناکات.

## تورکیا، دۆستو هاوپەیمان:

لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیادا هەرگیز کێشەمان نەبووە. لەکاتی سەردانی باوکم بۆ ئەو وڵاتە لە سەردەمی کەماڵ ئاتاتورکەوە پەیوەندی ئێمە دۆستانەو یەکگرتووانە بووە.بەلای ئێرانەوە، خۆشبەختیو شکۆمەندی تورکیا بایەخێکی سەرەکی هەبووە. ئەمڕۆ بۆ بەختەوەری ئەم گەلە ئازایە بە تامەزرووییەوە دۆعادەکەم. ئێمەو تورکیا پێکەوە پەیمان نامەی بەغدامان واژۆکرد. پاش واژۆکرانی ئەم پەیمانە (١٩٥٦) سەردانی مسکۆم کرد. خروشچۆف کەلەم ئیشە نارازی بوو بەوتنی " ئەم پەیمانە زێدەگاڤیەو بەرەو رووی ئێمە دەبێتەوە" پێشوازی لەمن کرد.

بەبیری ئەوم هێنایەوە کەلە کۆڕو کۆمەڵی سیاسیو چاپەمەنیدا قسە لەپێویست بوونی هێڵێکی بەرگرییە کەلە کێوەکانی زاگرۆسەوە تێدەپەڕێت. پرسیارم لەوکرد:" ئەم کێوانە لە کوێدان، لە رووسیا یان ئێران؟"

وڵامی دایەوە:" لەئێران"

گوتم:" باشە، کەواتە ئەمە پەیمانێکە بۆ بەرگریکردن"

ئەو کە هێشتا بۆنی شەڕی لێدەهات گوتی:" بەم پەیمانانەتان مەن مەهێننە پێکەنین... چاك دەزانن کە دەتوانین بریتانیا بەحەوت بۆمبی ئەتۆمیو تورکیا بە دوازدە بۆمبی ئەتۆمی تەخت بکەین."

**واتای ئەم وشانە چی بوو؟**

**دواتر خروشچۆف رایگەیاند کەئەم پەیمانە وەك بڵقی سابووناو دەتەقێت. ئێستا کە بیستو پێنج ساڵ تێپەریوە،دەبێ قەبووڵ بکرێت کە قسەکەی راست بوو.**

## شەڕ لەپێناوی ئاشتی دا:

**لەساڵی ١٩٧٥ لەماوەی کۆبوونەوەی ناسراوی نەوتدا لە ئەلجەزایر دەرفەتێك دەسکەوت تا لەگەڵ سەدام حوسەین، سەرۆك کۆماری عێراق، وتووێژێکی دوورودرێژمان هەبێت. پێکەوە لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە دەبێت ناکۆکییەکانی نێوانمان لەناوبچێت. بەبڕوای من، بەنیشانەی نیازپاکی توانیمان کۆتایی بەو خراپ لێك تێگەیشتنانە بێنین کەبەهۆی بەرژەوەندییەکانی داگیرکەرانەوە لەمێژ بوو لەنێوان دوو وڵاتماندا دروست ببوو.**

**سەرۆك حوسەین رازی بوو کە کێشەی شەتولعەرب بە پێی یاساکانی نێونەتەوەیی چارەسەربکاتو وەك دۆزی رووباری ئەرەس، ئاوی ئەم رووبارە بەپێی هێڵی ناوەراستی رووبارەکە لەنێوان دوو وڵاتدا دابەش کرا. من بەش بەحاڵی خۆم رامگەیاند کە لە بنەرەتدا بەختەوەری گەلی ئێراق بۆ ئاسایشی ئێران بایەخی هەیە.**

**لەبەرچاوگرتنی ئەم بنەمایە وای لەئێمەکرد ئەوکاتەی کە ئەفغانستان تووشی گیروگرفتی ئابووری هاتبوو یارمەتی بدەین. دوابەدوای ئەم بارودۆخە، گۆڕانێك لە دەوڵەتو هەڵوێستی سیاسی ئەفغانستاندا رووی دا. هێزەکانی رۆژئاوا بارودۆخە کەیان قەبووڵ کردو ورتەیان لێوەنەهات. لە کاتێکدا دەسبەجێ دانمان بە رژێمی نوێی ئەفغاندا ناو درێژەمان بە یارمەتیە ئابووریەکانی خۆمان دەدا لە بە تەنگەوە نەهاتنی رۆژئاواو ئەگەری دەرئەنجامەکانی بۆ ئێران نیگەران ببووم.نەکا زلهێزەکان سیاسەتی خۆیان لەم بەشەی دونیادا گۆڕی بێت؟**

من یەکەمین سەرۆك بووم کەپاش سەربەخۆیی پاکستان سەردانی ئەو ولاتەم کرد. ئێمــە هەمیــشە وەك هاوپــەیمانێکی بــەوەفا بەرامبەربــەم کۆمارەســاوایە هەڵس‌وکەوتمان کردوەو لە رووی ئابووری‌و سەربازییەوە یارمەتیمان داوە. بەلاَم هەمیــشە هــەولَمان داوە تــا پەیوەنــدی ئاشــتیانەو دێــرینی نێــوان پاکــستانی ئیسلامی‌و هیندســتان بــەردەوام بێــت. تێك هەلَچوونی ســەربازی نێــوان هینـدو پاکستان هەمیشە بەلای منەوە مەترسیدار بووە.
هەربەم هۆیەوە بوو کەلەدەرفەتی ئامادەبوونی ژەنرالٌ یەحیاخان، سەرۆك کۆماری ئەوکاتی پاکستان لــە رێــوەڕەسمی جێژنــەکانی ٢٥٠٠ ســالَەی پاشـایەتی ئێـران کــەلَکم وەرگــرت‌و چــاوپێکەوتنێکم لــەنێوان ئــەو و پــادگورنی ســەرۆك کۆمـاری یەکیەتی سۆڤیەتدا رێکخست. لەم رێگەوە دەمویست لەمەترسی سەرهەلَدانی شەڕ لە نێوان هیندو پاکستان لەسەر بەنگلادێش پێشگیری بکەم. بەلاَم بەداخەوە رەق هەلَوێستی یەحیاخان منی بێ هیواکرد.

## دراوسێ کانمان لە کەنداو:

پەیوەنـدی ئێمـە لەگـەلٌ دراوسـێ کانمـان لـە لێـواری ئەوبـەری کەنـداوی فـارس دا: کوێـت، ئیمـاراتی یـەکگرتووو گرنگتر لە هـەمووان عەرەبستانی سعودی دۆستانە بوو.
چەندجارێك سەردانی عەرەبستانی سعودیم کرد. یەکپارچەیی‌و سەربەخۆیی ئـەم ولاَتــە بۆئێمــەی موســلَمان پــیرۆزە. دووجاربەختــەوەری ســەردانی مــالَی خــوام بەنەسیوبوو.
وەك موسلَمانێکی خاوەن بڕواو داکۆکی کاری ئیسلام، هیـوادارم کـە عەرەبـستانی سعودی بۆ هەتاهەتایە لە دووشاری پیرۆز، واتا مەککەو مەدینە کە بەسلیۆن میوان بۆ سەردانی مالَی خوا رووی تێدەکەن، پارێزگاری بکات.

شکۆمەندیو تێگەیشتوویو ئازایەتی ئیبن سعود، دامەزرێنەری عەرەبستانی سعودیو هەروەها زیرەکی ناوبراو لە بەڕێوەبەریدا لە مێژوودا تۆمارکراوە. بە دیتنی ڕووداوە خوێناویەکانی ئەمڕۆی ئێران، لەوەی کە دەبینێت عەرەبستانی سعودی هێشتا ئازادو سەربەخۆ ماوەتەوە خوشحاڵ دەبێتو لە خوا دەپارێتەوە هەروا بمێنێتەوە.

سەردەمێك بەڕێز گرۆنۆی رۆبێرتس، نێردراوی تایبەتی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا، ئێمەی دڵنیاکردەوە کە بریتانیای گەورە تا کاتێکی " پێش بینی کراو" لە کەنداوی فارس دا دەمێنێتەوە. بەڵام هێشتا سێ مانگ تێنەپەڕی بوو کە بریتانییەکان کەنداوی فارس یان بەجێ هێشت. بەڕای من، بریتانییەکان لەکاتی پەیوەست بوونیان بە بازاری هاوبەش هەر ئەم لاوازیو نەشیاوییەیان لە خۆ نیشان دا. بەڵام ئاسایشی کەنداوی فارس دەبوو بپارێزرێتو جگە لەئێرانیش کێ دەیتوانی ئەم ئیشەبکات؟

هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە دەسبەجێ پاش چوونە دەرەوەی بریتانییەکان لە کەنداوی فارس دوورگەکانی تونبو ئەبوومووسام دیسان داگیرکردەوە. لە بەحرەین دا تەنیا یەك لە سەر شەشی دانیشتوانی بەرەگەز ئێرانی بوون. هەربۆیە رازی بووم خەڵکی ئەوێ سەبارەت بەچارەنووسیان بڕیار بدەنو ئەوانیش دەنگیان بە سەربەخۆیی وڵاتەکەیان دا.

لە سەرداوای یارمەتی خواستنی ناچاری شانشینی عەممان بوو کەلەساڵی ١٩٧٣دا یارمەتی سەربازی ئەو دەوڵەتەم دا. لەبەر ئەوەی زەفاریەکان بەیارمەتی یەمەنی باشوورو چینو کۆمۆنیستەکان هەڕەشەیان لە شای عەممان دەکرد. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە چین پاش دامەزراندنی پەیوەندی دیپلۆماتیك لەگەڵ ئێران لە دەستێوەردانی زەفار وازی هێناو ئەمە نیشان دەدات کە چین نایەوێت فرتو فێڵ بکات.

هەروەها لەكاتی سەردانی سەرۆك هواكۆئۆفۆنگ بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٧٨دا من توانیم لە دڵسۆزیو راستگۆییو ئاگاداربوونی دروستی ئەو دەوڵەتە لە سیاسەتی نێو نەتەوەیی ستایش بكەم.

لە عەممانیدا هێزەكانمان بەو پەڕی تواناییەوە بەشدارییان كرد بۆئەوەی دۆستم، پاشای عەممان، بتوانێت بەسەر بارودۆخەكەدا زاڵ بێت.

## بازاڕێكی هاوبەش لە كەنارەكانی زەریای هینددا، ئەفریقا: هێڵی نێوان كۆمۆنیستەكان

لە بەرەو رووبوونەوە لە گەل مەترسیە روو لە زیادبووەكاندا، بەكاربردنی سیاسەتی هاوپەیوەندی نێوان وڵاتانی كەنداوم بە پێویست زانی. خودی ئەم وڵاتانە دەبوو ئاسایشی ناوچەكە بپارێزن. هەر بەمجۆرە وڵاتانی دەوروبەری زەریای هیندیش (ئێران، پاكستان، هندستان، سەیلان، بەنگلادێش، برمە، مالیزی، تایلەند، سەنگاپوور، ئەندۆنیزیا، ئوستralیا، نیوزلاند) دەبوو بۆ پاراستنی ئاسایشی بە كۆمەڵیان پێكەوە یەكبگرن. هەمووان دەزانن پەیمانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا خوازیاری گێڕانی وەها دەورونەقشێك بووە، بەڵام ئەم پەیمانە كەمو زۆر تووشی مردن هاتبوو.

هەر لەسەرئەم بنەمایە بوو كەلەكاتی سەردانم بۆ ئوستralیا لەساڵی ١٩٧٤دا پێكهێنانی بازاڕێكی هاوبەشم لە نێوان وڵاتانی زەریای هینددا پێشنیازكرد. هەر ئەم پێشنیازەم ئاراستەی سەنگاپوور، لە ژێر رێبەرایەتی دیارو بەرچاوی بەرێز لی كوان یو وهیندستانیش كرد. پێویست بوو پاش لێكۆڵینەوە لە پێداویستییو پێویستییەكانی وڵاتانی ئەندام، بەرنامەی ئاڵو وێروێارمەتیەكانی دوولایەنە بخرێتە بواری جێبەجێ كردنەوە. بۆ نموونە من رامگەیاند كە ئێران ئامادەیە یارمەتی بە پەرەپێدانی سەرچاوەكانو كشتوكاڵو پیشەسازی هندستان بدات.

بەڵام ئێمە بێ ئەوەی کە چاوەڕێی بەدی هاتنی ئەم بازاڕە هاوبەشە بکەین – کەلەهەموو شوێنێکدا پێشوازی لە پێشنیاری دامەزراندنی کرابوو– هاوکاری ئابووری خۆمان پێشکەش بە وڵاتانی سودانو سۆمالیو تەنانەت سەنیگاڵو وڵاتانی دیکەی رۆژئاواو تەنانەت ناوەندی ئەفریقای رەشیش کردبوو. هەروەها بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی گونجاو بۆکێشەی نامیبیا لەگەڵ رێبەرانی ئەفریقای باشووردا ناوبژیوانیم کرد. چاوم بە رێبەرانی رەشی رۆدزیا کەوت بۆئەوەی رێگەچارەیەکی ئاشتی خوازانەو دادپەروەرانە بۆ کیشەی رۆدزیا بدۆزینەوە. ئەم هەوڵە ئاشتی خوازانەیەی من لەوکاتەدا سوپاسی ئەمریکاو بریتانیای بەدواوەبوو.

ئێران، کەتەنیا بەهۆی نیمچەدوورگەی عەرەبستانو دەریای سوورو زەریای هیندەوە لەئەفریقا جیابووەتەوە، بە نیگەرانییەوە دەبینی کەلەسێ لاوە کومۆنیزم بەرەو ئەفریقا لەپەرەسەندن دایە. یەکەم هێڵ کەلە لیبیاوە بەرەو چادو سودانو سۆمالی درێژدەبێتەوە، هێڵی دەریای ناوەراست– دەریای سوور– زەریای هیندە. دووەم هێڵێکە کەلەرێگای وشکانیەوە دەریای ناوەراست دەبەستێتەوە بەزەریای ئەتڵەسیەوە. سێیەم هێڵێکە کە ئەفریقا لە ئانگۆلاوە تا موزامبیك دەکات بەدووبەش. یەکێك لە خەونەکانم ئەوەبوو کە هاوکاری دروستکردنی هێڵێکی ئاسنین بکەم کە کەناری رۆژئاوای ئەفریقای دەبەستەوە بە کەناری رۆژهەڵاتییەوە.

بەخۆشییەوە بەبەرەکەتی بوونی سەرۆك ساداتو شاحوسەین، میسرو مەراکێش خاوەنی سەنگو بایەخن: سەبارەت بەم کەسایەتیە دەگمەنانە کەهەر دوودۆستی سیاسەتوانێکی خۆشناوی دیکەن، واتا سەرۆك کۆماری هەڵکەوتووی سەنیگاڵ، لئۆپولدسدارسنگور، دواتر قسەدەکەم. راستییەکەی ئەوەیە کەئاراستەی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان هێڵی جیاکەرەوەی راستەقینەن: ئەو هێڵانەی کەکیشوەری ئەفریقایان لە باکوور بۆ باشوور و رۆژهەڵات تا رۆژئاوا دابەش کردوە.

لەئێستادا جموجوڵێکی ستراتیجی بەرین دەستی پێکردوە کە دیهەوێت ئەفریقا تووشی ئاڵۆزیو شێواوی بکات. ئەو شوێنەی کە ئەمڕۆ "ئەفریقایٰ رەش"ی پێدەڵێن رەنگە سبەی ببێت بە "ئەفریقای سوور". بەراستی هەست دەکەم کەئەگەر لەچواردەوری زەریای هیندا، ناوچەیەکی ئارام پێکبێت کە ئەمریکییەکانو سۆڤیەتیەکان دەستی تێوەرنەدەن، دەبێتەهۆی بەرەوپێش بردنی هیوای ئاشتیو ئارامی لەجیهاندا. بەڵام ئێستا کەهاتنەدی ئەم هیوایە مسۆگەربووە، ئایا شتی وایان پێ قەبووڵ دەکرێت؟ ئایا یەکیەتی سۆڤیەتو ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادەن دان بە ناپێویست بوونی مانەوەی سەربازی خۆیان لەزەریای هیند دابنێن؟

## هاوپەیوەندییەکی گشت لایەنەی کاریگەر:

بەڵام دەربارەی پەیوەندیمان لەگەڵ رۆژئاوا، جەخت کردن لەسەرئەم خاڵە بێ سوودە کە ئێران لە رووی ئیدولۆژیکییەوە بەستراوە بە بلۆکی هێزەدیموکراتەکانی رۆژئاواوەو ، هەڵبەت ئەوەش تا ئێستا وتوومە ئەم مانایە دەسەلمێنێت. ئاڵوویری ئابووریمان لەگەڵ رێکخراوی هاوکاریو گەشەپێدانی ئابووری (O.E.C.D)و لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەردەوامو بەرچاو بوو. پێویستە لێرەش دا ئەو خاڵەزیادبکەم کەلەم دواییانەدا بەڵێن مان دابوو پەیوەندی بازرگانی سنووردارمان لەگەڵ باقی وڵاتانی ئەمریکایی دا، جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، پەرەپێبدەین.

پێم وایە بە روونی شرۆڤەم کردوە کە سیاسەتی دەرەکی ئێمە تەنیا خزمەت بەیەك وڵات – واتا ئێران – دەکات. بەڵام هەر بەم جۆرە روون بوو کە بەرژەوەندی ئێمە دەیخواست کە دراوسێ دانەبڕاوەکانمان لەئاشتیو ئارامی دابن. ئەمەش لە لێکدانەوەی کۆتاییدا بەومانا بوو کەتا ئەوجێگای بۆیان دەشێت لەبەختەوەریو ئاسوودەیی دا ژیان بکەن. لەبەر ئەم هۆکارە بووە کەئێمە هەمیشە لەسیاسەتی رێزی دراوسێتی پەیڕەوی مان کردوە و تائەو جێگاش کە توانایمان هەبووە،

سیاسەتی یارمەتی دانی دوولایەنەمان بەکارهێناوە. دیسانیش لەبەرئەم هۆکارە بووە کە توانیمان هاوسەنگییەکی راستو دروست لەگەڵ رۆژئاواو لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتو رۆژئاوای ئەورووپاو کۆماری خەڵکی چین دا پێك بێنین.
هاوپەیوەندی قووڵو راستەقینەی هەموو خەڵکی دونیا، لەلای من، چەمکێکی بێ مانا نییە بەڵکو راستییەکە کە بەبڕوای من پێویستە بێ جیاوازی باڵ بەسەر سیاسەتی دەرەکی هەموو ولاتێکدا بکێشێت. هەڵبەت، وەها ئیشك هیچکات بە کردەوە دەرنایەت بەڵام هیچکات وابیرمان نەکردوەتەوە کەلەتێکۆشان بەهەموو هێزو تواناییەکەوە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە بەخشراوین.
لەساڵی ١٩٧٣دا پێشنیازم کرد کە دوازدەوڵاتی پیشەسازی جیهان لەگەڵ دوازدە ئەندامی ئۆپێك دا یەکبگرنو بونیادێك بۆ یارمەتی نێونەتەوەیی پێك بێننو هەر کام لەم وڵاتانەش بڕی ١٥٠ملیۆن دۆلار لەم بونیادەدا سەرمایە دابنێت. ئەنجوومەنی سەرپەرشتی ئەم بونیادە دەیتوانی لەنوێنەرانی بیستوچوار وڵاتی ئەندامو دوازدەنوێنەر لە وڵاتانی دونیای سێیەم پێك بێت کە پێکەوە لێکۆڵینەوە لەو بەرنامانەی بکەن کە لەلایەن ولاتانی لە حاڵی گەشەسەندن دا دەخرێتەروو. ئامانجی ئەم بەرنامانە دەبوو سەربەخۆیی هەنگاو بەهەنگاوی ئەو وڵاتانەی بێت کەیارمەتی دەدران. لەوکاتەوە ژمارەی ولاتانی ئەندامی ئۆپێك زیادی کردوە وپێشنیازەکەی منیش کەلەسەردەمێکدا خرایەروو کەباری دۆلار قایم بوو، ئێستا دەبێت پێداچوونەوەی تیابکرێت. جیالەمەش پێویستە بەرزبوونەوەی نرخی نەوتیش لەبەرچاو بگیرێت. لەوکاتەدا وڵاتانی ئەندامی بونیاد، بە بەشداری کردنی ١٥٠ ملیۆن دۆلاری خۆیان، ٣٠٠٠ ملیۆن دۆلاریان کۆکردەوە. بەڵام ئەمڕۆ وەها بونیادێك ٢٠٠٠٠ملیۆن دۆلاری پێویستەو پێویستی بەوە هەیە کەنەتەنیا ولاتانی بەرهەم هێنەر، بەڵکو داهاتەکانیشیان لەبەرچاوبگرێت. روونە کەناکرێ چاوەڕوانی لە گابۆن هەبێت بە ئەندازەی عەرەبستانی سعودی سەرمایە دابنێت.

## گەلاّڵەکەی من خەون و خەیاڵ نەبوو:

بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێونەتەوەیی دەیان توانی خزمەت گوزارییەکانیان لە بواری راوێژکاری دابێت و هەروەها ئاڵ وویری دراو وئامادەکاریەکانی ئابووری لە رێگای دانی قەرزی بیست ساڵە بە سوودی ٢/٥٪ ئاسان بکەنەوە. بەرێز رابێرت مەك نامارا، سەرۆکی لیژنەی بەرێوەبەری بانکی جیهانی و بەرێوەبەری دراوی نێونەتەوەیی قورس وقایم لەم گەلاّڵەیە پشتیوانی کرد.

بەرنامەیەکم لەبواری گەشەپێدانی ئابووریدا دارشتبوو کە لەو چوارچێوەیەدا بانکێکی نێونەتەوەیی گەشەپێدان دەیتوانی یارمەتی هەر ولاّتێکی جیهان سێیەمی بدات کە تووشی گیروگرفتێك دەبووەوە. ئەم بەرنامەیە، بە دوورێگا هانی هاریکاری و گەشەپێدانی ئابووری لەئاستی جیهاندا دەدا:

١- لەرێگای یارمەتیدان بەگەشەکردنی پیشەسازی ولاّتانی لەحاڵی گەشە کردندا

٢- لەرێگای زەمانەت کردنی راسپاردەکان بە ولاّتانی پیشەسازی

رێکخراوێکی بەم جۆرە دەیتوانی بەتەواوەتی بێ لایەن و سەربەخۆ و دوور لە ئینتیمای سیاسی بمێنێتەوە و بەرووی هەمووانەدا کراوە بێت. ئەم بونیادە دەیتوانی دەور ونەقشێکی وەك هەرەوەزیێکی جیهانی بگێرێت یان تەنانەت لەمەباشتر، وەك رێکخراوێکی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان بێت بەلاّم بە دەسەلاّتی جێبەجێ کردنەوە.

ئەم پێشنیازانەی پێکهێنانی هاوکاری نێونەتەوەیی لە بواری ئابووریدا، لە چوارچێوەی تێکۆشانێك دا بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی وزە وبە تەواوی و بەو جۆرەی کەلە سەرەوە باسکرا لە گۆڤاری لۆمۆندی دیپلۆماتیك دا بلاّوکرایەوە.

بەداخـەوە، نەلەلایـەن وڵاتـانی پیـشەسازییەوەو نـە لەلایـەن وڵاتـانی ئۆپێکـەوە وڵامێکی ئەرێنی نەدرایەوە.

بێگومـان ئـەم گەڵاڵەیـە بوێرانـە بـوو، بـەڵام خـەون و خـەیاڵیش نـەبوو. بە تایبـەت راستەوخۆ بۆ راکێشانی هاوپەیوەنـدی جیهانی درێـژرابووو دەیتـوانی ببێـت بـە پێکهێنـــەرێکی زۆر کاریگـــەر لـــە ســـەقامگیری سیاســـیو ئـــابووری جیهانـــدا. ئاوەڕووکـارانی کارامـە لـەوەها گەڵاڵەیـەک دەترسـان. بیر لـەوە بکەنـەوە کـە ئەگـەر پیلانـی "سـوورو ڕەش" هەرەسـی دەهێنـا و ئێـران رۆژانـە ٥ تـا ٦ ملیـۆن بـەرمیل نـەوتی بـە نرخـی رۆژ دەفرۆشـت چ دەبـوو؟ دەمـان تـوانی چ هـەنگاوێکی گـەورە هـەڵبگرین. هاتنـەدی ئامانجەکانی شۆڕشـی شـاو خـەڵک نـزیکتر دەبووەوە. دەمـان تـوانی چ خزمـەتێك بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەو گیروگرفتانـەی کـە لـە وتووێـژەکانی باکوورو باشووردا هەیە ئەنجام بدەین.

لەگـەڵ والـری ژیسکاردێـستن، سـەرۆك کۆمـاری فەرەنـسا، قـسەوباسی زۆرم لـەم بـارەوەکرد. بیروڕاکانمـان وەك یـەك وابـوو. هـەر دوولامـان قـەبووڵمان بـوو کـە بـۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە، پێویستە پرسە گرنگەکانی ئـابووریو سیاسـی – بەتایبـەت سـەبارەت بـە وزە– بەگشتی لـە ئاسـتێکی جیهانیدا بکەوێتـە بـەرباس و لێکۆڵینـەوە. ئاشـتی جیهـانی گرێـدراوی ئـەم پرسـانەیە. هیـوادارم کـە سـەرۆك ژیسکاردێـــستن، ســـەرەڕای هـــەموو گیروگرفتێـــك، لـــە تێکۆشـــانی خـــۆی بـــۆ سەقامگیرکردنی هاوکاری راستەقینەی جیهانی بەردەوام بێ.

# فەسڵی ٢١

# گەورەپیاوانی جیهان

لــە ســـەردەمی دەســـەڵاتداری بـــاوکم دا، کاروبارەکـــانی دەرەوەی وڵات بـــەهۆی باڵوێزەکانەوە سەرپەرشتی دەکراو تا ئەو جێی کە پەیوەندی بەئێمەوە بوو، ئەمانە هەمیشە باڵوێزانی خۆمان نەبوون‌و من لەشوێنی دیکەدا ئاماژەم بەم بابەتە کردوە. ئەم ڕۆژانە سەفەرکردن زۆرئاسان بووەتەوە بە جۆرێکە سەرۆکێن وڵاتان هەرکات بیانەوێت دەتوانن یەکتربیبینن‌و من بەش بەحاڵی خۆم لەماوەی سی‌وحەوت ساڵ پاشایەتیم دا، لەهیچ شتێك هێندەی ئەم دیپلۆماسیەتە نوێە خوشحاڵ نەبوومە. بـۆ شـرۆڤەکردنی تـەواوو تەنانـەت پوختـەی چـاوپێکەوتنەکانی مـن لەگـەڵ سیاسـەتوانانی بیـانی دا پـەرتووکێکی گـەورەش بـەش ناکـات. ئـەم سـەردانانە زۆرباشتر لە نووسراوە لەبڕان نـەهاتووەکانی رابـردوو یارمـەتی چارەسـەرکردنی ناکۆکییەکانی نێـوان کەسـانی نیازپـاك دەدات‌و زەمینـەی پاراسـتنی مـافی یـەکتر فەراهەم دەکات.

### نیشتمانپەروەری دوگوڵ:

ئەوکاتەی کە ژەنراڵ دوگوڵ لەساڵی ١٩٤٣دا بۆ سەردانی مسکۆ بەتاران دا تێپەڕی مـن پاشـایەکی زۆرگـەنج بـووم. ڕاسـت هەرلەسـەرەتادا، کەوتـە ژێرکاریگـەری

کەسایەتی نائاسایی ئەو. کاتێك دەربارەی فەرەنسا قسەی دەکرد دەمدیت باسی هەمان ئەوئاواتانەی دەکات کەمن بۆولاتەکەم هەم بوو: ئەو کەخوازیاری فەرەنسایەکی سەربەخۆبوو، زمان پاراویی ئارامو لەسەرخۆی ئیمانی ئەوی بەداهاتووی ولاتەکەی نیشان دەدا.

هەڵبەت ئێمەچەندجاری دیکە لەپاریسو تاران دا چاومان بەیەك کەوتو لەوماوەشدا توانیمان پەیوەندییەکانمان توندوتۆڵتربکەین. پێویستە بوترێت کە ئێمەهەمیشە لەرێگای نامەوە لەپەیوەندی دابووین.

کاتێکە ئەوکۆچی دوایی کرد، بۆبەشداری کردن لەرێوڕەسمی بەخاك سپاردنی کەلە نوتێردام دا بەرێوەچوو سەردانی پاریسم کرد، سەرۆکی هەموو ولاتەکان ئامادەبوون. بەلام من تەنیا کەسێك بووم کە خاتوو دوگۆڵ لەتەنیایی تازیەباریدا لەکۆلۆمبە چاوی پێمکەوت. ئەم بایەخ دانانەی ئەو زۆرکاری لەمن کرد، چونکە نیشانەی پەیوەندی نزیکی منو ژەنراڵ بوو. ئەم نیشتمانپەروەرە مەزنە بۆمن نموونەو سەرباشقەبوو. وەك بەڵگەیەك بۆمەزنی ئەو بەسە ولاتی فەرەنسا لەسەرەتای دەسەلاتداری ئەوداو لەکاتی وازهێنانیدا بەراوردبکرێت.

## ئامادەبوونی سێ گەورە دەسەلاتدار لەکۆبوونەوەی تاراندا:

کۆبوونەوەی تاران منی لەگەڵ دووگەورە دەسەلاتداری دیکەی مێژووی هاوچەرخ، واتا ستالینو رۆزڤێلت بەرەو رووکرد. سییەم کەسیان، واتا چرچیل پێشتر چاوم پێکەوتبوو. حەزدەکەم ئاماژە بەم خاڵە بدەم کەلەسێ بەشداربووی کۆبوونەوەکە، تەنیا ستالین بوو کەهات بۆسەردانی منو رێوڕەسمی تایبەت بەسەرۆکی دەوڵەتی خانەخوێی لەبەرچاوگرت.

بەلام بۆچاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز رۆزڤێلتو بەرێز چرچیل، من ناچاربووم برۆم بۆ باڵوێزخانەی رووسیا.

سەبارت بەچاوپێکەوتنم لەگەڵ ستالین شت زۆرە بۆوتن. بۆ نموونە لەبیری ناکەم کەبە پەلەو پەتی رایگەیاند:" بۆپەنجاساڵی داهاتوو بەهیچ جۆر نیگەران مەبن!" ئایادەبوو ئەمە وەك ئەو زەمانەتەی کە تزارەکان بەبنەماڵەی قاجارپیاندا چاولێبکەم؟ ستالین لەڕادەبەدەر بەرێزبوو، بەجۆرێکە هەتا من چاکەم نەخواردەوە ئەو دەستی بۆچاکەی نەبردو بە وتووێژکردن دەربارەی سەدان بابەت ئۆگری نیشان دەدا. بەلام من، واتا پاشایەکی گەنجی نیشتمانپەروەر کەلەناوچوونی سوپای وڵاتەکەی، یان باشتر بڵێم بیٚ بەشی سوپای وڵاتەکەی لە چەكوچۆڵ لە سەردەمی پەلاماری رووس و بریتانیادا دیبوو، زۆر حەزم دەکرد لە پێویستیمان بەتانك و فڕۆکە قسەبکەم.

دەسبەجێ بەڵێنی زرێپۆش و فڕۆکەی بەمن دا. چۆنیەتی وەرگرتنی ئەمانەو ڕاهێنانی سەربازەکانمان دەبوو دواتر جێبەجێ بکرێت. بەگەرمی سوپاسی ئەم بڕیارەی ستالینم کرد. هەستم بەئاسوودەیەی کرد کەبۆ سەربەخۆیی و سەرفیرازی وڵاتەکەم هەنگاوێکی گەورەم هەڵگرتووە. چەند حەوتوو دواتر، نێردراوی تایبەتی ستالین منی لەو هەل‌ومەرجەیٚ کە ئەو بۆ جێبەجێ کردنی ئەم رێکەوتنە دیاری کردبوو ئاگادارکردەوە. ئەم هەل‌ومەرجە زۆردژوار بوو وئێمەی ناچاردەکرد کە تانکەکان لەقەزوێن، هەڵکەوتوو لە رۆژئاوای تاران و فڕۆکەکان لە مەشهەد لە باکووری رۆژهەلاتی ئێراندا جێگیربکەین و، سەرئەنجام ئەوەی کە، هەردووی ئەم یەکانە تاکۆتایی شەڕ لەژێرفەرماندەیی سۆڤیەتیەکاندا بێت. ئاشکرایە کە ئەم هەل‌ومەرجە بیٚ هیچ تێبینێك لە لایەن منەوە رەت کرایەوەو لەمەبەدوا ململانێم لەگەڵ ستالین دەسپێکرد.

بەلام ئەم دۆزە ریٚ لەوە ناگرێت کەمن ئەو وەك گەورەپیاوێك بناسم. سەرکەوتووی گەورەی شەڕی دووەمی جیهانی ستالین بوو نەچرچیڵ. لە کۆبوونەوەکانی تاران و یالتا و پۆتسدام دا ئەوە ئەوبوو کە ئەوانی تری کرد بەئامرازی دەستی خۆی. بەکورتی بڵێم، ئەو ئاشتییێکی بۆ سۆڤیەت مسۆگەر کرد کە سی‌وپێنج ساڵ بەردەوام بوو.

ئێستا کەسەبارەت بەپەیوەندیم لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت دا قسەدەکەم، حەزدەکەم ئەوە بڵێم کەجێنشینانی ستالینیش نەیان هێشت من ئاسوودەبم. بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە بچووکترین ئینتیمام بۆ رێبازی کۆمۆنیستی نەبووو سەردەمی پاشایەتیم شەڕێکی دووورودرێژ بوو لەگەڵ کۆمۆنیزم. لەبەرئەوەی کە بەتەواوی ئاگاداربووم کە ئەم ململانێیە مەترسیدارە، لە بەرەو رووبوونەوە لەگەڵ دراوسێ یەکی بەهێزدا ئامادەی قەبووڵ کردنی ئەو مەترسیانە بووم. بەمجۆرە تاکاتی یەکەم سەردانم بۆمسکۆ لەساڵی ١٩٥٦دا تاریکییێك باڵی بەسەر پەیوەندییەکانماندا کێشابوو.

ماوەیەك دوای واژۆکردنی رێکەوتننامەی بەغدا چاوم بە خرۆشچۆف کەوت (پێشترئاماژەم بە کاردانەوەی ئەو بەرامبەر بەم رێکەوتنەکردوە) راگرتنی پەیوەندی لەگەڵ نیکیتاخرۆشچۆف دا زۆردژواربوو. پیاوێکی زۆر وردو کۆڵنەدەربوو. بەلام هەستی دێهاتیانەی ناوبراو جاروبار قسەخۆشی و زیرەکییەکەی زیاتر بەرجستە دەکردو لەبەردلاتر نیشانی دەدا. پێکەوە لەسەر سیاسەتی رێزی دراوسێیەتی کە ئەقڵ بە پێویستی دەزانی رێکەوتین و کۆڵنەدەرانە پێی وەفادار ماینەوە.

بەلام چەندجارێك لە رووسیاو لەئێران چاوم بە بەرێزلئۆنیدبرژنۆف کەوت. هەرچەند کە وتووێژەکانی نێوانمان هەندێ جار زۆرئالۆز دەبوو، بەلام بیرەوەری خۆشم لەناوبراو هەیە. جیالەهەموو جیاوازییەکانمان لە بیروبۆچووندا، ناتوانم لە دڵەوە ستایشی بەرێزبرژنۆف نەکەم. هەموو نیشانەکان، ئەو وەك دیپلۆماتێکی بەرجەستە نیشان دەدات. ئەو رێزدەگرێت لە پێکەوەژیانی ئاشتیانە لەسەربنەمای رێکەوتنی هێلسینکی و توانیویەتی ولاتەکەی بکات بەخاوەن ئەو هێزەو دەسەلاتەی کە ئەمڕۆ هەیەتی: سۆڤیەت کەلەرووی هێزی ناووکییەوە پلەی یەکەمی لە جیهاندا هەیە، بەمزووانە لە رووی هێزی دەریاییشەوە پلەی یەکەم بەدەست دێنێت و، لە بواری هێزی زەوینی و ئاسمانیشدا سەرکەوتن یان لە ئاستێکدایە کەبەهیچ جۆر جێگای بەراوردکردن نییە.

بگەڕینەوە بۆکۆبوونەوەی یالتاو ئەو چاوپێکەوتننانەی کەلەو سەردەمەدا هەمبوو. پێشتر گوتم کە چۆن ناچاربووم بۆدیتنی سەرۆك رۆزڤێلت بڕۆم بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت. ئەو لەو سەردەمەدا ناو بانگێکی زۆری هەبوو. کاتێکە ئەم پیاوە لە دڵاشیرینە داوای لەمن کرد کە لە پاش تەواوبوونی ماوەی سەرۆك کۆمارییەکەی وەك پسپۆڕی بووژانەوەی دارستانەکان دەسنیشانی بکەم، دەکرێ مەزەندەبکرێ کە چەند لەم قسەیەی ئەو سەرسام بووم. ئەم داواکارییەی ئەو مانای چی بوو؟ ئایا بەو مانابوو کەلە روانگەی ئەوەوە داهاتووی ئێران ئەوەندە جێگای دڵنیاییە کە ئێستا ئێمە دەبێت دەست بەبووژانەوەی دارستانەکانمان بکەین؟
سەبارەت بەچرچیڵ، دەبێت بڵێم یەکەم جار کەچاوم بەناوبراو کەوت کاتێك بوو کەلە درێژەی سەردانی دا بۆ مسکۆ لە تاراندا مابووەوە. دەربارەی شەڕ بە دوور ودرێژی قسەمان کرد. سەرەڕای لاویەتیم، بۆچوونەکانی خۆم سەبارەت بە سیاسەت و پرسە سەربازییەکان بوێرانە دەربڕی. من باوڕم وابوو کە دەبوو هاوپەیمانان لە باشوورەوە، یانێ لاوازترین خاڵ، پەلاماری ئەورووپا بدەن. ئیتالیا و باڵکان خاڵی گونجاوبوون. چرچیڵ لە کورسیەکەی را چووبوو وبەروخساری گرژیەوە چاوی لەسەرم هەڵنەدەگرت. لە تەواوی ماوەی قسەکردنمدا رووی لێم ون نەکرد. کاتێ قسەکانم تەواوبوو هیچ بۆچوونێکم لەو نەبیست. سالاّنێکی دواتر کە بیرەوەرییەکانیم دەخوێندەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو بیرۆکانەی کە لە تاراندا بۆ ناوبراوم شرۆڤە کردبوو لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەودا رێك دەهاتەوە.
ئەو لەو پەڕی بوێری و لەسەرخۆیی دا ولاتەکەی بەرەو سەرکەوتن رێبەری کرد. دواتر چەندجار لەبریتانیا چاوم بەئەو کەوت. کاتێکە دووبارە بووەوە بە سەرۆکی وەزیران، رۆژێك لەگەڵ ئەو لەخانووی ژمارە ١٠ی شەقامی داونینگ دا نیوەرۆژەمان دەخوارد کە هاوسەرەکەی لەمنی پرسی: ئایا باشتر نییە چرچیڵ پاش وازهێنانی لە سەرۆکایەتیەکەی دەوری " سیاسەتوانێکی پیر" کە جۆرێ " پیاوی زانا " یە بگێڕێت. ولاّمی من نەرێنی بوو. جێ و رێی وینستۆن چرچیڵ بە

جۆرێک بوو کە بەرای من روون بوو: لەبەر بەرژەوەندی مێژووی جیهان و بەرژەوەندی هاوچەرخەکانی خۆی باشترە چرچیڵ لە پلەی سەرۆکی وەزیراندا بمێنێتەوە و هەر ئەو سیاسەتوانە سەرکەوتووە بێت کە جیهان ستایشی کرد.

## رێبەرانی ئەمریکا:

کاتێک بیر لە ئەمریکای بەهێزو نەجیم دەکەمەوە ناوی ئایزێنهاڤێرو ئاورێل هریمن و ریچاردنیکسۆن و ترۆمێن و لیندۆن جانسۆن دیتەوە بیرم. بێ گومان مێژوو لە ئایزێنهاڤێر وەك سەربازێکی راستەقینە یاددەکات و منیش بەش بە حاڵی خۆم، زیاتر لە هەموو شتێك مێهرەبانی ئەوم لە بیرە. ئایزێنهاڤێر لە بنەڕەتدا مرۆڤێکی دڵنەرم بوو کە دەیزانی چۆن دڵی ئەمریکییەکان بگرێت و، منیش " ئایك " م خۆش دەویست.
بەئەرکی خۆم دەزانی و لەراستیدا بۆمن شانازییێکی گەورەبوو، کەلەرێوڕەسمی بەخاك سپاردنی ئەم سەربازە، سەربەرزە و ئەم ئەمریکییەمەزنەدا بەشداری بکەم. ئەوم لەبیرنەکردوە. لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودابوو کە ویلایەتەیەککگرتووەکان لە هەمبەر سیاسەتەکانی موسەدێق دا پشتیوانیان لەمن کرد. لەبەرئەوە بۆچوونی گشتی وابورکە سیاسەتەکانی موسەدێق بۆ دونیای ئازاد بەڵاهێنەرەو زەمینەی رووخانی ئێران دەڕەخسێنێت. دەبێت دانی پێدابنرێت کەسیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، لەژێر رێبەرایەتی جۆن فاستێردالَس دا، ئەوکاتە زۆر بەهێزبوو و لەبەبڕشت بوونیشی دا قسەهەڵناگرێت.
لە ١٩٥٣ بەملا، لەگەڵ ریچاردنیکسۆن دا پەیوەندییێکی دۆستانەی زۆرقایمم هەبوو. ئەو لەو سەردەمەدا جێگری سەرۆك ئایزێنهاڤێر بوو. لە سەردەمی سەرۆك کۆماری ئەودا پەیوەندی ئێمە لە گەل ویلایەتە یەککگرتووەکاندا گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرزو لەسەردەمی جراڵدفۆردیشدا هەرلەم ئاستەدا مایەوە. سەبارەت بە پەیوەندییەکانی دەرەوە نیکسۆن روانگەیەکی روونی دەربارەی مرۆڤەکان و

ڕووداوەکان هەبووو هێشتا ش هەیەتی. سیاسەتی ئەو بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی ڤیتنام و ئاسایی کردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ کۆماری خەڵکی چین دا سیاسەتێکی هەڵسەنگێندراو، زیرەکانەو بەپارێزەوە بوو. شێوازی زۆر وردی ئەو لە پێکهێنانی هاوسەنگی هێزەکانی جیهاندا پلەوپایەیەکی تایبەتی بە ویلایەتەیەکگرتووەکان بەخشی.

پێش لەوەی نیکسۆن ببێت بە سەرۆك کۆمار، لەتاراندا پێکەوە وتووێژێکی چڕوپڕمان هەبووو دەرکەوت کەسەبارەت بەزۆرێك لەبنەماسادەکانی جیۆپۆلتیك بۆچوونی وەك یەکمان هەیە. بۆ نموونە: هەر نەتەوەیەك دەبێت بەدوای یەککگرتن لەگەڵ " هاوپەیمانانی سروشتیی خۆی " دابێت، واتا ئەو وڵاتانەی کەبەهۆی بەرژەوەندی هاوبەش و بەردەوام لەگەڵیان پەیوەندی هەیە. دەبێت چاودێری بکرێت هەتا لەپێکهاتنی یەکێتی گومانـاوی دووری بکرێت، چونکە هەمیشە ئەومەترسییە هەیە کە وەها یەککگرتنێك رەنگە ببێتە هۆی دەردی سەرو هاوپەیمانێکی دڵنیاو بەردەوام چاکترە لە دە هاوبەش کە رەنگە لەکاتی مەترسیدا خۆبدزنەوە. ریچاردنیکسۆن راست یەکێك لەو ئەمریکیانەیە کەبەهاتنی بۆ تاراوگەی کوئێرناواکا ئەمەگناسی خۆی بەرامبەر بە دۆستێکی دێرینی سەلماند.

هێنری کیسێنجێرم لەو کاتەوە دەناسی کە سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو. ئەو سەرئەنجام پۆستی وەزارەتی دەرەوەی لە سەردەمی نیکسۆن و فۆرددا بەدەستهێنا. کیسێنجێر پیاوێکە کەئەزموونی دوورو درێژی ئەو دەرفەتەی بۆ پێکهێناوە هەتا لە زانیاری سیاسی دەستی یەکەم – جا ئەمریکی بێت یان نێونەتەوەیی – بەباشترین شێوە کەڵك وەربگرێت.

دەبێت بڵێم کە کیسێنجێرم هەمیشە بە کەسێکی راستگۆ دیوە. پابەند بەو بنەمایانەیە کە خۆی باوڕی پێی هەیەو بە ئاگاداربوون لە توانایی و بەپرسایەتی ئەمریکا لە پێکهێنانی هاوسەنگی هێزو دابین کردنی ئاشتییێکی جیهانی و سەربەرزانەدا، خزمەتی وڵاتەکەی دەکات. پێویستە ئەوەش زیادبکەم کە روانگەی جیوپۆلیتیکی ناوبراو بە تەواوەتی لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی من دا یەك دەگرێتەوە.

هێنری کیسینجێر هۆشێکی بەراستی جیاوازی هەبووو هەروەها دووتایبەت مەندی هەیە کەبەداخەوە لە زۆرێك لەگەورەپیاواندا نابینرێت: هەم بیسەرێکی باشەو هەم شۆخێکی باش.

لە سەردەمی سەرۆك کۆماری جراڵدفۆرد دا، کاتێکە کیسینجێر بۆ راگەیاندنی رێکەوتننامەی بازرگانی پەنجا ساڵەی پەنجا ملیاردۆلاری سەردانی ئێرانی کرد پەیوەندی دوو وڵات گەیشتە بەرزترین ئاستی خۆی.

لەناوسیاسەتوانانی ئەمریکا کە بیرەوەرییێکی روونم لێیان هەیە دەبێت لە ئاورێل هریمن و سەرۆك ترۆمێن و سەرۆك لیندۆن جانسۆن یادبکەم. هریمن م لە سەردەمی شەڕەوە دەناسی و بەردەوام بۆ ئەم کەسایەتیە گەورەی حیزبی دیمۆکرات رێزێکی زۆرم دادەنا. سەرۆك ترومێن لەچرکەساتەگەورەکانی مێژوویی دا دەیزانی کە چۆن بەبڕشت بوونی خۆی نیشان بدات. بەڵام لیندۆن جانسۆن، لە روانگەی منەوە سەرۆك کۆمارێکی گەورەبوو کە رەنگە مێژوو وەك پێویست بایەخی پێنەدابێت. هاوسەرەکەشی لیدی بێرد خاوەن تایبەت مەندی گەلێکی بەرزو بەرچاو بوو.

## جۆرجی شەشەم پاشای بریتانیا، بێڤین و بلوم:

لە ساڵی ١٩٤٨دا بوو کەبۆ یەکەم جار لە پۆستی پاشایەتی دا سەردانی دەرەوەی وڵات و لەندەنم کرد. لەو ساڵەدا یارییەکانی ئۆلەمپی لە لەندەن دا بەرێوەدەچوو و رەنگە هەرلەبەر ئەم هۆکارە بێت کە کاربەدەستانی بەرپرسی پێشوازی کردنی فەرمی لە بەرئەوەی گرفتاری کاروباری یارییەکان بوون، نەیان توانی ئەو جۆرەی کە پێویست بوو ئەرکی خۆیان بەرامبەر بەمن جێبەجێ بکەن. بەڵام خاوەن شکۆ، جۆرجی شەشەم و بنەماڵەکەی بەرێزەوە پێشوازییان لەمن کردو لەم چاوپێکەوتنەدا بیرەوەری خۆشم بۆمایەوە.

لەلەندەن لە گەل بەرێز بێڤین وەزیری کاروباری دەرەوە وتووێژێکی دوورو درێژم هەبوو. لە کاتی قسەکردن دەربارەی سەرچاوە سروشتییەکانی ئێران، کاتێك

ئاماژەم بە ناوچەی کرمان کرد، بێڤین هاواری کرد:" راستە، کرمان ! لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئێمەدا..."

قسەکەیم پێ بڕی و گوتم:" بەڵام دەبێت بڵێم کە سەرانسەری ئێران لەریزی وڵاتانی ئازاد دایە."

بێڤین بە پەلە وڵامی دایەوە:" مەبەستی منیش هەر ئەوە بوو."و سێ مانگ دواتر، فەخرئارایی لە چەند مەترییەوە بەرگوللەی دام.

هەر لەساڵی ١٩٤٨دا، سەردانی فەرەنسام کردو لەگەڵ سەرۆك لئۆن بلوم و گیمولە دا چاوپێکەوتنێکی دوورو درێژم هەبوو. پاش ئەوەی کە باسێکی گشتیم لەسەر بەرنامەی چاکسازی کۆمەڵایەتی خۆمان خستەروو، لە گەل ئەم دوو رێبەرەی دونیای فەرەنسەیی زمان دا پەیوەندییێکی باشم دامەزراند، دەتوانم بڵێم کە بەشێوەیەکی باش کاریگەریم لەسەر ئەوان دانا. لەگەڵ رێبەرانی دیکەی وڵاتانی رۆژئاوایی دا پەیوەندییێکی دۆستانەم هەبوو. پێشتر یادم لە والری ژیسکاردێستن، ئەم پیاوە پڕجم وجۆڵە کردوەتەوە.

## گەورەپیاوانی ئەفریقا:

بیرەوەری چاوپێکەوتن لەگەڵ هایلەسەلاسی ئیمپراتۆری ئەتیوپیا هەمیشە بەلای منەوە مایەی خۆشی بووە. ئەم مرۆڤە بەگوێرەوتینێکی نیشتمانپەروەرانەی بێ وێنەوە لە هەمبەر ئیتالیاییەکاندا خۆڕاگری کرد. وتووێژەکانمان زۆر گیانی بەگیانی و لە رووی راستییەوە بوو وجاروبار پێم لەسەر جەرگی خۆم دەناو ئەنجامدانی چاکسازی جۆراوجۆرم بەناوبراو پێشنیازدەکرد. ئەو کاتەی کە قوتابییێکی لاوبووم، بەرگرییەکانی ئەوم لەسەرکورسی ئاخاوتنی کۆمەڵەی گەلان لە جنێڤ دا بیست. ئەو لەداکۆکی کردن لە وڵاتەکەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. کۆمەڵەی گەلان دەسەڵاتێکی نەبوو و توانایی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانیش لەو زیاتر نەبوو. ئەمڕۆ چی بەسەر ئەتیوپیادا هاتووە؟

ئێمە لەبیری ئەوەدابووین کە یارمەتییێکی زیاتری ساحیلی عاج بدەین کە لەلایەن بەرێز هوفودبۆئانیی – یەوە سەرۆکایەتی دەکرا. سیاسەتی ئێمە سەبارەت بە ولاتانی دیکەی فەرەنسەیی زمانی ئەفریقا وەك گابۆن و سێنگاڵ یش هەربەم شێوەبووە.

پەیوەندی دوستانەی من و سەرۆك سەنگور زۆرقایم و بەردەوام بوو. ئەم سیاسەتوانە کەخاوەن پلەو پایەو رێزێکی جیهانییە، نەتەنیا بەڕێوەبەرێکی دیارو بەرچاو بەڵکو مامۆستای زمانی فەرەنسی و شاعیرێکی بەنرخیشە. لەگەڵ ئەودا سەبارەت بە نێگریتوود، کە رێبازێکی رەسەنی تێکەڵاوی فەرهەنگییە بەدرێژی قسەم کرد. ئەم رێبازە لە ناخم دا زرنگایەوە، لەبەرئەوەی لە تەواوی ماوەی ژیانمدا بەردەوام بە دوای قووڵترین و کۆنترین ریشەکانی ولاتەکەمدا گەڕاوم. بە هۆی هاندانی سەرۆك سەنگورەوە بوو کەبەدوای سیاسەتی تایبەت بە ئەفریقادا رۆشتین. بەداخەوە نەمتوانی بۆخۆم سەردانی سێنگاڵ بکەم بەلام شابانوو بە نوێنەرایەتی من سەردانی ئەوێی کردو پێشوازییێکی گەرم وگوڕی لێکرا.

## دۆستانی عەرەبم:

دۆستم حەسەنی دووەم، ئەوکاتەی نیشتمانپەروەری خۆی سەلماند کە هێشتا جێ نشین بوو. ئەو کە بەخت و ناوچاوانێکی باشی هەیە، توانیویەتی لە چەندین پەلاماری کوشتن رزگاری بێت و لە شەڕی بەناوبانگی گرتنەوەی بیابانەدا سەربکەوێت. پاشایەکە بە تایبەتمەندی هۆشی جیاوازەوە. ناوبراو لە نەوەی پێغەمبەرەو دوکتۆرای مافی لە زانکۆی بێردو وەرگرتووەو بەم شێوەیە لە دوو فەرهەنگی ئەورووپی و قورئانی بە تەواوەتی سوودمەندە. پێویست بە وتنیش ناکات بەلام دۆعا بۆخۆی و گەلە ئەمەگناسەکەی دەکەم.

دوابەدوای ئەو رووداوە بەئازارانەی کەلەم مانگانەی دواییدا بەسەرمن و خێزانەکەمدا هات، ئەو ئاوڕێکی بێ وێنەی لە ئێمە دایەوەو زمانم ناتوانێت

منەتباری و سوپاسی ئەوم لە دڵدا دەربڕێت. ئەو بەم کارەی بەرەو رووی هەموو ئەو کەسانەی وەستایەوە کە فەرموودەکانی پێغەمبەریان لە بیرکردوە.
نابێت لەبیری بکەین کە ئەنوەرسادات، جێنشینی ناسر، سەرۆکایەتی وڵاتێکی گرتە ئەستۆ کە نەتەنیا شکستی خواردبوو بەڵکو سووکایەتیشی پێکرابوو و دروشمێن درۆین، بیروڕای گشتیشی سەبارەت بەم وڵاتە بەلارێدا بردبوو. ئەو دووبارە دەستی دایەوە شەڕو بەپاڵپشتی چەكوچۆڵەکانی سۆڤیەت، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەڵام ئەم سەرکەوتنە بۆ ئەو هەڵگری نرخێکی گران بوو و لەراستیدا لەبەرسەقامگیرکردنی ئاشتی بوو کە راوێژکارانی رووسی دەرکردو سیاسەتێکی سەربەخۆی تەنیا لەپێناو بەرژەوەندی خەڵکی میسردا داڕشت.
بەکردەوە دەرهێنانی ئەم گۆڕانە لە سیاسەت دا پێویستی بە تێگەیشتنێکی سیاسی بەرین و ئازایەتی زۆر هەبوو، هەربۆیە، لە مێژوودا لە سادات وەك بلیمەتێکی بەنرخی میسر یاد دەکرێتەوە. لەناخی دڵمەوە و بەوپەڕی دڵسۆزی و پاکییەوە بۆ ئەم میسریەمەزنەو گەلەکەی دۆعادەکەم و لەمەش زیاترهیچم لەدەست نایەت.
بەڵام سەبارەت بە شاحوسەین پاشای ئەردەن، ستایشی ئەم پیاوەم بۆناکرێت. ئەو نەتەنیا دۆستی من بەڵکو برامە. بوێری زۆرو خۆشەویستی راستەقینەی بۆ وڵاتەکەی ئازایەتی و دڵپاکی ئەو دووهێندە دەکات. لە راستیدا ئەگەر شارەزای هەڵکەوتەی ستراتیجی ئەردەن نەبێت لە هەڵس وکەوتی بەرزودڵئاوەڵایی ئەو تێناگەیت. لە زۆربەی رووداوەکاندا، حوسەین لە بەرەو رووبوونەوە لە گەل گیروگرفتەکاندا قورس وقایم هەنگاوی هەڵگرتووە. تێگەیشتنی لە سیاسەت و بەبڕشت بوونی ئەوی لە چواررێیانی رووداوەکانی دونیادا داناوە و شیاوی ئەوەیە کە بەهەموونئاواتەکانی بگات.
حەزدەکەم باسی رووداوێك بکەم کە بەبڕشت بوونی و دڵنیایی حوسەین نیشان دەدات. بەفیتی عەبدولناسرو بەشداری یەکێك لە ژەنراڵەکان، کوودەتایەك لە ئەردەن دا کراو پادگانێك بە تەواوەتی یاخی بوو. حوسەین بەشەوقی

نیشتمانپەروەری و بوێری و بێ پاسەوان ڕۆشت بۆپادگانەکەو ئەوەندە بەدەنگەوازێکی ژیرانەو قایمەوە قسەی بۆ سەربازەکان کرد کە پاش کۆتایی هاتنی قسەکانی سەربازەکان هوتاڤیان بۆ کێشاو پەشیمان بوونەوە.

## تیتۆ، چائۆشسکۆ، هواکۆئۆفێنگ:

پێویستە جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ دونیای کۆمۆنیزم و یادێک لە سێ کەس لەڕێبەرانی ئەو دونیایە واتا تیتوو چائۆشسکۆو بەڕێزهواکۆئۆفێنگ بکەم کە هەرکام لەوان پلەوپایەکی تایبەت بەخۆو جیاوازیان هەیە. ئەگەر وانەکەم ئەوا باسەکەم سەبارەت بە گەورەپیاوان ناتەواو دەمێنێتەوە.

جگە لەئێران، یوگۆسلاڤیا تەنیا وڵاتێک بوو کەلەژێر هەلومەرجێکی دژوارداو، ناڵێم بەژان، لە هەمبەر جۆزێف ستالین دا خۆڕاگری کرد. لێک نزیک کردنەوەو یەکخستنی نەتەوەجیاوازەکان و مۆدێرنیزەکردنی وڵاتێکی وەک یوگۆسلاڤیا ئیشێکی ئاسان نەبووو دەبێت دان بەوەدا بنرێت کە مارشاڵ تیتۆ ئیشیکی بێ وێنەی ئەنجام دا. لە خوا دەپاڕێمەوە کە جێنشینانی تیتۆش هێزوتوانایی ئەویان هەبێت.

حەزدەکەم ڕێزی خۆم بەرامبەر بە نیشتمانپەروەری قایم و ئیرادەی بەهێزی سەرۆک کۆماری ڕۆمانیا لە پارێزگاری کردن لە سەربەخۆیی وڵاتەکەی دەرببڕم. یەکیەتی من و ئەو سەرچاوەی لە دۆستایەتی نزیکمان گرتبوو. ئایا پێویستە کە دیسان بەبیری بێنمەوە بازرگانی ئێمە نەتەنیا لەگەڵ ڕۆمانیادا بەڵکو لەگەڵ هەموووڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا لەحاڵی پەرەسەندن دا بوو؟ ئەمەش وەک زۆربەی ئیشەکانی تر سیاسەتی سەربەخۆیی خوازانەی ئێمەو پێکەوەبوون و یەکیەتیمان لەگەڵ گەلانی نیازپاکدا نیشان دەدا.

هەروەها پێویستە بەرامبەر بە ئەمەگناسی ڕێبەرانی چین کوڕنۆش ببەم. کاتێک بەڕێز هواکۆئۆفێنگ سەردانی کردم، واتا ئەوکاتەی قەیرانی ئێران گەشتبووە

**ئەوپەری خۆی، ئەو هەستەم لادروست بوو کە تەنیا چینییەکان خوازیاری ئێرانێکی بەهێزن.**

**لە کۆتاییدا، چۆن دەتوانم کۆتایی بەم فەسڵە کورتەبێنم و لەسەرۆک خوزەلوپزپۆرتی یو، کەلە وڵاتە جوان و ڕازاوەکەیدا سەرقاڵی نووسینی ئەم پەرتووکەم، ناوێك نەهێنم؟ کاتێکە لەساڵی ١٩٧٥دا، لە سەردانێکی فەرمی دا بۆ مەکزیك ستایشی سەرۆك لوپزپۆرتی یوم کرد، بەراستی هیچ بەخەیاڵمدا نەدەهات کە ڕۆژێك لەم وڵاتەدا ژیان بکەم. خۆشبەختی من لەوەدایە کە وڵاتی مەکزیك کەسێکی وەك بەرێز لوپزپۆرتی یو بەرێوەی دەبات. ئەو کەسێکی چالاکەو بڕوای بە پێویست بوونی هاوکارییە ئابوورییەکانی دوولایەنە نابێتە هۆی ئەوەی کە ئەرکەکانی خۆی لە پێناو سەربەخۆیی وڵاتەکەیدا لەبیربکات.**

## فەسڵی ٢٢

# دیمۆکراسی پاشایەتی بەوجۆرەی کەدەبوو ببێت

سیاسەتی ناوخۆیی لەم سێ بنەمایەوە سەرچاوەی گرتبوو: بەشداری، نەمانی ناوەندێتی، دیمۆکراسی. دەمویست خەڵکی ئێران لە بەڕێوەبردنی وڵاتو بنیاتنانی ئابورییەکەیدا بەشێوەیەکی زۆر شوین دانەرو بەرچاو بەشداری بکەن. دەبوو شۆڕشی سپی ئێمە بەم ئامانجانە بگەیەنێت. خانەکانی داد، ئەنجومەنەکانی گوندوشارو شارستانو پارێزگا بە دەسەڵاتی زۆرەوە، هەموویان بەئامرازی بەشداری کردنی سیاسی خەڵك دەهاتنە ئەژمار. بەشداربوونی کرێکاران لە بەڕێوەبردنو قازانجی یەکەگەورەکانی بەرهەم هێناندا بەئەنجام گەیشت بوو.

بەدڵنیاییەوە پێویست بوو کە دەوڵەت لە ناوەندەوە هەندێ لە کاروبارەکانی وەك سوپاو پۆلیسو سیاسەتی دەرەکیو دارایی بەڕێوەببات. وە بەتایبەت پەروەردەو فێرکردن کەلەزمانی فارسی پارێزگاری دەکردو سنوورەکەی بەرین دەکردەوە. بەکارهێنانی هەمەلایەنەی زمانی فارسی بۆگەیشتن بە یەکێتی بوو. بەڵام لە پارێزگاکاندا، بەرنامەی رادیۆیی بە زاراوەی ناوچەیی بڵاودەبووەوە.

ئۆگری تاك بە پارێزگاو شارو گوندەكەی كەلەژێر نیری دەسەلأتی ناوەندی رزگاری بووەبەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئۆگری بەنیشتمان لەدژایەتی دا نییە. راست بەپێچەوانە: سیاسەتی بەشداری كردن لەسیاسەتی نەمانی ناوەندێتی جیاناكرێتەوەو لەم سالأنەی دواییدا لەسەر سیاسەتی نەمانی ناوەندێتی پێداگریم دەكردو دەمویست تا ئاستێكی زۆر بەرەوپێشەوەی ببەم.

پێویست بوو بۆ جێبەجێ كردنی ئەم سیاسەتە چاكسازییێكی بنەڕەتی لە بەرێوەبردنی ولأتدا پێكبێت و هەربۆیە خۆمان دەستمان كرد بە پەروەردەكردنی فەرمانبەرانی دەوڵەتیی باش و دەروەست و دروستكار كەهەم نیشتمانپەروەرین و هەم داهێنەر. بەدڵنیاییەوە دەكرێ بڵێین كەتاساڵی ١٩٨٢ سێ ملیۆن كەس بەهێزی كاری ئێمە زیاددەبوو و هەروەها بەرێوەبەران و ئەندازیاران و پزیشكان و ئەو تەكنیك كارانەش كەلە قوتابخانەكانی تەكنیكی و پیشەیی دا پەروەردەدەكران دەهاتەپەنای ئەم هێزەو لەم ژمارەیە زیاددەبوو. سوپاش دەرفەتی كاركردن و پیشەی نوێی بۆلأوانی ئێمە پێك دەهێنا.

## پاشایی بەمانای دەسەلأت نییە:

لە ڕوانگەی منەوە گەیشتن بە دیموكراسی بێ بەشداری كردنی خەڵك و نەمانی ناوەندێتی ئاسان نابێت. بەلأم لێرەدا پێویستە ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەمەوە.

ڕۆژێك باوكم بەمنی گوت دەیەوێت ولأتێكم بۆ بەجێ بێڵێت " كەلەبەرهەبوونی دەزگایێن دەوڵەتی مكۆم و سەقامگیر بتوانێت بێ چاودێری كردنی ڕاستەوخۆی بەرپرسانی بالأ خۆی بەرێوەببات." لەوكاتەدا زۆرگەنج بووم و ئەم قسەیەی بابم بەلاوە خۆش نەبوو و ئەوم بە نەبوونی متمانەی بابم بەخۆم لێكدایەوە. پێم وابوو ڕەزاشا گومانی خۆی بەرامبەر بە لێهاتووی من بۆپاشایەتی دەردەبڕێت.

تەنیا ئەوكاتەی كە وازی لە دەسەلأت هێناو سەردەمی داگیركردنی ولأتم هات تێگەیشتم كەبەمیرات بردنی پاشایەتی مەشرووتە شتێكەو بەمیرات بردنی

دەسەڵات شتێکی تر. لێرەوەیە کەبۆپاراستنی وڵات لە بەرامبەر دەسەڵاتێکی ئۆلیگاریشیدا، پێویستی دامەزراندنی ناوەندگەلی راستەقینەی دیموکراتیک لە ئێراندا بە پێویستییێکی بێ ئەملاو ئەولا دەهاتە بەرچاو. رەنگە رەخنەم لێبگرن کەبۆ بەدی هاتنی نەمانی ناوەندێتی زیاد لەپێویست پەلەم کرد. بەڵام پێویستە بڵێم کەمن بۆ بەرێوەبردنی ئەم رێکخراوەگەورەیە پشتم بەحیزبی رستاخیز بەست بوو. بەڵام هۆکاری دۆرانەکەی باس دەکەم.

بەشداری خەڵك و نەمانی ناوەندێتی و دیموکراسی لەهەمووئاستەکانی ژیانی میللەتی ئێمەدا بۆئەوەی کە بە هەڵبژاردنی شارەوانییەکان و ئەنجومەنەکان بگات تەنیا لە چوارچێوەی پاشایەتی مەشرووتەدا ئەگەری سەرکەوتنی هەبوو. ئێران هەمیشەو هەنووکەش، ئیمپراتۆریەتێکە، واتا پێکهاتەیەکە کە پێکهاتووە لە قەومی جیاواز بەزمانی جیاوازو داب ونەریتی جیاوازو تەنانەت ئایینی جیاوازیش، هەرچەند کە زۆربەیان موسڵمانن.

هەربۆیە پێویستە کە پاشایەك لەسەرەوە ئەم پێکهاتەو کۆمەڵەیە یەکگرتووبکات بۆئەوەی بتوانێت دیموکراسی پاشایەتی راستەقینە جێگیربکات.

تێکەڵ کردنی ئەم وشەیە نابێت ببێتە هۆی سەرسووڕمان. لە راستیدا پێویستە بە بیربێتەوە کە هەرچەندە بە پێی دەستووری ساڵی ١٩٠٦و ١٩٥٠، پاشا دەتوانێت داوای قەبووڵکردنی پلانەکانی لە دەوڵەت بکات، بەڵام دیسانیش پاشایەتی مەشرووتەیەو پاشایەتی دەکات، نە حکوومەت.

دیموکراسی پاشایەتی، هەم کۆکردنەوەی هەموو پێکهاتە قەومییەکانە لە ژێرئاڵایەکداو لەچوارچێوەی سنوورێکی پیرۆزداو، هەم یەك خستنی هەموو چین وتوێژێن کۆمەلایەتیە لەناو کۆمەڵگەیەکدا کە بۆ بەرز بوونەوە و پێشکەوتنی خۆی خەباتی کردووە.

- کەواتە بەڵاجەوی نییە کە ئەگەر بەوپەڕی تواناوە هەوڵ بۆلەناوبردنی بدەن؟

# فەسڵی ٢٣

## سەرکەوتن و شکستەکانمان

بەڕای من دەکرێ دەسکەوتە گرنگەکانی شۆڕشی سپی کەدواتربوو بەشۆڕشی شاو خەڵك بەمجۆرە کورت بکرێتەوە: بەدڵنیاییەوە ئێران خۆی لە خووخدەو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەدەکانی ناوەراستی پەنجاساڵی رابردوو رزگارکرد. ئاشکرایە کە ئەووێرانیانەی کە بەهۆی شۆڕش و شەڕی ناوخۆیی و حکوومەتی پرلەبشیوی و ئاڵۆزی ئێستاوە پێکهاتووە رەنگە ئێران بەرەودواوە بگێرێتەوە، بەڵام بەگومانم لەوەی کە ئەورێگای کە بۆ میللەتەکەم دەسنیشانم کرد لەبنەرەتدا تووشی گۆڕان ببێت.

### راستییەکان بەپێی ئامار:

هەنووکە دەبێت پشت بەئاماربەستم. ئێمە تەرازنامەی لە ڕادەبەدەر ئەرێنی تایبەت بە بیست وپێنج ساڵی رابردووی ئێرانمان رێك نەخستووە. رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم ئیشەگرنگەی ئەنجام داوە. ئێمە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی سیاسەت و پەروەردەو فێرکردن و خۆش بژیوی کۆمەڵایەتی و گەشەپێداندا لە هەموولاتانی لەحاڵی گەشەسەندندا لە پێشتربووین. دوایین

بەرنامەی پێنج ساڵەی ئێمە مژدەی گەشەیەکی ساڵانەی لە ٢٦٪ دەدا. ئەم گەشەکردنە لەساڵی ١٩٧٥دا بەپێی ئەو نرخانەی واهەبوون لە ٤٢٪ بەرزتربووەوە، کە چوارئەوەندەی گەشەی ساڵانەی ژاپۆن بوو.

ئەو ئامارانەی کە لە لایەن رێکخراوەکانی پەیوەندیدار بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڵاوبوونەتەوە نیشانی دەدات کەلەسەرەتای شۆڕشی سپی بەدوا، گەشەی ئابووری ساڵانەی ئێران لە ١٣٪ بووە. ئەگەر ئامارەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان قبووڵ بکەین، لەماوەی بیستوپێنج ساڵدا تێکڕای داهاتی ساڵانەی تاك لە ١٦٠ دۆلارەوە بۆ ٢٢٠٠دۆلار لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا بەرزبووەوە کەهەر ئەم ژمارەیە بە لێکدانەوەکانی ئێمە ٢٥٤٠دۆلار بووە. لەبیستوپێنج ساڵی رابردوودا وڵاتی ئێمە بارودۆخێکی وەك کارگەیەکی بەرهەمهێنانی بەخۆگرتبوو کە پێکهاتە پێویستەکانی مودێرنیزاسیونی بەرهەم دەهێنا: زانکۆکان، قوتابخانەکان، دامەزراوەپیشەییەکان، نەخۆشخانەکان، رێگاوبانەکان، رێگاکانی ئاسن، بەنداوەکان، ویزگەکان، شالوولەکانی گازی سروشتی، کارگەکان، شوێنەکانی پیشەسازیو فەرهەنگیو وەرزشی، هەرەوەزییەکان، شارەکانو گوندەنوێ کان. ئێستا دەزانین کە وڵاتەکەمان بۆ چ ئاستێك لە رۆژ رەشی دا بەزیوە.

لە ساڵی ١٩١١دا یاسایەك پەسەندکرا کە خوێندنی سەرەتایی لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە ناچاری دەکرد، بەڵام قوتابخانەو مامۆستایەك لە گۆڕی دا نەبوو و دەساڵ دواتر بەگشتی ٤٠٠٠٠ کەس لە قوتابخانەکانی سەرەتاییو ناوەندیو خوێندنگەکانی باڵادا دەیان خوێند. هیچ قوتابی یەك نەیدەتوانی بڕوانامەی باڵا بەدەست بێنێت چونکە لە وڵاتدا زانکۆیەك نەبوو.

لەسەرەتای پاشایەتی من دا ٤٠٠٠٠٠ خوێندکارو قوتابی سەرقاڵی خوێندن بوون. لە ساڵی ١٩٧٨دا زیاتر لە دەملیۆن کەس خەریکی خوێندن بوون کە ١٨٥٠٠٠کەس لەوانە خوێندکارانێك بوون کەلە ١٨ زانکۆو ١٣٧ قوتابخانەی باڵادا دەیانخوێند. لە سەرەتای حوکمڕانی بنەماڵەی ئێمەدا ٩٩٪ی خەڵك

نەخوێندەواربوون،لەسەرەتای دەسەلأتداری مندا ئەم ژمارە بۆ لە ٨٠٪ دابەزی و لە ١٩٧٨دا تەنیا لە ٢٥٪ی خەڵك نەخوێندەواربوون.
حاشا لەم راستیانە ناكرێت. ئەوەی كە بۆ باسكردن دەشێت ئەو شێوازەیە كەبە كەڵك وەرگرتن لێی توانیمان بەم ئەنجامە بگەین.
لە كاتی سەرهەڵدانی ئیسلامدا كە مایەی بەختەوەری مرۆڤە، ئێران لانكی زانست بوو تا ئەو جێی كە پێغەمبەر فەرمووی: " ئەگەر زانست لە ئەستێرەی پەروین دا بێت ئێرانییەكان بەدەستی دێنن."

چارەیەكی تر نەبوو

لە ماوەی ئەم هەمووە ساڵەدا، رژێمیان بەستەمكار ناوبردو بە دیكتاتۆریەت تاوانباریان كرد، هەرچەند هەندێ جار بە سیفەتی رووناك بیریش وەسفیان كرد. لە ستەمكاریو بوونی زیندانیانی سیاسی یادیان دەكردو بەناڕەوا پێشێل كردنی مافی مرۆڤیان دەدایەپاڵی. هەموو ئەم بوختانانە جێگای باسكردنە، بەلأم پێش لەوەی كە تەنانەت لە بارەیانەوە بیریش بكەینەوە دەبێت وەلأمی ئەم پرسیارە سەرەكییە بدەینەوە كە " ئایا وڵاتی ئێمە چارەیەكی دیكەی هەبوو؟"
پێویستە لەبیرمان بێت كەئێران، بەو پێگەجۆگرافیاییەگرنگەیەوە كەهەیەتی، لەریزی " وڵاتانی لە حاڵی گەشەكردندا" بوو. بە بیستوحەوت ملیۆن كەسەوە لەساڵی ١٩٦٨ دا كەلە ١٩٧٨دا دەگەشتە سیوشەش ملیۆن كەسو پێدەچوو ژمارەی دانیشتوانی لە ١٩٩٠دا بگاتە سەروی پەنجاملیۆن كەسەوە. واتا هەمووساڵێك، دەبێت ملیۆ نێك زگی نوێ تێربكرێت و ملیۆنێك پیشەی نوێ دابین بكرێت.
ئەگەر قەبووڵی بكەین كە رێگای گەیشتن بە دیمۆكراسی ڕاستەقینە لە ڕێڕەوی بینای ئابووری دروستو بە هێزەوە تێدەپەڕێت، وڵاتانی هەژاری "لە حاڵی گەشەسەندندا" بۆ گەیشتن بەم دیمۆكراسیە دەبێت چ بكەن؟ ئایا نابێت هەموو ئەو سەرچاوەسروشتیو مرۆییەی كەلەبەردەستیان دایە وەگەڕی بخەن بۆئەوەی

دەوڵەمەند ببنەوەو ژێرخانی ئابووری خۆیان بنیات بنێن، کە بەبێ ئەوە "دیمۆکراسی" دەبێتە وشەیەکی بێ نێوەڕۆك؟
بەبۆچوونی من لەم سەردەمو رۆژگارەدا، هیچ وڵاتێك ناتوانێت بڵێت لە رووی سیاسیەوە سەربەخۆیە مەگەر ئەوەی کە خاوەنی پێکهاتەیەکی ئابووری قایمو بەهێزبێت. ئەمە مەرجێکە حاشای لێناکرێتو بەبێ ئەم مەرجەش هیچ نیازپاکیو ماندووبوونێكو هیچ مافێکی مەعنەویو بڕیاردانێك ناتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی کە گەلێك لەحاڵەتی خزمێکی دواکەوتووی ئەو وڵاتانەی کە لەرووی ئابوورییەوە بەهێزنو سەرئەنجام لە رووی جڤاکییەوە پێشکەوتوون خۆی قوتاربکات. ئەمرۆ ئازادیو دەسەلاتداری گەلان بە هۆی هێزی ئابوورییەوە مسۆگەردەبێتو هەر ئەم هێزە ئابوورییەیە کە هەلومەرجی بە دەستهێنانی دیمۆکراسی راستەقینە فەراهەم دەکات.

## وڵاتانی بەرجەستە:

ڕوانینێك بۆ نەخشەی جیهان نیشانی دەدات کە لە ١٥٠ وڵات تەنیا ٢٥ وڵاتیان بە پێی ستانداردەکانی رۆژئاوا، دەکرێ لەریزی وڵاتانی دیمۆکراتیکدا دابنرێت. ئەم وڵاتانە چ پیشەسازی بن یان کشتوکاڵی، هەموویان ئابوورییێکی پڕەونەقیان هەیەو ژیانیان لە ئاستێکی باڵادایە.
جیا لەم چەند وڵاتە بەرجەستەیە، گەرچی بۆ نموونە بە رواڵەت لە نیمچەوشکاڕۆی هیندا سیستەمگەلی دیموکراتیك حکوومەت دەکەن، بەڵام ئەم سیستمانە لە جیاتی ئەوەی کە رێگری بکەن لە هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری، ململانێ ناوخۆییو خۆراگری خەڵك لەهەمبەر مودێرنیزاسیون دا یان نا لەدژی ئەمانە خەبات بکەن، کەچی شان بۆ ئەم بەڵایانە شل دەکەن، ئەویش راست لە بەر ئەم هۆکارەی کە ئابوورییێکی بە هێزیان نییە.

لێرەدا بە بۆچوونی من، یەکێك لە گرنگترین پرسەکانی سەردەمی ئێستا جێگای باسەو ئەویش پرسێکە کە جگە لە وڵاتانی بەرجەستە لە سەر هەموو وڵاتانی دیکە کاریگەری هەیە: ئایا پێویستە بە ئاستێکی بەرزتر لە ژیان بگەین یان دەبێت چاوپۆشی لێبکەین؟ ئایا دەبێت بە تاقەتەوە لە ئەندامێتی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بمێنینەوە یان لە دەروازەیەکەوە کە شارستانیەتی نوێ لە پشتیەوەیەتی تێپەرین؟

وڵاتانی لە حاڵی گەشەکردندا ئەگەر تێپەرین لەم دەروازەیە قەبووڵ بکەن ئەوا خۆیان لە هەمبەر گیروگرفتێن گەورەو، ئەگەر نەڵێم بێ چارەسەردا دەبیننەوە. ئەم وڵاتانە بەزۆری سەرچاوەکانیان مامناوەند یان بەرتەسکەو بەگشتی هەمیشە ئەزموون‌و خەڵکی راهێنراویشیان نییەو ناچارن بەردەوام لە گەل رکبەرکێ‌و بیانووگرتنەکانی وڵاتانی پیشەسازیدا دەستەیەخە بن. کات بەزیانی ئەوان تێدەپەرێت چونکە قازانجەکانی "وڵاتانی بەرجەستە" بەردەوام روو لە هەڵکشانە. دۆڵێك کە ئەم دوودونیایەی جیاکردوەتەوە نە تەنیا تەنگ‌و بەرتەسك نابێتەوە بەڵکو بەردەوام لە بەرین بوونەوە دایە.

وڵاتانی بەرجەستە لە ماوەی سەردەمی پەرەسەندنی خۆیاندا لەگەڵ وەها گیروگرفتێك بەرەورووو نەبوونەتەوە. هەروەها لەبەر ئەوەی کەلە رێگای پێشکەوتنی خۆیاندا لە گەل هەڤرکانی بە هێزدا بەرەورووو نەبوونەتەوە، توانیویانە لەو پەری ئارامیدا رێگای گەیشتن بە دیمۆکراسی خۆشبکەن، ئەویش بە بنیاتنانی ژێرخانی ئابوورییێکی قایم لەسەربنەمای توانایی زانستی‌و تەکنیکی سیاسەتی فراوان خوازی " وڵاتانی بەرجەستە" بە زۆری لەسەربنەمای بەکارهێنانی هێزی سەربازی‌و چەوساندنەوەی ئەوانی ترەو لەجیاتی ئەوەی کەبە شێوەیەکی راستگۆیانە و دروست کەڵك لە سروەت‌و سامانی ئەوانی تر بگرن بە تاڵانی دەبەن.

## کاریکاتێرێك له دیموکراسی:

کاتێك بڕیارمدا بەرنامەیەکی بە پەلە جێبەجێ بکەم کە ئامانجەکەی قەرەبوو کردنەوەی دواکەوتوویی چەندسالەو بەرەوپێش بردنی ئێران لە ماوەی بیستوپێنج ساڵدابوو، بۆم دەرکەوت کە سەرکەوتنی ئەم بڕیارە بەندە بە کەڵك وەرگرتن لە هەمووسەرچاوە گشتییەکان. پێویست بوو، دووپاتی دەکەمەوە، پێویست بوو کەبەناچاری بارودۆخێك قەبووڵ بکەم بۆئەوەی لە دروستکردنی کۆسپ و تەگەرە لەم ڕێگەدا بەهۆی لایەنی نەیارەوە بەرگری بکرێت. ئەم لایەنانە بریتی بوون لە کۆنەپەرستان و مالیکانی گەورەو کۆمۆنیستەکان و خۆپارێزان و پیلانگێڕانی نێونەتەوەیی. بۆ ئەوەی وڵاتێك ئامادە ببێت، پێویستە پەروەردە بکرێت، بجووڵێت، بەرەوپێش ببرێت و لە کاتێکدا کە سەرقاڵی ئیش کردنە لە بەرامبەر ئەو کەسانەوە کە دژی پێشکەوتنین پارێزگاری لێوە بکرێت.

ئەگەر دەرفەتی ئازادی کردەوە دەدرا بە خراپەکاران، بە دڵنیاییەوە ئەم بەرنامە هەرگیز جێبەجێ نەدەکرا. جێبەجێ نەکردنی ئەم بەرنامە بە مانای وەستانی ئێران لە بارودۆخێکدا بوو کە دیموکراسی لەودا وەك تراویلکەیەکی مەترسیداری لێدەهات، لەبەر ئەوە دیموکراسی لە برسییەتی و نەزانی و دابەزینی ماددی و مەعنەویی دا تەنیا کاریکاتێرێکە لە دیموکراسی راستەقینەو ترسناکترین دوژمنیەتی.

لە وەها هەلومەرجێکدا ناچاربووین هەڵبژێرین. بەڵام دەبوو چ شتێك هەڵبژێرین؟ نە بەو جۆرەی کە بەناڕەوا دەڵێن هەڵبژاردن لە نێوان دەستی پۆڵاینی ستەمکاری و بنەما بەرزەکانی مرۆڤایەتی دا، بەڵکو لە نێوان دابین کردنی بەرژەوەندی راستەقینەی وڵات و کردەوەی بێ ئەنجام و ناڕەزایەتی خەڵك خڵەتێنانەدا.

ئەوەی کەلە ساڵی ١٩٧٨دا رووی داو ئەوەی کە هێشتا لە وڵاتی چارەڕەشی ئێمەدا روودەدا، جێگایەك بۆ باسی دوورو درێژی من لەم بارەوە ناهێڵێتەوە. لە ئێران دا ئیتر بچووکترین ئاسەوارێك لە دیموکراسی نەماوەتەوە، مەگەر بەرەو

رووبوونەوەی رۆژانەی تاقمە هەڤرکەکان کەلەهیچ بیروباوڕێك جگە لە فەرمانە شۆڕشگێڕانەکان نەبێت پەیڕەوی ناکەن و هیچ ئاواتێکیان لانییە جگە لەپاراستنی دەسەلات لە ڕێگای ترس و تۆقاندنەوە نەبێت. ئالۆزی و بشێوی گەیشتووەتە ئاستێك کە بەلێنی " هەلبژاردنی ئازاد" کە بڕیاربوو لە مارسی ١٩٧٩دا بەڕێوەبچێت ناشێت جێبەجێ بکرێت و رەشاش و نارنجەك جێگای سندۆقەکانی دەنگدانی گرتووەتەوە.

## هاوکاری لە گەل رۆژئاوا:

دونیای رۆژئاوا تەنیا بەدیتنی بەدواگەڕانەوەو رووله ئاوابوونی ئێستای ئێرانە کە دەتوانێت تێبگات ئێمە لە سەردەمی دەسەلاتداریماندا تا چ ئاستێك لەوان نزیك ببووینەوە. لە راستیدا ئێمە ئەندامی بنەماڵەیەك بووین. بە پەیوەندییە قەومی و فەرهەنگی و ئایدولۆژیکەکانمان لە گەل دونیای رۆژئاوا سەربەخۆیی ئابووریش زیادببوو و لەبەرژەوەندی ئێمەدا بوو کە هەولْ بۆ بەهێزکردنی بدەین. بەلام ئاشکرابوو کە ئەگەر لە رووی بیٚ بەختییەوە ئەورووپا تووشی گیروگرفتی سەخت دەبوو، ئێمەش لە ئێران لە دەرئەنجامەکانی زیانمان پێدەگەشت.

وەك بەشێك لە سیستەمی دیموکراتیکی رۆژئاوا، هاوپەیوەندیمان لەگەلْ هاوبەشانی ئەورووپایماندا زۆر راستیانە بوو و هەروا کە پێشتر دیتمان، نموونەی زۆر لەم لێك تێگەیشتنە هەبوو. قەبارەی ئالْوویْرەکانمان – فرۆشتنی نەوت، هاوەردەکردنی ماددەی خاو، راسپاردنی ئیشەگەورەکانی بیناسازی– بەردەوام لە زیادبووندا بوو. پاش تەواوکردنی دووەمین شالوولەی گازی سروشتی کە دەبوو سالانە سیازدە ملیار مەتری سێجا گاز هەناردەی سنووری سۆڤیەت بکات، ئەم هاوپەیوەندییە دوولایەنەیە تەنانەت توکمەتریش دەبوو. بەمجۆرە قەوقازی باشوور، کە گازی سۆڤیەتی پێنەدەگەشت، لەم گازە سوودمەند دەبوو و رووسیاش دەیتوانی دەملیارمەتری سێجا لە گازی خۆی لەبری ئێمە لە سنووری

چێكوسلۆڤاكیاوە بدات. پێویستە ئەوەش زیادبکەم کە سەرچاوەکانی گازی سروشتی ئێمە بەشی سێ سەد ساڵ دەکات.
بە بەشداری کردن لە دامەزراوەکانی وەك کرووپو بابکۆك دا بە تەواوی سووربووم لە سەرئەوەی کە لەگەڵ باقی دامەزراوە برواپێکراوەکانی نێونەتەوەییدا رێبکەوم. بۆ نموونە، دەمانویست بە کەڵك وەرگرتن لە شاسی کرووپو بزوێنەری کارەبایی سویدی A.C.A شەمەندەفەری کارەبایی لە ئێراندا دروست بکەین. دەمویست ئێران ببێت بە بەشێك لە " بەڕێوەبەرایەتی" نێونەتەوەیی و لە تەکنۆلۆجیای سەرووی نوێ (ئولترامۆدێرن) دا دەستی هەبێت. بە دڵنیاییەوە مەبەستمان ئەوە نەبوو پارەکەمان فڕێ بدەین، بەڵکو بەپێچەوانە هەموو شتێك ئێمەی دەهێنایە سەر ئەوباوڕەی کە واهەست بکەین لە بواری کیمیای نەوت دا بەباشترین ئەنجامەکان دەگەین.
هاوکاری ئێمە سەقامگیری ئابووری ئەورووپای وەها بەهێزکرد کە ئەورووپییەکان دەیان توانی بۆهەمووولاتانی هەناردەکاری نەوت لە رۆژهەلاتی ناوەراست دا – لەوانەش ئێران – کالای دروستکراو و زۆرجاریش تەکنۆلۆجیای خۆیان کە ئەم ولاتانە پێویستیان پێی بوو، هەناردەبکەن. سیاسەتی ئێمە بۆ پێکهێنانی یەکێتی و لێك تێگەیشتن لە گەل ولاتانی کەنداوی فارس و زەریای هینددا، لەسەربنەمای بەرژەوەندی هاوبەش و رێزی دوولایەنە بۆ مافەکانی میللەت خۆی گرتبوو. ئەم شتە بەهیچ جۆر نەدەبووە رێگر لەسەر رێگای لێك تێگەیشتنمان لەگەڵ دونیای رۆژئاوادا.
ولاتانی بەهێزو خاوەن چەكو زۆر پێشکەوتووی پیشەسازی لەبەرنەبوونی دلاوایییان، ناچاربوون بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی خۆیان پێداچوونەوە لە سیاسەتیاندا بەرامبەر بە ولاتانی هەژارو ئەگەر نەڵێم نەدار، بکەنەوە. هەربۆیە بەپێویست دەزانرا رۆژئاواو بلۆکی سۆڤیەتو ولاتانی خاوەن نەوتی رۆژهەلاتی ناوەراست بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی گونجاو بۆکێشەی ولاتانی گەشەنەکردوو پێکەوە یەکبگرن، کە ئەم کێشەیە هێشتا وەك خۆی ماوەتەوە.

زۆرجار گوتوومەو نووسیومە، کە تەنیا بزاڤێك بۆ هاوپەیوەندی راستەقینەی جیهانی دەتوانێت لە رووداني بەلاو وەیشوومەیەك بە بەرینایی جیهان رێگری بکات. ئایا هەمووخەڵکانی دونیا پەیوەندییان بەیەکترەوە نییە؟ دەتوانم بڵێم کە ئێمە تەنیا دڵمان بەمە خۆش نەکردبوو کە لەبەر جیۆرێمان بانگەشە بۆ ستراتیجی لێك تێگەیشتنی جیهانی بکەین، بەڵکو ئێمە لە ئێران دا ئەم سیاسەتەمان جێبەجێ کردبوو.

## دامەزراندنی حیزبی رستاخیز: هەڵەیەك

لە سەردەمی پاشایەتی مندا هیچ شتێك وەك پێویست تەواونەبووو بەئەنجامی خۆی نەگەیشت، هەربۆیە ئەگەر ئامارە بە لایەنە نەرێنییەکانی نەکەم ئەم باسە ناتەواو دەمێنێتەوە.

کاتێکە لە ٤ ی مارسی ١٩٧٤دا پێشنیازی دامەزراندنی حیزبی رستاخیزم کرد، دوو ئامانجم لەبەرچاوبوو. لە ماوەیەکی کورتدا ئەم حیزبە بەتاكو تەنیایە بە پێکهاتن لە خەڵکانێك بە هەر جۆرە بیرو باوڕێکەوەو لەهەر چینو توێژێکی کۆمەڵایەتی بە ناوەڕۆکی لیبراڵیزمێکی بنیات نەرانەوە، دەیتوانی دەس بەکاتو هێزی مرۆییەوە بگرێت. لەبەر ئەوەی کە هیچ بەرەیەکی نەیار لە گۆڕێ دا نەبوو هیچکام لە کەسایەتیە گرنگەکان لەبەر کشانەوەی حیزبەکەیان بە هۆی شکستیان لە هەڵبژاردنەکاندا لە بەشداری کردن لە دەوڵەت دا بێ بەش نەدەبوونو دەمتوانی پشت بەخزمەتی هەموو مرۆڤە بەتواناکان ببەستم.

لە داهاتوودا، ئەم حیزبە دەیتوانی ببێت بە قوتابخانەیەکی سیاسیو ئایدۆلوژیاو یارمەتی پێکهاتنی رۆحی یەکگرتووی بدات. لە راستیدا دامەزراندنی حیزبی تاكو تەنیا لەگەڵ سیاسەتی نەمانی ناوەندێتی دا، کەلە جێبەجێ کردن دا بوو، پەیوەندی هەبووو دەبوو وەك ناوبژیوانێك، بە کەڵك وەرگرتن لە هەستی

نیشتمانپەروەری، ئەوەی کە لەرووی کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەوە لێک جیابوو یەکگرتوو بکات.

هیواداربووم کە ماندوونەناسی ژنان و پیاوانێک کەبە تایبەت سەرقاڵی کاروباری سیاسی و گیروگرفتەکانی وڵات – لە راستیدا چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە – بوون، بتوانێت بناغەی بەشداری کردنێکی بەرین دابنێت و گیانی کۆمەڵایەتی پێویست بۆ ئەم چاکسازییە لە کارگێڕی دا پێکبێنێت. بەدەربڕینێکیتر، هیواداربووم حیزبی رستاخیز بۆ گەیشتن بە زۆربەی ئەو ئامانجانەی کە لایەنە پەیوەندی دارەکانی دەوڵەتی بۆ ئاراستەکرابوو هاوکاریمان بکات.

بەداخەوە، هەڵەبوونی بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم حیزبە بە کردەوە سەلمێنرا. لە بەر ئەوە سەرۆک ساداتیش سیستەمی تاک حیزبی میسری پێچایەوەو رێگای بۆ دروستبوونی حیزبی تر خۆش کرد کەبەڕای من ئیشەکەی ئەو دروست بوو. بە دڵنیاییەوە کاتێک ئەو بارودۆخانەی کە دەبنە هۆی پەیدابوونی رووداوگەلێک لەبیر بچنەوە، ئەوا داوەری کردن ئاسان دەبێت. بەهەرحاڵ، حیزبی رستاخیز نەیتوانی بگات بەو ئامانجانەی کە بۆی دامەزرابوو.

نەیتوانی دەوری ناوبژیوانێک بگێڕێت لەنێوان دەوڵەت و میللەت دا بۆگەیشتن بە مەبەستەکان و دابین کردنی پێداویستیەکان. بەڵام ژنان و پیاوان و زیاتر لەوانیش لاوانێک کە بەشی زۆری کاتی خۆیان بەخشی بەم حیزبەو ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دا، شیاوی ستایش کردنن.

هەروا کە گوتوومە، یەکێکی تر لە لاوازییەکانی ئێمە بەگشتی لە کەمبوونی بەڕێوەبەرانی بواری جێبەجێ کردنەوە سەرچاوەی دەگرت. سەرەڕای هەوڵەکانمان نەمانتوانی بەڕێوەبەرانی پێویست پەروەردە بکەین تا بەسەرنجدان بە گەشەکردنی پێکهاتەی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی و ئەو داواکارییانەی کەلە بەرنامەی نەمانی ناوەندێتی یەوە سەرچاوەی دەگرت، وڵامدەری پێویستیەکانی وڵات بن. هەرچەندە ئەم کەم و کورتیانە کاتی بوون، بەڵام ئەم لاوازییە وەك کەم و کورتیەکانی شوێنی

نیشتەجێ بوون لە شارەکاندا، لەشێواندنی کەش و هەوای سیاسی و جڤاکی دا دەوری هەبوو. ئەم کەم وکورتیانە سەرانسەری ولاّتی خستە تەنگانەیەکەوە کە بەگومانم تا ١٩٨٢ چارەسەر دەبوو.

## کێبڕکێ لەگەڵ زەماندا:

بەپێی دوایین خەملاّندنەکان، سێ تاچوارساڵ پێویست بوو بۆ ئەوەی گرنگترین کەم وکورتیەکان لەناوببەین. تاساڵی ١٩٨٢ چوار دەورەی تەکنیککار لە هەموو بوارەکاندا لە ١٣٧ دامەزراوەی خوێندنی بالاّدا خوێندنیان تەواودەکرد، بەرهەمهێنانی پۆلاّ گەیشتبووە ١٠ ملیۆن تەن لە ساڵێکدا کەهیواداربووم لە داهاتوودا بگاتە ٢٥ ملیۆن تەن واتا نزیك بە بەرهەمهێنانی هاوکاتی لە فەرەنسادا. بینای بەندەری گەورەی چابەهار لە کەنداوی عەممان دا، کە شەست کیلومەتر لە سنووری پاکستانەوە دوورەو، بەندەرعەباس لە کەنداوی فارس دا، نزیك بەتەواوبوون بوو و لەم بەندەرەدا کەشتی گەلی ٥٠٠٠٠٠ تەنی دەیان توانی لە وشکەحەوزێکی بچووکدا چاك بکرێنەوە. بەندەرێن گەورەی دیکەش لەقۆناغی جێبەجێ کردندابوون کە دەبوو لە ساڵی ١٩٨٢ دا دەست بەکاربن. پێشتر سەبارەت بە بەرنامەیەك کە بۆدروستکردنی رێگاوبان و رێگای ئاسن هەمان بوو قسەم کردووە.

سەرەرای ئەو هۆگرییەی کە بۆ دەسپێوەگرتنی نەوت هەمانبوو، بەلاّم ئەگەر بنیات نانی ژێرخانی ولاّت لە بەرەبەرەی سەدەی بیست و یەکدا پێویستی بکردایێت ئامادەبووین رۆژانە ٥ تا٦ ملیۆن بەرمیل لە بیرەنەوتەکانمان هەڵگۆزین. بێگومان ئێستا مانای تێکۆشانی من بۆ تێپەڕین لە زەمان بەباشی فام دەکرێت. هەروا کە هۆکارەکانی روودانی شۆڕش لە ١٩٧٨دا ئێستا بەروونی دەرکەوتووە. تائێستاش باوڕم وایە کە ئەگەر دەیان هێشت ئەم ساڵە دژوارانە تێپەرێنین، خەڵکی ئێران دەگەیشتنە خۆش بژێوییێکی سەرسووڕهێنەر.

سەرئەنجام، ئەم گوناحە لە ئەستۆدەگرم کەلە بەرگری کردن لە رژیمەکەمان لە بەرامبەر ئەو بوختانانەی کە بۆیان دەکردو دەبووە هۆی لاوازبونی، تەنەخیم کرد. ئێستا تێدەگەم کەئەو سیستەمەی کەلەدژی ئێمە بەکارهێنرا تا چ ئاستێك کاریگەرو توکمە بوو. لەبەر ئەوەی کە زۆرێك لەم بوختانانە درۆو بێ نێوەرۆك بوون، من کە متمانەم بەخۆم هەبوو، هەڵەم کردو کاریگەری ئەم بوختانانەم بەهیچ زانی. لەبیرم چووبوو کە ئامانجی ئەم راگەیاندنانە نە سیاسەتوانان، بەڵکو لاوان‌و ژنان‌و کەسانێکی نەزانن کەسەرتاپێ تووشی گومان هاتوون. مێشکی بەشێکی بەرین لە لاوانی وڵات لە ئاکامی راگەیاندنی روخێنەرو شێتانەی بەردەوام دا ژەهراوی ببوو و لە مەبەستەکانی من تێنەدەگەشتن. رەنگە کە ئەمڕۆ، لە مانای هۆشدارییەکانی من چاکتر تێگەیشتبێتن.

لە ٥ی ئاگۆستی ١٩٧٨دا لە وتووێژێکی رادیۆ- تەلەفزیۆنیدا رامگەیاند کە لەکۆتایی خولی پەرلماندا" واتا لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩دا هەڵبژاردنی ئازاد بەرێوە دەچێت.

هەنووکە دەمەوێت دووخاڵ روونبکەمەوە. یەکەم ئەوەی کە، لەکاتی دەربڕینی ئەم قسانەدا دەوڵەتێکی بەرپرس لە تاراندا هەبوو. کێ دەزانێت کە لە ئێرانی ئەمڕۆدا چەندکەس مرۆڤی نابەرپرس هەیە؟ تەنانەت دیارنییە کە چ رۆژێك هەڵبژاردن بەرێوەدەچێت. خاڵی دووەم ئەوەی کە، هەرچەندە کە یاسای بنەڕەتی ئێمەیان هەڵوەشاندوەتەوە، بەڵام دەستوورێکی دیکەیان لەجێی دانەناوە. ئەوەی کە بەهۆی ئەنجومەنێکی بچووکی حەفتاوسێ کەسییەوە (کە شەست کەسیان مەلان) خەریکە ئامادە دەبێت بە "سەرۆك کۆمار" دەسەڵاتێکی وا دەدات کەمن لە دەستووری رابردوودا ئەو دەسەڵاتەم نەبوو.

بەهەرحاڵ، هەرکەئازادی هەڵبژاردنم راگەیاند، هاتنەمەیدانی هێزەکانی دژی ئێران دەستی پێکردو بەکردەوە رێگای لەوەگرت کە میللەت بە ئازادی دەست بەهەڵبژاردن بکات. دڵنیام کەئەگەر ئەم هەڵبژاردنە ئازادە بەرێوەدەچوو، هەموو وڵات بە دڵنیاییەوە بە قازانجی دیموکراسییەکی بنیات نەر کە ئێمە بناغەکەیمان

دانـابوو دەنگـی دەدا. لەبـەر ئـەوەی کـە ئێمـە نزیـك بـووین لـە کۆتـایی ڕێگاکـەو دیمۆکراسییێکی ڕاستەقینە لە تـەواوبوون‌و پێگەیشتن دا بوو، هێزەتێکدەرەکان بە دژی من یەکیان گرت. بۆ ئەم کارە نوێنەرانی بازرگانانێکی دیاری کراو لە بازاڕداو ئـەو دەرەبەگانـەی کـە خۆیـان وەك زانـای ئـاییني دەناسـاند لەگـەڵ بـاڵی چـەپی توندڕەودا یەکیان گرت.

دەڵـێن مـن دەمویـست خـەڵك لـە ژێـر هەل‌ومـەرجی خۆمـدا بەختـەوەربکـەم. نـا. مـن دەمویست سەرەڕای پیلان گێرییە تاوانبارانەکان، میللەتی ئێران بەختـەوەر بکـەم. پـسپۆڕانی خراپـەکاری‌و تیرۆریـزم‌و سـەرهەڵدانی چـەکدارانەو کەللەوشـکانی مەزهەبی کە ڕێنماییەکانیان نامۆیە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام‌و داب‌ونەریتی ئێرانی دا، لـەدژی ئێمـە یـەکیان گـرت. بـەمجۆرە بـوو کـە دزێـوترین‌و نـەفرەتاوی تـرین‌و زیانبارترین یەکگرتنەکان واتا یەکگرتنی سوورو ڕەش، کەخۆیان شکست خواردو دۆڕاو دەبینی بەمەبەستی " ڕووخاندنی بەربڵاو" یەکیان گرت.

# فەسڵی ٢٤

## یەکگرتنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن

لەماوەی سێ ساڵی کۆتایی پاشایەتیمدا راگەیێنەگشتیەکان لە دروستبوونی ڕووداوە کانی وڵاتدا دەورێکی گرنگیان گێڕا. من ئەم بابەتە بەباشی تێدەگەم کەبە ڕاستی مانای نییە وەها بیربکەمەوە کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن هەمیشە لایەنی ئەخلاقیان گرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا کێبڕکێی رۆژنامەنووسان بۆ بەدواداچوونی هەواڵە پڕ لەهات و هاوارەکانیش بە زۆری تووشی زێدەڕەوی ناخۆش هاتووە.

دەتوانم تێبگەم هەواڵنێرێك کەبۆ ڕاگەیاندنی نائارامییێکی بچووك نێردراوە بۆ ئێران هەڵخرێت و زێدەڕەویی بکات. بەلام تێناگەم چۆن هەواڵنێران لەسەرەتای ڕاپەڕینەکەوە ژمارەی سێ کوژراو و دە برینداریان گۆڕی بۆ پەنجا شەست کوژراو و سەدان بریندار.

هەرچۆن بێت، وەها ڕووداوێك ڕووی داو بەخراپ تر بوونی بارودۆخی ئێران لەماوەی ئەو مانگانەدا، دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە پەرەگرتنی ناڕەزایەتیەکانی سەرشەقام دا دەورێکی جێی نیگەرانیان گێڕاو ئەو راپۆرتانەش کە بلاودەکرانەوە هەر رۆژ زێدەرەوی زیاتری تێدادەکرا.

شەڕی راگەیاندنەکان لە دژی ئێران تەنیا لەم سالانەی دواییدا دەستی پێنەکردبوو بەڵکو لە سالانی پێشترەوە بەردەوام بوو. ئەم شەڕە لە ساڵی ١٩٥٨وە کاتێکە

ئێـران بـۆ بـە دەسـتـەوەگرتنی سەرچـاوەنەوتییەکانی خـۆی تێدەکۆشـا، دەسـتی پێکردو لە ڕاستیدا هیچکات بچڕانی بەخۆوە نەبینیو بەتایبەت لەساڵی ١٩٧٣و ساڵانی دواتریشدا، لـە ئاکامی ئـەو هەڵویـستەی کـە لـە بەرامبـەر نرخـی نەوتـدا گرتبوومە پێش بارێکی قین لە دڵانەی پەیداکرد. لەبیرمـە کاتێك بۆچوونی وڵاتانی بەرهەم هێنـەری نـەوتم ڕاگەیاند بەرێزسایموون وەزیری دارایـی ئـەوکاتی ئـەمریکا چـەندە بـە زمـانی هەڕەشـەوە قـسەی کـرد. ڕۆژنامـەکانی جیهـانو بەتایبـەتی ڕۆژنامەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا نێوانیان لەگەڵ من خۆش نەبوو. ئەوان منیان بەبەرپرسی گران بوونی نەوت دەزانی، بەڵام هێچکەس تاقەتی ئـەوەی نەبوو باس لـەو هۆکارانـەی بکات کە بوونە بنـەمای وەها بڕیارێكو لـەم پەرتووکـەدا بەدرێژی باسم کردووە.

## " خەتای شا "

لـەو چرکەسـاتەوە، شـەڕی ڕۆژنامـەکان بـیٚ بڕانـەوە بـەردەوام بـووو چـاك دەتـوانم مەزندەی تووڕیی ئەو شۆفێرە ڕۆژئاواییەی بکەم کە نرخی سووتەمەنییەکەی بەرز ببـووەوەو بەئاسـانیش دەسـتی نەدەکـەوت. بـەویان دەگـوت: " خـەتای شـایە" و ئەویش باوڕی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی کە هـەر بەرزبوونەوەیـەك لـەنرخی نەوتدا لـە ڕووی داهاتی باجەکانەوە بۆ وڵاتەکەی نێعمـەتێکی خواییە. بەرزبوونـەوەی نرخـی نەوت، کۆمپانیانەوتییەکانو دابەشـکارانی نـەوتو ئـەو وڵاتانـەی کـە نـەوتیان تێدا دەفرۆشرێت دەوڵەمەندتر دەکاتەوە.

لەبەرچـاو نـەگرتنی ڕاسـتییەکان لەلایـەن هەنـدیٚ لـە ڕۆژنامەکانـەوە لـە بارودۆخـە جیاوازە کاندا بەلای منەوە شتێکی ڕوونو ئاشکرابوو.

گومانی تێدانییە کە وڵاتـی ئێمـە لاوانـی هـان دەدا بۆئـەوەی لـە دەرەوەی وڵاتو بە تایبـەت لـە ویلایەتەیەکگرتووەکانـدا درێـژە بـە خوێنـدن بـدەن. لـە دەرفەتـەکانی دواتـردا ئامـاژە بـە هەڵوێـستی خوێنـدکاران دەکـەم. لێـرەدا تـەنیا دەبێـت بڵـێم

کەهەرچەندە زۆرێك لەوان پێیان وابوو ئیشێکی ئەوتۆیان بۆناکەین، بەلاّم ژمارەیەکی زۆرتر لە خوێندکاران لە ماف خوێندن لە زانکۆ بەناوبانگەکاندا کەبێ دڵەڕاوکێیەکی ئابووری بە نسیویان ببوو ئاگاداربوون.

لە نۆڤامبری ١٩٧٧دا لەگەڵ شابانوو سەردانی ویلایەتەیەکگرتووەکانمان کرد. لە ویلیامزبێرگ دا، کە شەوێك لەوێ ماینەوە، چەندکەس لە خوێندکارانی ئێرانی بۆ دەربڕینی هەستی ئەمەگناسی کۆبوونەوە. بۆ وتووێژکردنێك لەگەڵیان چەند چرکەیەك وەستام بەلاّم هەرئەم چەند چرکەیە بەس بوو کەببینم چەندکەسێکی دەمامکدار لەدەوری ئالاّیەکی سووردا کۆبوونەتەوە کە هێمای داس و چەکوشی لەسەربوو و بەدەنگی بەرز سووکایەتیان دەکرد. بۆچی روخساریان بەدەمامك داپۆشی بوو؟ هەندێ لە رۆژنامەکان نووسیان لەبەر ساواك، لە کاتێکدا کە ئاگایان لە گاڵتەبوونی ئەم بۆچوونە نەبوو. پێم وایە، ئەگەری ئەوە زۆربوو کە زۆربەی ئەم خۆپیشاندەرانە ئێرانی نەبوون و بەڵکو خەڵکانێکی هاندەربوون کەلەو ماوە کورتەدا بەکرێ گیرابوون. بەهەرحاڵ، ئەوانەی کە بۆدەربڕینی هەستی ئەمەگناسی بەرامبەر بەمن خۆپیشاندانیان دەکرد نزیکەی ٥٠٠ کەس بوون و ئەوانەش کە هەڵوێستێکی دوژمنکارانەیان هەبوو لە ٥٠ کەس زیاتر نەبوون.

رۆژی دواتر کاتێکە دیتم ئەم ژمارانە راست بەپێچەوانە لە رۆژنامەکاندا بلاّوکراونەتەوە تووشی سەرسووڕمان هاتم.

نووسرابوو پەنجاکەسێك کە بۆ پشتیوانی کردن لە شا هاتبوون لەناو ئاپۆرای نەیاراندا ون بوون. کاتێکە من و شابانوو سەردانی واشینگتۆنیشمان کرد هەر ئەم شێوازە بلاّوکردنەوەیە دووبارەبووەوە. چەندین هەزارکەس لە ئێرانییەکانی نیشتەجێی ئەمریکا بۆ پێشوازی کردن لە ئێمە لە پایتەختی فیدراڵ کۆببوونەوە. تاقمێك خوێڕی و بەرەڵا، کە ئەمانیش دەمامکیان هەبوو، بە دار و کوتەك و زنجیری دووچەرخەوە، هێرشیان کردە سەر هاونیشتمانانیان. رۆژنامەکانی ئەمریکا ئەوانی لەبەرچاوی بیروڕای گشتی درێونەکرد تا تیتاڵییان پێبکەن. بەڵکو بەپێچەوانە، رۆژنامەیەك رووداوەکەی بەمجۆرە گواستەوە:" کێ خەرجی سەفەری

لایەنگرانی شای بۆ ئەمریکا داوە؟ " لەلایەکی دیکە هیچ کەس زەحمەتی ئەم پرسیارەی بەخۆی نەدا کە ئەی ئەو بەرەڵایانە لە کوێوەهاتن؟
راستیەکەی ئەوەیە کەشەڕێکی زۆرچالاکانە بەمەبەستی رووخاندنی ورەو هەستی خوێندکاران لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات دەستی پێکردبوو. بەخوێندکارانیان وتبوو کەئەگەر هێرش بکەنە سەرشاو داگیری بکەن قارەمانانە هەڵسوکەوتیان کردوە – وەك خوێندکارانی فەرەنسی لەساڵی ١٩٦٨دا – تائەوەی کەلەئێرانیشدا وەها ئیشێکیان کرد. بەمنیان گوتووە کە لیبیا بەبڕی ٢٥٠ملیۆن دۆلار لایەنی ئابووری ئەم رووخاندنەی دابین کردبوو.
هەڵوێستی بی بی سی ش مایەی سەرسووڕمان نەبوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨وە لە بەرنامە فارسییەکانیاندا هێرشێکی ژەهراوییان بۆ سەررژیمەکەم دەسپێکرد. وەك بڵێیت کارگێڕێکی نادیار فەرمانی ئەم هێرشەی دابوو. نامەوێت ئاماژە بە هەڵوێستی هەندێ لە نێردراوە تایبەتەکان بکەم کە بوونە هۆی ئەوەی هەندێ لە رووداوە دڵتەزێنەکان لە رادەبەدەر زێدەرۆیانە نیشان بدرێت.
رەنگەحەزدەکەم بڵێم کەبۆ هەندێ لەرۆژنامەکان مرۆڤی مردوو نێعمەتێکی خواییەو، دڵنیام کە زۆرێك لە هەواڵنێران بە بەرەکەتی رووداوەکانی ئێران پارەیەکی باشیان دەسکەوت.
سەرئەنجام لەوچاوپۆشییەی کە بەرامبەر بە بانگەوازی مرۆڤ کوشتن و نەفرەت کردنی پیرەپیاوی نوفێل لووشاتۆ دەکرا دەتوانم چی بڵێم؟ بەڵام دڵنیام کەزۆرێك لە فەرەنسییەکان سەریان سووڕمابوو، کاتێك ئێراق، کەئەوپەنای بۆبردبوو، ناوبراوی دەرکرد، حەزم نەکرد داوا لەدەوڵەتی فەرەنسا بکەم کە بێ دەنگی بکات. قسەکردنی لێرەو لەوێ بایەخێکی نەبوو، لەبەر ئەوە ئەو شتێك نەبوو جگە لە ئامرازێك بە دەستی ئەودەرەکیانەوە کە ئیدانەی رژێمەکەی منیان دەکرد.
بەم حاڵەش نابێت بڵێم کە هەموو رۆژنامەکان یەك هەڵوێستیان هەبوو. ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەنووسان هێمنییان پاراست و ئەو بارودۆخەی کە وڵاتەکەمی تێکەوتبوو بەو جۆرەی کەبوو باسیان دەکرد. ئەگەر هەندێ جاریش بەرێکەوت

وتارەکانیان تێکەڵ بەهاتو هاوار دەکرد، بەهیچ جۆر پەیوەندی بەمنەوە نەبوو، ئەوانەی کەلە پاش هاتنەدەرەوەی من لەئێران هاتبوونە سەرکار ئەوانیان ناچار بەم کارەدەکرد.

بەڵام نابێت لەبیر بکرێت کەهەر رۆژنامەنووسێك، جا لایەنگری من بووبێت یان نەیاری من، دەیتوانی بێت، ئەوەی کە دەیویست ببینێتو ئەوەی کە دەیویست بینووسێتو بڵاوی بکاتەوە. ئەگەر سنوورەکانمان بە رووی ئەواندا دابخرایێت، بەو جۆرەی کەئەمڕۆهەیە، چییان دەنووسی؟ لەناوخۆی وڵاتیشدا هەر بەمجۆرە چاوپۆشیم دەکرد، هەربۆیە تەلەفزیۆنی ئێران، بێ ئەوەی کە مەترسییێك هەڕەشەی لێبکات، فیلمی ئەو خۆپیشاندانانەی نیشان دەدا کە لەهەفتەکانی کۆتایی دەسەڵاتداریمدا لەتاران بەڕێوەدەچوو.

بەهەرحاڵ، حەزناکەم ئەم بەشەی تایبەت بەدەزگاکانی راگەیاندن کۆتایی پێبێنم بێ ئەوەی کە ئاماژەیەك بەوەی بکەم کەلەهەندێ حاڵەتدا رۆژنامەکان بێ لایەنانە ئەو هۆشداریانەیان بڵاودەکردەوە کە بۆ رۆژئاوا بەپێویستم دەزانی.

ماوەیەك پێش لەسەردانم بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکان لە نۆڤامبری ١٩٧٧دا، ئارنۆدوبووش گراڤ لە گۆڤاری ئەمریکی نیوزویك بۆ ئەنجامدانی وتووێژێك سەبارەت بە زنجیرەیەك رووداوی خەیاڵی کە هەندێ لە ئەکادمییەسەربازییەکانی رۆژئاوا وەسەریەکیان نابوو، سەردانی کردم. یەکێك لەم رووداوانە بەمجۆرە بوو: رژێمێکی دەستەچەپی لە ئێراندا هاتووەتە سەرکار کەبە توندی کەوتووتە بەر هەڕەشەو داوای یارمەتی لە یەکیەتی سۆڤیەت دەکات. رووسەکان هێرشێکی برووسکەئاسا لە دەریای خەزەرەوە تا کەنداوی فارس دەسپێدەکەن.

هەواڵنێری نیوزویك پرسیاری کرد:" بەبڕوای ئێوە کاردانەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەسەرەنجدان بە رابردوویان لە ڤێتنامو زئیرو ئانگۆلاو هتد، دەتوانێت چی بێت؟

وڵامم دایەوە :" زۆرێك لەئەمریکییەکانو لەوانەش هەندێ لەسیاسەتوانان، بێ ئاگان کەرێکەوتنێکی گرنگی دوولایەنە لەنێوان ئێرانو ویلایەتەیەکگرتووەکاندا

هەیە. بەپێی ئەم رێکەوتنە، ئەمریکا ئەرکی سەرشانیەتی لەکاتی هێرشی وڵاتێکی کۆمۆنیستیدا یان بەدەسەڵات گەیشتنی کۆمۆنیستەکان لەئێراندا، پاش بەدەست هێنانی رەزامەندی ئێمە ، بۆبەرگری لەئێران بێتە مەیدان. بردنەسەرو نەبردنەسەری بەڵێنەکان پەیوەندی بە ویلایەتەیەکگرتووەکانوە هەیە. تائەو جێی پەیوەندی بە ئێمەوە هەیەلەسەر قسەی خۆمان وەستاوین.

هەواڵنووسی نیوزویک منی تۆزێک زیاتر خستەژێرپاڵەپەستۆو گوتی :" پێت وانییە کە ئەگەر راگواستنی نەوت نەکەوێتە مەترسییەوە، رەنگە ویلایەتەیەکگرتووەکانو سۆڤیەت بسازێن؟"

وڵامم دایەوە:" ... پێدەچێت لەچ بارودۆخێکدا ویلایەتەیەکگرتووەکان کاردانەوەی هەبێت یان شەڕبکات؟ ئەم پرسە ئەوەندە روون نییەو بەگشتی پەیوەندی بە روانینەکانتانەوە هەیە بۆ بەرژەوەندی داهاتووتانو ئەو بایەخەی کە هێشتا بەهەندیٚ لەبنەماکانی دەدەن. بۆ نموونە، ئایا رووخانی رژێمی هاوپەیمانێکی سەربەخۆی خۆتان پیٚ قەبوولٚ دەکرێت؟"

سەرئەنجام، هەواڵنووسی نیوزویک بە ئاماژە بە قەرزاری ٢٥٠ ملیاردۆلاری وڵاتانی لەحاڵی گەشەکردندا وتی: سویدو کەنەداو هۆلەندو هتد، بڕیاران وایە چاوپۆشی لەیەک ملیاردۆلار لەم قەرزەبکەنو گەلانی قەرزاریش بەگشتی ئەم قەرزانە بە سووتاو دادەنێن. لە وڵامی ئەودا من گومانی خۆم لەم بارەوە دەربڕیو روانگەی خۆم بەمجۆرە باس کرد.

"زۆرهیوام بەوتووێژەکانی باکوور – باشوور بوو، بەڵام ئاکامەکەی تەنیا دەریایەک بوو لە سکاڵاکردن. هەنووکە جیهانی رۆژئاوا لە بارودۆخێکدا نییە کەبتوانێت چاوپۆشی لەم قەرزانەبکات، بەڵام ، ئەگەر پێش لە کۆتایی هاتنی ئەم سەدەیە " مامەڵەیەکی نویٚ" بۆ وڵاتانی لەحاڵی گەشەکردندا لە گۆڕیٚ دا نەبێت، شەڕ روودەدات. ئەمە نە ئەخلاقییەو نەژیرانە، جیالەمەش، مەترسیداریشە کەسەدا دەی خەڵکی دونیا زاڵبێت بەسەر لەسەد نەوەدی سەرچاوەکانی دونیادا"

دواتریش بۆ ئاگاداری نیوزویك باسم لەروانگەیەكی زۆر بەناوبانگ كردو گوتم:" پرسی دابەشكردنی دووبارەی سروەت لە گۆڕی دا نییە: ئەم ئیشە گرفتی چوار یاپێنج ساڵی داهاتوو چارەسەرناكات. ئەوەی كە پێویستە، یارمەتی دانە بە وڵاتانی لە حاڵی گەشەكردندا تا ئەوانیش بتوانن ببەن بە خاوەنی سەرچاوەی نوێی سروەت. پێویستە كە سەرچاوەیەكی نویٚ پێكبێت. ئاشكرایە كە ویلایەتەیەكگرتووەكان و ئەورووپای رۆژهەلآت و ژاپۆن لەهەرە بە تواناكانی ئەو وڵاتانەن كە دەتوانن وەها یارمەتییێك بدەن. تەنانەت كۆمپانیا نێونەتەوەییەكانیش كە، بەگشتی، بەرچاوتەنگی خۆیان بەدادۆشینی سەرچاوەكانی ئەو وڵاتانەی كە تێدا جێگیرن سەلماندووە، لە داهاتوودا دەتوانن لە پێكهێنانی سەرمایە بۆ وڵاتانی لەحاڵی گەشەكردندا دەورێكی لێبڕاوانە بگێڕن."

جیالەمەش، زۆرجار ئامارژەم كردووە كە هەندیٚ لەوڵاتانی كۆمۆنیستی دەتوانن بەشێوەیەكی زۆرباش پشكی گرنگی خۆیان لەم ئیشەدا هەبێت. ئەوانیش هەمووجۆرە سەرچاوەیەكی زۆردەوڵەمەندو تەكنۆلوجیای پێشكەوتوویان لەبەردەست دایە. ئەوانیش هەناردەكردنیان بە نرخێكی وەك ئەمریكییەكان دەنێرن بۆ وڵاتانی جیهانی سێیەم و شوێنەكانی تر. بەڕای من ئەوانیش دەبێت لەبەرپرسایێتی چارەسەركردنی كێشەی وزە لەجیهاندا پشكی یەكسان لەگەلٚ رۆژئاواو ژاپۆن لەئەستۆ بگرن.

بەلآم دەربڕینی راستی مەترسیدارەو بەرگری لیٚ كردنیشی گەوجی.

# فەسڵی ٢٥

# قوتابیەکانی سێحرباز

**لە دەرەوەی ئێران ڕووداوەکانی ٧٩-١٩٧٨ لە ڕوانگەی هەمووکەسێکەوە بەئیشی مەلاکان دادەنرێت، واتا هەموو مەلاشیعەکان کە ژمارەیان لە ئێراندا دەگاتە ٦٠٠٠٠ کەس. ئەمە لەراستی بە دوورەو ئەم هەڵەیە دەبێت ڕاست بکرێتەوە.**

## کردەوەی بێ بایەخی هەندێ لە مەلاکان:

**پێشترباسم کرد کەباوکم لە ١٩٢٥دا ڕاگەیاندنی کۆماری لە ئێراندا لەبەرچاوگرتبوو، بەڵام بەگشتی زانایانی ئایینی نەیان هێشت ئەم کارەبکات. لەبەر ئەوە داکۆکی کردن لە مەزهەبیان بە ئیشی پاشایەتی دەزانی نە کۆماری. لەکاتی وازهێنانی باوکم لە دەسەڵات، کاتێ من سوێندی یاسایم خواردو بەڵێنی داکۆکی کردن لە مەزهەبی شێعەی دوازدە ئیمامیم دا زانایانی ئایینی بەتێکرا منیان وەك پاشاو داکۆکی کاری ئایین ناسی.**

**لەوکاتەوە، بەپێی ئەو ئەرکانەی خرابووە سەرشانم چ وەك پاشاو چ وەك کەسێکی ئیماندار، هەمیشە هەوڵم داوە لە فەرمانەکانی پەرتووکی پیرۆزی ئیسلام واتا دادو دادوەریو ڕاستکرداری پەیرەوی بکەم. هەرچەند فێربوونم لەئایین بەپێی دەقە**

روونەکانی قورئان بووەو فێربووم کە پەیامو فەرمانەکانی قورئان دەقاودەق لە دەقەکانیەوە تێبگەم، لەماوەی ژیانمدا زۆرجار بۆم دەرکەوتووە، هەستم ئەوەبووەتە کە بەشێوەیەکی تایبەتی خوا چی لەچارەم نووسی بێت هەرئەوەیە.
پێشترباسم کرد کەهەندێ لەمەلاکان لەبەر ئەوەی کەبەشێك لەدەسەڵاتی داوەریو فێرکردنی خۆیان لەدەست دابوو تاچ ئاستێك ناڕازی بوونو چۆن مشتێك لەهەرە کۆنەپەرستەکانیان لەگەڵ هەندێ لە چاکسازییەکانی من بەتایبەتی لەگەڵ چاکسازی لەبواری زەویو زارداو ئەو چاکسازییانەی کە پەیوەندی بە بارودۆخی ژنانەوە هەبوو دژایەتییان دەکرد. بەڵام دڵنیام کە بەپێچەوانەی ئەم ژمارە کەمە، هەزاران کەس لەوان لە ناخیانەوە لەگەڵ ئەم سیاسەتانەی من هاوڕابوون. ئێمە بوێرانە هەنگاومان بەرەوپێشکەوتن هەڵگرتبوو. ئەوان بەتەواوی لەم مانایە ئاگاداربوونو زۆر نیشانەیان لە ڕەزامەندی خۆیان بۆمن دەردەبڕی. لە بەهاری ١٩٧٨دا کاتێك کەبۆ سەردانیساڵانەم ڕۆشتم بە مەشهەد بارودۆخەکە هەربەم جۆرە بوو. لەوێ خەڵك پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لەمن کردو سەدان کەس لەپیاوانی ئایینی ئامادەبوون و ئەمەگناسییان بەرامبەر بەمن نواندو ڕێزیان لێم گرت.
ئەوە پیاوانی زۆر پایەبەرزی ئایینی نەبوون کە شەڕی بوختان کردنیان دەسپێکردو بوونە هۆکاری هاندانو سەرهەڵدانی هەموو چەشنە وێرانییو تێکدانێك. ڕەگوڕیشەی ئەم ڕەوتە لە کۆتاییەکانی ١٩٧٦و لەلایەن لیبراڵەکانو دەستەچەپییەکانەوە سەرچاوەی گرت کەلە دەرەوە بەهۆی کەسانێکەوە کە ئامانجیان تەنیا ڕووخاندنی ڕژێم بوو پاڵپشتی دەکران.
تەنیا لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا بوو کە هەندێ لەمەلاکان لەناکاو لە ڕیزی هۆکارەکانی تێکدانو ڕووخاندندا دەرکەوتنو هەرلەم کاتەدابوو کە بەرەبەرە، لەگەڵ بەرین بوونەوەی پانتایی ئاڵۆزییەکان لە وڵاتدا، کۆمەڵێك لە مەلاو پایەتوڵاکان کە ڕۆژانە ژمارەیان لە زیادبووندا بوو خۆیان دابەدەستی ڕەوتی گەوجییەوە. بەڵام بێ گومان کە ژمارەیەکی زۆر لەوان – ڕەنگە زۆرینەیان –

بەهەست کردن بەبێ توانایی و لەژێرکاریگەری ئەو کەش وهەوا پڕ لەترس و تۆقاندنەی کەبە سەر وڵاتدا سەپابوو ناچارکران بێ دەنگی هەڵبژێرن. کردەوەکانی کەسی هەرەلاوازو ساویلکەیان لە نوفیل لووشاتۆ لە ژێرکۆنترۆڵ دابوو و فەرمانەکان لەوێوە وەردەگیرا، فەرمان گەلێك کەبەزۆری بەشێوەی هەڕەشە لە زمانی پیرەپیاوێکەوە دەوترا کە ئیدعای دەکرد بەناوی خواوە قسەدەکات.

دڵنیام کە ئەمڕۆ زۆرینەی زانایانی ئایینی لەو ئازارو نەهامەتیانەی کەبەسەر میللەتەکەماندا هاتووە نیگەرانن. مەبەستم تەنیا شەهیدەکان نییە بەڵکو ئەوبنەماڵانەشە کە ترسان و پەرتەوازەبوون بێ ئەوەی کەبتوانن خۆیان بژێنن، هەروەها مەبەستم ئەو چوارملیۆن بێکارەیە کە بەدەست شێواوی ئابوورییەوە دەناڵێنن، لەکاتێکدا کە راست ساڵێك لەوەو پێش وڵاتەکەمان زیاتر لە ملیۆنێك بیانیی دامەزراندبوو. بەدڵنیاییەوە ئەوانەی کە خزمەت بەخوایان هەڵبژارد. لەوەی کە دەیبینن چۆن گاڵتە بەبنەما پیرۆزەکانی ئایینی ئێمەدەکرێت لەناخەوە ناڕەحەت دەبن.

## کومۆنیستەکان چاوەڕێی کاتی گونجاون:

ناتوانم لەهەستی ئەوکەسانەی کە هەنووکە بە رواڵەت بەسەرئەم وڵاتەدا حکوومەت دەکەن تووشی سەرسووڕمان نەبم. ئەوان، سەرەڕای ئەوهەڵانەی کە کردوویانەو ئەوتاوانانەی کەئەنجامیان داوە، خۆیان بەئیماندارو نێردراوی خواوەند دەزانن. هیوادارم سەرئەنجام بۆیان دەربکەوێت ئەو شۆڕشەی کە بڕوایان وایە خۆیان بەرێیان خستوە بۆ شکۆمەندی خواوەند نییەو بەڵکو لە خزمەت هێزە شەیتانییەکاندایە. ئەوان بۆیان دەرکەوتووە کە ناڕازییان و ئاژاوەگێڕانێکی کارامە کەلە ئامانجی ئەوان پشتیوانی دەکەن هەموویان لە دەرەوە هەڵیان دەسووڕێنن چونکە، لەناوخۆی ئێراندا هیچ حیزبێکی کۆمۆنیست نەبوو کە خوازیاری ئەوان بێت.

یەکگرتنی شوومی " رەش و سوور" ژمارەیەك رێکخەری کەم وکارامەی لەبەردەستی مەلا چاو بەستراوەکاندا دانا. حیزبی کۆمۆنیست بۆ ئەوەی رەگ دابکوتێت و بەئاکام بگات، پێویستی بە بێکاری و هەژاری و نەفرەت و قەیرانی ئابووری هەیە. ئەمانەش ئەو دیارییانەن کەقوتابییە کلۆڵ و چارەڕەشەکانی سێحرباز کە ئەمڕۆ باوڕیان وایە بەسەر ئێراندا حکوومەت دەکەن لەبەردەستی کۆمۆنیستەکانیان داناوە.

تەنیا ئەوە ماوەتەوە کە کۆمۆنیستەکان خەرمانی بێ هیوایی و نەفرەت هەڵبگرن و شۆڕش بەقازانجی خۆیان زەوت بکەن. ئەو مەلایانەی کەلەم مامەڵە مەرگ هێنەرەدا ئاشتی یان هەڵبژارد بۆیان دەردەکەوێت کە فریویان خواردوە و ئەوانیش بەش بەحاڵی خۆیان بێ ئەوەی بزانن خەیانەتیان لە شوێن کەوتووانی خۆیان کردوە. ئەگەر خوا یارمەتییێك نەدات داهاتوویەك جگە لەمە چاوەڕێی وڵاتەکەی من ناکات.

# فەسڵی٢٦

## لە "تاکتیکەکانی تازیەباری" تاکارەساتی ئابادان

ڕۆژنامەکانی دونیا بوونی تیروریزم لەئێرانیان لەساڵی ١٩٧٨دا پەیداکرد. بەڵام لەساڵانی لەوە پێشتریش هەوڵی زۆر بۆکوشتنی منو وەزیرەکانو ژەنراڵەکانم درابوو، کەلەدووان لەم نیازخراپییانە بەشێوەیەکی زۆر سەرسووڕهێنەرانە ڕزگارم ببوو. لە ١٠ی ئاپریلی ١٩٦٤دا (٦٥ڕاستە- و.)، لەکاتێکدا کەلە نووسینگەکەم سەرقاڵی ئیش کردن بووم سەربازێکی گەنج بەناوی شەمس ئابادی پەلاماری دام. گوللەیەك بە تەنیشتما تێپەڕی. ئەم شێتە، بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆی، تەقەی لە دووکەس لەباخەوانەکان کردو دووکەس لە پاسەوانانیشی بەتوندی بریندارکرد، کە هەڵبەت ئەم دووکەسە پێش لەمردن، ئەویان کوشت. لێکۆڵینەوەکانی دواتر نیشانیدا کە پیلانگێڕییەکە لەلایەن چەپی توندڕەوەوە بوو.

زیرەکێکی دەروون ڕەش بەناوی نیکخا لە پشت ئەم پیلانەوە بوو. ناوبراو سزای دەساڵ زیندانی بۆبڕایەوە. ..گەرچی ئەوم بەخشی بەڵام هەرگیز بیرم نەدەکردەوە کە لێخۆش بوونەکەم ئەوبکات بە لایەنگری پاشایەتیو پێم وانەبوو کەهەر لە بەر لایەنگربوونەکەی سزای مەرگی بەسەردا بسەپێتو لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٩دا لەسێدارەبدرێت. لە هاودەستانیشی کە زۆربەیان ئەندازیارو خوێندنیان لە زانکۆی مەنچێستێردا تەواو کردبوو خۆش بووم.

لە ٧ی مارسی ١٩٥١دا، سەرۆك وەزیرانەکەم، ژەنڕاڵ ڕەزم ئارا لە مزگەوتی شادا بەدەستی کەللەویشکێکی مەزهەبی تیرۆرکرا. لە جەنیوەری ساڵی ١٩٦٥دا، سەرۆك وەزیرانێکی دیکە بەناوی عەلی مەنسوور، کوژرا. بکوژەکە کە ناوی موحەممەدبوخارایی بوو خوێندکاری زانستەئایینەکان بوو. ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەران، وەك ژەنڕاڵ مەولەوی و ژەنڕاڵ تاهێری- ش تیرۆرکران. لە ساڵەکانی ١٩٧٢ و ١٩٧٣دا سێ سەرهەنگی ئەمریکیش لەشەقامەکانی تاراندا بە گوللە کوژران. ناوبردنی هەموو ئەوانەی کەبەم شێوەیە گیانیان لەدەست داو بوون بەقوربانیی تیرۆریزم و، بە زۆرییش لە دژواریدا دەژیان، بەژان و خەم هێنەرە. یادی ئەو شوفێری تەکسی و ماشێن شۆرەی کەدەیان ویست تیرۆریستەکان چەك بکەن، لەپاڵ قوربانییەکانی دیکەدا، بۆهەمیشەلەبیرمدا دەمێنێتەوە.

لەساڵی ١٩٧٦دا هێرش کردن بۆ سەر ڕژێم لە دەرەوە پشتیوانی دەکرا. خاچی سووری نێونەتەوەیی، ئەنجومەنی نێونەتەوەیی مافناسان و ڕێکخراوی دیکەی لەم جۆرە دەیان ویست لە ئێراندا لێکوڵینەوە بکەن. داواکارییەکانی ئەوانم قەبووڵ کردو داوا لەوانەی کرا کە سەردانیان دەکرد کە ئێمە لە ڕەخنەو پێشنیازو تێبینیەکانی خۆیان ئاگاداربکەنەوە. چاکسازی گەلێك پێشنیارکرا کەبەباشی لەبەرچاومان گرت. پێویست ناکات بەبیری بێنمەوە کە باسکردنەکانی ئەم بەڕێزانە سەبارەت بەو شتانەی کەلە ڕابردوودا ڕووی دابوو بەتەواوی کەوتەڕوو. بەلاّم لە لایەکی تر، هیچ ئاوڕێکیان لە ئاکامی ئەرێنی ئەو دیدارانەو جێبەجێکردنی پێشنیازەکانیان نە دایەوە.

## پیلانگێڕان لە تاریکی دێنە دەرەوە:

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧دا شتێکی سەیروسەمەر ڕووی دا، تیرۆریزم لەناکاو ڕاوەستا.

خێرابۆم دەرکەوت کە پیلانێکی دیکە لەگۆڕی دایە، لەبەر ئەوە پیلانگێڕان کەتا ئەوکاتە خۆیان حەشاردابووو نهێنی بوون لە تاریکی وە دەرکەوتنو کەوتنە سەرزارو زمانان. بە تەواوی روون بوو کەلە بەرئەوەی لە تیرۆریزم بە ئاکامی دڵخواز نەگەیشتبوون دەبوو جۆرێکی دیکە بجووڵێنەوەو ئەویش دەربڕینی ناڕەزایەتی سیاسی بوو.

هەمووی ئەمانە ئاراستەکراوبوو. رێبەرانی پێشەوەی ئەم شەڕە دەوڵەمەندان بوون. رژیمێک کە ئەوان ئیدانەیان دەکرد رێگای لە کاروکاسپی پڕقازانجو سەرکەوتنی ئەوان نەگرتبوو. بەزۆری سەربە کۆڕوکۆمەڵە لیبراڵەکان بوونو دەکرێ بڵێین هەموویان پەیوەندییێکی پتەویان بە وڵاتانی رۆژئاواییەوە هەبوو. ئەوان بەگوڕوتینەوە هەڵچووبوون لە ئاخاوتنو دەربڕینیێکی نەزان خڵەتێنانەی بێ کۆتاییو خوازیاری " دیمۆکراسی پەرلەمانی راستەقینە" بوون.

من بۆخۆیشم بەراستی خوازیاری دیمۆکراسییێکی راستەقینەم کە، پێش لە هەموو شتێك، بەرژەوەندی وڵات بپارێزێت. هەڵسوکەوتم هەمیشە ئۆگری منی بە پاراستنی سەربەخۆیی وڵات دەربڕیوە. خوازیاری کاریکاتێرێك لە دیمۆکراسی نەبووم، بەو شێوەی کەلە شوێنەکانی دیکەدا بینراوەو سیستەمی چەندحیزبی بێ بایەخی کردوە.

دنەدانو هاتوهاواری بێ راوەستانی ئەم " دیمۆکراتانە" گەیشتە ئاستێك کە بەرنامەی کراوەیی کەشوهەوای سیاسی کەبەئاراستەی خۆی گوڕی زیاتری دەگرت، تووشی وەستان هات. ئەوەندەی پێنەچوو کە بۆم دەرکەوت ئەمە شەڕێکە بەمانای راستەقینەی وشە. هەرچی زیاتر بەرەو کراوەیی هەنگاوم هەڵدەگرت، بارودۆخی ناوخۆی وڵات شێواوترو خراپتردەبوو. دەستم بۆهەرئیشێك دەبرد، بەنیشانەی لاوازی منو دەوڵەتەکەم لێك دەدرایەوە.

## تەکتیکەکانی تازیەباری:

ئەوانەی کە خەونیان بەدەسەلاّتەوە دەبینی، بێ گومان هەستیان دەکرد هەمووشتێك بەخاوی دەڕواتە پێش. لێرەدا بوو کە هەندێ لە مەلاکان هاتنە مەیدان و چوونە ریزی تێکدەران. یەکێتی سوورو ڕەش پێکهات. یەکەمین سەرهەڵدانەکان لە ٧ی جەنیوەری ١٩٧٨و لە قوم دا دەستی پێکرد، لەم شارەئایینیەدا کەهەموو ساڵێك هەزاران کەس بۆ سەردانی گۆڕی مەعسوومەی خوشکی ئیمام ڕەزا دەڕۆنە ئەوەێ، لێکوڵینەوە سەبارەت بە هاندەری ئەم ڕووداوە دڵتەزێنانە کە شەش کەسی تێداکوژرا پێویست نەبوو. هەڵبەت ڕاگەیاندنەکان دەربارەی ئەم ژمارەیە تووشی زێدەڕۆیی هاتن.

لەوکاتە بەدوا بەکارهێنانی " تەکتیکەکانی تازیەباری" هەلی بۆ هاندەرانی جەماوەر ڕەخساند بۆ ئەوەی هەر چل ڕۆژ جارێك ئەوان بۆ خۆپیشاندانێکی نوێ ئامادەبکەن. هیچ دورنەبوو ئەم خۆپیشاندانە، بەهۆی ئەو بارگرژیو توندوتیژیانەی کە پەیدای دەکرد لە نێوەڕۆکدا بگۆڕێت بۆ سەرهەڵدانێك و خەڵکی زیاتری تێدا بکوژرێت.

بەمجۆرە دەیان توانی تووڕەیی جەماوەرێکی قیرسیچمەو خۆشباوڕ بگەیننە ئاستی تەقینەوە.

لەراستییدا، بە پێی داب و نەریتی ئیسلامی، خێزان و دۆستانی کەسی مردوو پێویست بوو لە چلەی مردووەکەدا لەسەر گۆڕەکەی ئامادەبن. پێم وانییە تائێستا ئەوەندە رووهەڵمالاّنە لەمردنی کەسێك بۆ گەیشتن بەئامانجەسیاسیەکان کەڵك وەرگیرابێت. ڕەش بینی و بەدگومانی ئاژاوەچییان هیچ سنوورێکی نەدەناسی. بیستوومە سەرانی ئاژاوەگێڕ تەرمی کەسانێکیان لە گۆڕستانەوە دەنا سەرشانیان و بەشاردا دەیان گێڕا کەبەمەرگی ئاسایی مردبوون و هاواریان دەکرد " ئەمەش یەکێکی تر لەقوربیانی ڕژێم، ئەمەش یەکێکی دیکە لەتاوانەکانی ساواك!".

ئیشی لەمە درێوتر لە خەیاڵدا ناگونجێت، بەڵام بەو جۆرەی کە دەرکەوتووە، جەستەی بریندارانی دیاری کراویان بە تێکەڵەیەکی کیمیایی لە جیوەو کرۆم دەماڵی بۆ ئەوەی ئەو وێنەگرانەی کە هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی یان تێدانەبوو بتوانن وێنەی کاریگەرتر بگرن.

## لەخشتەبردنی لاوان:

هیچکات ناتوانم لە ئاژاوەگێڕان بەهۆی ئەوەی کە زۆرینەی قوتابیانیان بەکارهێنا بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن خۆشبم. ئەوان پێویستیان بە کۆمەڵی زۆرو قەرەباڵغ هەبووو ئەمانەشیان لە زانکۆکانو پاشانیش لە قوتابخانەکاندا پەیدا کرد. ئەوان بە شێوەیەکی رێكوپێك دەستیانکرد بە ژەهراوی کردنی مێشکی لاوانمانو بەداخەوە سەرکەوتنیشیان بەدەست هێنا.

بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانی ئەوە لە لاوان ناکەم کە خۆپارێزبن. ئەوان لە هەموو وڵاتێکدا روودەنێن لە ئامانجەباشەکانو بەناوی دادپەروەرییەوە ئیشی گەورە ئەنجام دەدەنو هەروەها دەست بۆ چالاکی مەترسیداردەبەن. بەڵام بە تێپەڕبوونی کاتو نزیکایەتی رۆژانەیان لەگەڵ راستییەکانی ژیاندا گەرموگوڕی ئەوانیش کەم دەبێتەوە.

هەڵەی من لەوەدا بوو کەلە راگەیێنەکانی خۆمان بۆ بەرەنگاری لەگەڵ ئەو هەوڵە شێلگیرانەی کە بۆ ژەهراوی کردنی بیری ژنانو پیاوانو لاوانی ئێمە لە گۆڕیدا بوو کەڵکم وەرنەگرت. زۆرێك لەوان ئامادەبوون گوێ لە قسەی مەنتقی بگرن. لەراستیدا، لەو سەردەمەدا نیشانەگەلێك لە ئەمەگناسی زۆرینەی خەڵکی ئێران بەرامبەر بە پاشایەتی بەرچاوبوو. لە بەهاردا، کاتێکە رۆشتم بۆ مەشهەد، یەکێك لە شارە پیرۆزەکانی ئێرانو شوێنی ناشتنی ئیمامی هەشتەم، ئەو ئەمەگناسیەم بۆدەرکەوت. لەوێ ئەو پێشوازییە گەرمەی کەلەمن کرا کاریگەری زۆری لەسەر من دانا.

چەندهەفتەیەك دواتر كاتێكە سەرۆك وەزیرانی من، بەرێزئاموزگار، بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ خەڵك سەردانی پارێزگاكانی كرد لە تەورێز پێشوازیێكی سی سەدهەزار كەسی لێكرا. راست هەرلەم تەورێزەدا بوو كەسەرهەڵدانی مانگی فیبریوەری بووبە هۆی ئەوەی كە خەڵكی سەبارەت بەمن و دەسەڵاتەكەم تووشی دوودڵی بین.

## پێكهێنانی كەش وهەوای كراوەی سیاسی بە نیشانەی لاوازی دادەنرا:

لە ئاگۆستی ١٩٧٧دا لەكاتێكدا كەهەم نیگەرانی سیاسەتی دەرەوەو هەم نیگەرانی سیاسەتی ناوخۆیی بووم، بەرێزئاموزگارم وەك سەرۆكی وەزیرانی خۆم دەست نیشان كرد. هەڵبژاردنی كەسێك بۆ سەرۆكایەتی دەوڵەت كە لە كۆڕوكۆمەڵە نێونەتەوەییەكاندا ناسراوبێت بیرۆكەیەكی باش بوو، چونكە ئەو زۆرجار نوێنەرایەتی ئێرانی لە ئۆپێك دا دەكرد.

ئاموزگار ئەندازیاریی خوێندبوو، خوێندنیشی لە ئەمریكا تەواوكردبوو، هەربۆیە لەوێ دۆستی باشی هەبوو. بەراستی ئەویان بەپیاوێكی راستگۆ دەناسی و جیالەمەش لەبەر ئەوەی كە سەرۆكی حیزبی رستاخیزبوو دەیتوانی بە پشتیوانی ئەم رێكخراوەیە دڵگەرم بێت. بریاری من بۆ گۆڕینی سەرۆكی وەزیران بەومانایە نەبوو كە بەرێز هۆیدا پیاوێكی نەشیاوە. بەڵكو بە پێچەوانە، ئەم مرۆڤە پاك و بەفەرهەنگە ماوەی سیازدەساڵ خزمەتی نیشتمانەكەی كردبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی بەرێوەبردنی دەسەڵات مرۆڤ هیلاك دەكات و ئەویش بۆ خۆی حەزی دەكرد ماوەیەك لە كاروبارەكانی وڵات دووربێت، بۆ ئەوەی كە بیسەلمێنم هێشتا متمانەم بەئەو هەیە، كردم بەوەزیری دەربارو ئەمەش بەومانایەبوو كە ئەو لە نزیكمەوە بێت و هەمووڕۆژێك بتوانم لەگەڵی قسەبكەم.

هاوكات لەگەڵ دەست بەكاربوونی دەوڵەتی نوێ، رامگەیاند كەمن لاریم لە كرانەوەی كەش وهەوای سیاسی نییە بە مەرجێكە نەبێتە هۆی لێك هەڵوەشانی

ولآت. لە ٥ی ئاگۆستی ١٩٧٨دا، سالڕۆژی راگەیاندنی مەشرووتیەت، سالێك پاش هاتنە سەرکاری بەرێز ئاموزگار، رامگەیاند کەلەمانگەکانی داهاتوودا رژیم بۆ گۆڕانی بە دیمۆکراسییێك کە بکرێت لەگەلٚ رۆژئاوادا بەراوردی بکەیت هەنگاو هەلٚدەگرێت. بۆ ئەوەی کە بیسەلمێنم بەلێنی بێ نێوەڕۆك نادەم رامگەیاند کەلەکۆتایی خولی ئێستای مەجلیسی شوورای میلی یەوە، واتا لە بەهاری سالٚی ١٩٨٠دا هەلٚبژاردنی ئازاد بەرێوەدەچێت. هەروەها رامگەیاند کە هەموو ناڕازییێك جا چ ژن بێت یان پیاو، بەمەرجی رێزگرتن لە یاسای بنەڕەتی، کە بنەمای دیمۆکراسییە، دەتوانێت خۆی بۆ نوێنەرایەتی مەجلیسی شوورای میلی بپالێوێت. ئەگەر سەبارەت بە مەبەستی ناڕازییان بۆ رووخاندنی رژیم بچووکترین گومانێکم هەبوو، توانیم لە رۆژانی دواتردا نیشانەکانی سەلماندنی ببینم. بڕیارێك کە چاوەڕێ دەکرا رەزامەندی هەمووانی بەدواوە بێت جارێکی تر بەنیشانەی لاوازی من دانرا. ئاژاوەو بشێوی، ئیسفەهان و سەرئەنجام شیرازو تارانی گرتەوە. دنەدان و هاندان بێ راوەستان بەردەوام بوو. گرنگتر ئەوەی کە، ئەقلٚی دروست دەرفەتی ئەوەی نەبوو خۆی نیشان بدات هەتا خۆپیشاندەران گەوجی کردارەکانی خۆیان بۆ دەربکەوێت.

## کارەساتی ئابادان:

بیروڕای جەماوەر دەبوو بە چەشنێك هەلٚخرێت کەتەنانەت کاریگەری لەسەر کەسانی ڕاڕایش دابنێت.

چەند رۆژ دواتر، لە ١٩ی ئاگۆست دا، هەرواکە هەمووکەس دەزانێت بە شێوەیەکی جەنایەتکارانە سینەمایەکیان لەئابادان دا ئاگرتێبەردا. ژمارەی قوربانییانیش هەموو کەس دەزانێت: ٤٧٧کەس لەم کارەساتەدا بەهۆی سووتاوی و خنکاوییەوە لەناوچوون. دەسبەجێ بوختانێکی باو پەرەی پێدرا. گوناحی ئەم تاوانە گەورەیان خستە ئەستۆی دەولەت و وتیان پاسەوانەکانیان بۆ داخستنی دەرگاکانی ئەم

سینەمایە ڕاسپاردبوو هەتا ئەم تاوانە ئەنجام بدەن. پێویست بوو دەوڵەت وەك بەرپرس بناسرێت.

تاوانباری ڕستەقینە هەڵهات بۆ ئێراق و لەوێ قۆڵبەست کرا. دان پێدانانەکانی تۆمارکرا، بەلاّم دادوەرانێك کە ترس خرابووە دڵیانەوە دۆزە کەیان پەردەپۆش کرد. تەنیا ئەم کەسە بوو کە دیتوانی بڵێت ئەم تاوانەی لە جیاتی کێ و بەنوێنەرایەتی کێ ئەنجام دابوو.



# فەسڵی ٢٧

## چەند راستییێک سەبارەت بەساواک

لەگەڵ سەرهەڵدانەوەی دووبارەی تیرۆریزم دا، ساواك بوو بەئامانجێکی باش بۆ رۆژنامە نێونەتەوەییەکان. بەڵام ئەگەر خوێڕی و بەرەڵاکان دەستیان نەدەدایە کوشتن و خراپەکاری هەتا پۆلیس ناچاربێت چالاکانە بێتە مەیدان، ئایا ئەوەندە سەبارەت بە ساواك قسەدەکرا؟
زۆرتاوانی تۆقێنەریان داوەتە پاڵ ساواك. تەنانەت نووسیویانە کە بەملیۆن ئێرانی کردوە بە پیاوی خۆی، کەبە تەواوی پێکەنیناوییە: ئەم بەملیۆن مرۆڤەی کەبەپێی پێناسە وەفاداربوون بەدەسەلات، چ سێحریك تووشی گۆڕانی کردن هەتا بە لەرزۆك بوونی رژێم لە دژی من راپەڕن؟
لە ڕاستیدا، ساواك لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا ژمارەی ئەو کەسانەی کە تێدا دامەزرابوون و ئیشیان دەکرد ٣٢٠٠ کەس بوون کە ئەم ژمارەیە تا کۆتایی ساڵ نزیك بووەوە لە ٤٠٠٠ کەس. ناوی ساواك لە یەکەم پیتەکانی وشەگەلی فارسی (سازمان امنیت و اگلاعات کشور) دەزگای ئاسایش و هەواڵگری وڵات، پێکهاتووە. لە هەموو وڵاتانی دونیاش دەزگای لەم جۆرە هەیە، لەبەر ئەوە هەموو وڵاتێك ئەرکی ئەوەی هەیە کە بەرەنگاری ئەو کەسانەی ببێتەوە کە هەرەشە لە ئاسایشی ناوخۆو دەرەوەی دەکەن.

دەزگای لەمجۆرە، هەم لە ولأتانی دیکتاتۆریو هەم لە دیمۆکراسییەکانی رۆژئاوادا هەیە، وەك : کاگ ب، سیا، اف بی ئای، ئیم ئای فایو، دەزگای زانیاریو دژی سیخۆڕی فەرەنسا (SDECE) .

ئایا پێویستە ئەوە زیادبکەم کە هیچ هۆکارێك نییە ئێران تیرۆریزم تەحەمول بکات، هەروا کە ئیتالیاییەکان لە بریگادی سوورو ئەڵمانییەکان کردەوەکانی تاقمی بادێر ماینهۆف تەحەمول ناکەن؟ وە لە ئەڵمانیادا، کاتێك لە رۆژێکدا شەش زیندانی هەوڵی خۆکوشتن دەدەنو بۆ ئەوەی هەوڵەکەیان بە ئەنجام بگات، گوللە لە پشتەملیان دەدرێت، کەس تووشی سەرسوورمان نابێت کەچۆن ئەمانە لە زینداندا چەکیان دەست کەوتووەو، ئەم زنجیرە رووداوە سەیروسەمەرانەش، بە تەواوی ئاسایی نیشان دەدرێتو بیروڕای گشتی دونیاش بیّ ئەوەی دەنگی لێوەبێت چیرۆکەکە قەبووڵ دەکات.

ساواك پاش رووداوی کارەساتاوی دەسەڵاتی موسەدێقو بۆ بەرەنگاربوونەوەی خراپە کارییەکانی کۆمۆنیستەکان دامەزرا.

داوەری کردن سەبارەت بەوەی کە لە رۆژئاوا بەرامبەر بە کۆمۆنیستەکانیان چ هەڵوێستێکیان گرتووە پەیوەندی بە منەوە نییە. وەها داوەری کردنێك لە هەر روویکەوە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە سنووری هاوبەشت لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت دا هەبێت یان نا.

هەرچەند کە بەخت زۆر یارمەتی داوتوانیم لەگەڵ رووسیادا پەیوەندییّکی باشی دراوسێیەتیو هاوکاری ئابووری دوولایەنە بە قازانجی هەردوو ولأت دابمەزرێنم، بەلأم لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕەوە زۆر قۆناغی دژوارمان تێپەڕاند. ئایا پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکەم کە هێزی داگیرکەری سۆڤیەت، تا ئاپریلی ١٩٤٦ ولأتی ئێمەیان چۆڵ نەکردو حیزبی توودەش، لە مانگەکانی کۆتایی دەسەلأتی موسەدێق دا، پێی وابوو کاتی سەرکەوتنی نزیك بووەتەوە؟ لە خۆڕا نییە کەناچاربووین ئەم حیزبە کەنە تەنیا هەڕەشەی لە رژێم دەکرد بەڵکو یەکپارچەیی خاکی ولأتیشی خستبووە مەترسییەوە، بە نایاسایی رایبگەیەنین.

پاشان، ساواك دامەزرا بۆ ئەوەی کۆتایی بەو جموجوڵ‌و چالاکییە تێکدەرانەیە بێنێت کە لەدەرەوەو ناوەوە بەڕێوە دەچووو هەڕەشەی لە ئێران دەکرد. لەساڵی ١٩٥٣دا ئەم دەزگایە سپێردرا بە ژەنراڵ بەختیارو ئەویش لە دەزگای سیا بۆ راوێژکردن کەڵکی وەرگرت. سەرئەنجام زۆرێك لە ئەفسەرانی ساواك بۆ فێربوونی شێوازی کارەکانی سیا رۆشتن بۆ لانگلی‌و هەندێکیش رەوانەی وڵاتانی رۆژئاوایی کران بۆ ئەوەی فێری ئەو شێوازانەی بێن کەلەوێ بەکاردەهێنرا.

ژەنراڵ بەختیار تا ساڵی ١٩٦٢ ئەم بەرپرسیاریەتیەی لە ئەستۆ بوو، لەو ساڵەدا ناچاربووم ئەم مرۆڤە چاوچنۆك‌و پلەوپایەخوازە بەلاوە بنێم. ئەو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی کەڵکی لە شێوازی وا وەردەگرت کە تەحەمول نەدەکرا. ناوبراو دوورخرایەوەو بۆ پیلانگێڕی ڕۆشت بۆ بەیرووت. چەندساڵ دواتریش لە ئێراق دا تیرۆرکرا.

## دەورو دەسەڵاتی ساواك:

لە ئێرانیشدا وەك هەمووشوێنێکی تر، ناپاك‌و سیخوڕو ئاژاوەگێڕو خراپەکاری کارکوشتە دەژیا کەدەبوو بوونیان بە دەوڵەت‌و ڕێبەرانی ئاسایشمان رابگەیەنرێت. ئەمە ئەرکی ساواك بوو تا ئەوان ئاگاداربکاتەوە. ساواك وەك دەزگایەکی هەواڵگری‌و دژی سیخوڕی دەبوو یارمەتی دادوەری دادگاکان بدات. بەڵام لە ئەنجامی راسپاردەی کومسیۆنەکانی کۆمەڵی نێونەتەوەیی مافناسان دا،ساواك لە جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە وازی هێناو سپاردی بە پۆلیسی ئاسایی.

ئەفسەرانی ساواك سەربازانێکی جێی متمانەبوون کە بۆخۆیان کەڵکیان لە کەسانێکی تر لەناو سوپاو پۆلیس‌و دەرچووانی زانکۆدا وەردەگرت بەڵام لە راستیدا ساواك لە زۆرینەیەکی مەدەنی پێك دەهات. ئەم دەربڕینە بە هیچ جۆر لە جێی خۆیدا نییە کە شێوازی کارکردنی ساواك لەگەڵ یاساو ڕێساکانی دادگاکانی ئێمە- کەبە ئاشکرا لەگەڵ شێوازە یاساییەکانی رۆژئاوا یەکی دەگرتەوە- ولەگەڵ

دادگاکان و پارێزەرانی داکۆکی کارو دادگای بەرزو تێهەڵچوونەوە لە دژایەتی دا بوو. لەماوەی مانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٨دا، لەسەر راسپاردەی کومسیۆنەکانی کۆمەڵەی نێونەتەوەیی مافناسان، شێوازی لێکۆڵینەوە لە ساواکدا ئاڵوگۆڕی بەسەرداهات و ئەم کارە بە ئامادەبوونی پارێزەر بەڕێوە دەچوو.
ئەو کەسانەی کە بەرژەوەندییان لە گەل پێشکەوتن و تەکووزی وڵاتدا لە دژایەتی دابوو سەبارەت بە چالاکییەکانی ساواک زێدەڕەوییان دەکرد. بەپێی قسەی " سیخوڕەکان" ژمارەی " زیندانییەسیاسیەکان"و ئەو کەسانەی کەلە زیندانەکانی ئێمەدا " ئەشکەنجە" دەدران لە نێوان ٢٥٠٠٠ بۆ ١٠٠٠٠٠ کەس دەبوون. لە Chronicles of repression ، بڵاوکراوەیەك کە بەشێوەی شەونامە لە ئێراندا بەهۆی ناڕازییانی رژیمەوە لەدژی ساواك بڵاودەکرایەوە نووسرابوو کە: لە ساڵی ١٩٦٨وە تا ساڵی ١٩٧٧ واتا لەماوەی نۆ ساڵدا ژمارەی ئەوکەسانەی کە بەهۆکاری سیاسی دەسبەسەرو زیندانی کراون راست ٣١٦٤ کەس بووە.

## یاسای لێبوردن:

لە هیچ وڵاتێکدا بەرپرسایەتی کاروکردەوەی پۆلیس و هێزەکانی هەواڵگری نەخراوەتە ئەستۆی پاشا یان سەرۆکی وڵات، بەڵکو وەزیری ناوخۆ، وەزیری جەنگ یان سەرۆکی وەزیران بەرپرسن. لە ئێراندا، بەرپرسایەتی ڕاستەوخۆی ساواك لە ئەستۆی سەرۆك وەزیران بوو. سەرۆکی وڵات تەنیا لەسەرداوای وەزیری داد دەیتوانی مداخەلەبکات هەتا یاسای لێبوردن لە پەیوەندی لەگەڵ سزادراواندا جێبەجێ بکرێت. من هەرگیز ئەم یاسایەم پێشێل نەکرد.
کاتێکە بیستم هۆیدا سەرۆکی وەزیرانی پێشوو و ژەنراڵ حەسەن پاکرەوان و نەسیری و موقەدەم، سەرانی پێشووی ساواك، پێش لەوەی کە ئەشکەنجەو تیرۆر بکرێن، قورس وقایم ئاماژەیان بەم خاڵەکردبوو کە هەرگیز سەبارەت بە تاوانباران و

سزادراوان و گومان لێکراوان فەرمانێکیان لەمنەوە وەرنەگرتبوو بەراستی هەستم جوولا.

من دەسەلاتی سووککردنی بڕیاری دادگا لەسەر سزادراوان و ماف بەخشینم هەبوو وهەمیشە تا ئەوجێی کەدەکرا کەلکم لێ وەردەگرت. هەموو ئەو داواکارییانەی کەلەلایەن دادوەرەکانەوە بۆ لێبووردن و سووککردن ئاراستەی من دەکرا واژۆم دەکرد. هەمیشە بەپێچەوانەی ڕاوبۆچوونی دادوەرەکان لە هەمووئەو کەسانەی کە هەولی کوشتنی منیان دەدا خۆش دەبووم.

من ناتوانم بەرگری لەهەموو ئیشەکانی ساواك بکەم. ڕەنگە لەگەڵ ئەوکەسانەی کە دەسبەسەردەکران بە توندوتیژی هەڵس وکەوت کرابێت. بەلام فەرمان و ڕێنمایی ورد بۆ خۆبواردن لەهەر چەشنە هەڵس وکەوتێکی نابەجێ دەرکرابوو. ساڵێك دواتر، کاتێك خاچی سوور ویستی لێکۆڵینەوە بکات، دەرگای زیندانەکان بە ڕووی نوێنەرانیاندا کرایەوە. ڕاسپاردەکانی ئەوانمان لەبەرچاوگرت و لەوکاتەوە ئیتر ئێمە سکالایەکی دیکەمان نەبیست.

لە ئێرانیشدا وەك ئەو ولاتانەی دیکە کە دەیانم ناسی، هەلەگەڵێك کرا کەمن لە ڕوودانیان بەداخم، بەلام پێویستە لە نێوان تیرۆریستەکان و زیندانیانی سیاسیدا جیاوازی دابنێم. چارەیەك نەبوو لەکوژرانی هەندێ لە تیرۆریستەکان لەکاتی بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ساواك و، بە زۆریش لەگەڵ پۆلیسدا. هیچ کەسێك ئەوانی بۆ تەقەکردن وتالان و کوشتار ناچار نەکردبوو. ئەوان لەبەر ئەو ڕێگای کەخۆیان هەڵیان بژاردبوو دەبوونە قوربانی.

بەلام سەبارەت بەوکەسانەی کە بەهۆکاری سیاسی دەسبەسەر دەکران – ناتوانم خراپەکاران و ئاژاوەگێڕان لەریزی ئەمانەدا دابنێم– بە دڵنیاییەوە دەڵێم کەلە گەلیان زۆر بەباشی هەڵس وکەوت دەکراو هەرگیزو بەهیچ شێوەیەك ئەشکەنجە نەدەدران. هیچ کەس ناتوانێت ناوی کەسێکی سیاسی ببات کەبەهۆی ساواکەوە " لەناوبرابێت."

لە نۆڤامبری ١٩٧٨دا، ژەنەڕاڵ ئەزهاری سەرۆك وەزیرانی من، ژەنەڕاڵ نەسیری سەرۆکی پێشووی ساواك و سی کەس لە بەرپرسانی ئەو دەزگایەی دەسبەسەرکرد. لەبەرئەوەی متمانەم بە دادوەرەکان هەبوو کەلە چوارچێوەی دەسەلأتی یاساییان دا لێکۆڵینەوە لە تاوانەکانیان دەکەن، دەستم نەخستە ناو کاروباریان . بەلأم لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی دادپەروەری پاش ئەوەی کە ولأتم بەجێ هێشت زۆر رنجیاگم. سەرانی پێشووی ساواك و یەك لەوان ژەنەڕاڵ پاکرەوانی چارەرەش و بەدبەخت، کەزیاتر فەیلەسووفێك بوو تا سەربازێك و ئەرکەکانی خۆی بە شێوەیەکی زۆرباش ئەنجام دابوو، تەنانەت بەبێ دادگایی کردن، لە سێدارەدران.

هێشتا چاوەڕێی دەرکەوتنی سەروکەللەی مافناس و پارێزەرانێکی پێشکەوتنخوازین کە کاتێك دەیان بیست تیرۆریستێك لە بەرەو رووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی یاسا و ئاسایش و ئارامیدا کوژراوە ئەو هەمووە خۆیان هیلاك و ماندوو دەکرد. دەزگاکانی راگەیاندن ئەم تاوانبارانەیان دەکرد بە قارەمانانی ڕێگای ئازادی و سلأویان بۆ خراپەکارانی کۆمۆنیست وەك داکۆکی کارانی شێلگیری ماف مرۆڤ دەنارد.

ئەمڕۆ کێ بەرامبەر بەو ترسەی کە باڵی بەسەر ولأتەکەی مندا کێشاوە کاردانەوەیەك نیشان دەدات؟ هیچ کەس، مەگەر چەند رۆژنامەنووس و نووسەرێکی جوامێر.

# فەسڵی ٢٨

## یەکگرتنی شووم

لەماوەی هەشت مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨دا، خۆپیشاندان و ئاژاوە پەرەی سەند. بۆ کەمکردنەوەی بارگرژی و بۆ ئەوەی کە بیانوو نەکەوێتە دەست ناڕازییان و توندوتیژی بکەن، من و دەوڵەتەکەم کۆمەڵێك بڕیاری تایبەتیمان دەرکرد. چەند سەدکەس لە زیندانیانی سیاسی ئازادکران، بەلام ئەو ڕووداوە خوێناوییانەی کەلە ئیسفەهاندا ڕوویاندا دەوڵەتی ناچارکرد کەحکوومەتی سەربازی ڕابگەیەنێت. هاوکات نەخشەیەك بۆ ڕووخاندنی هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە دروستمان کردبوو بە دڵڕەقییەوە لە جێبەجێ کردندابوو.

لە کۆتایی مانگی ئاگۆست دا، ژەنڕاڵ موقەدەم، سەرۆکی ساواك، لەلایەن کەسایەتییێکی پلەبەرزی مەزهەبییەوە، کە ڕوونە ناتوانم ناوی بهێنم، هات بۆلام. ئەم کەسایەتیە بە ژەنڕاڵی گوتبوو:" قوربان، تکاتان لێدەکەم کارێکی بەرچاو ئەنجام بدەن، بە قازانجی هەمووکەسێکە." ژەنڕاڵ موقەدەم وشەی " بەرچاو"ی کە ئەو زانا پلە بەرزە گوتبووی چەندجار دووپات کردەوە.

نەمدەتوانی بەرامبەر بەم پەیامە بێلایەن بم بەلأم لەو بارودۆخەدا دەمتوانی چ هەنگاوێکی بەرچاو هەڵبگرم؟ پێم وابوو کە دەوڵەتێکی نوێ بەس بێت، دەوڵەتێك کە زۆرترین ئازادیم پێدابێت. بەرێز ئامووزگار کە بەڕاشکاوی لە گەلی قسەم دەکرد، نامەی دەست لە کارکێشانەوەکەی پێشکەش بەمن کردو منیش قەبووڵم کرد. ئەم ئیشە هەڵەیەکی گەورە بوو. من هەرگیز نەدەبوو ڕێگابدەم ئەم ڕاوێژکارە ژیرو دڵپاکە وازبێنێت.

## حکوومەتی سەربازی:

جێنشینی ئامووزگار، بەرێز شەریف ئیمامی، بە پێویستی زانی هێڵی ڕاستوچەپ بەسەر هەموو ئەو شتانەیدا بێنێت کەتا ئەوکاتە کرابوو، دەسبەجێ ڕایگەیاند کە حیزبی ڕستاخیزم پێویست نییە.( حیزبی ڕستاخیز دواتر لە٣٠ی سپتەمبردا هەڵوەشایەوە.) ئەو بەم ئیشەی خۆی پشتیوانی لایەنگرانی ڕژیمی لەدەستدا بێ ئەوەی کە ڕەزامەندی ناڕازییانی بەدەست بێنێت. شەریف ئیمامی بۆ ڕازی کردنی دڵی مەلاشێعەکان، دووبارە ڕۆژمێری کۆچی وەگەڕخستەوەو هەموو گازینۆو قومارخانەکانی داخست.

لە بەرئەوەی کە خۆپیشاندانی سەرشەقام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتردەبوو پێویست بوو دووبارە حکوومەتی سەربازی لەتاران و شارەکانی تردا ڕابگەیەنرێت. ڕۆژی ٨ی سپتەمبر، کە یاساکانی حکوومەتی سەربازی جێبەجێ کرا، لە لایەن ڕێبەرانی ناڕازیو ڕۆژنامەکانەوە بە " هەینی ڕەش" ناوی دەرکرد. دواتر کاتێک سیاسەتوانان لەم بارەوە داوای ڕوونکردنەوەیان لە سەرۆکی دەوڵەت کرد، ئەو ڕایگەیاند کە: لە ئاکامی بەرەو ڕووبوونەی خۆپیشاندەران لە گەل یاسادا، هەشتاوپێنج مۆڵەتی بەخاك سپاردن دراوەو ئەو بەرپرسایەتی ئاکامی حکوومەتی سەربازیو بارنائاساییەکە لەئەستۆدەگرێت.

توندوتیژی پەرەی ئەستاندو، هەرچەند کە درۆیان بۆ پۆلیس و سەربازەکان هەڵدەبەست، بەڵام من لەبەر دان بەخۆداگرتنیان ستایشیان دەکەم. لە زۆر حاڵەتدا، جەماوەری تووڕە نەیتوانی ئەوان تووڕە بکات و بۆ تۆڵەکردنەوەی هەڤاڵانی کوژراویان دەستیان لەسەردەست دانا.

ئاشکرایە کەئەگەر یاسا وڕێساکانی باری نائاسایی بەوپەڕی تواناوە جێبەجێ بکرایەت، دەبوو دادگاکان شەوورۆژ ئیش بکەن. لەراستیدا، باری نائاسایی تەنیا ئاگادارکردنەوەیەك بوو وبەهیچ جۆر ئاژاوەگێڕانی نەترسان.

سەربازەکانی ئێمە تەنیا بەرەو ڕووی ئاژاوەگێڕان و تاڵانچییان و خراپەکارانی چەکدار تەقەیان دەکرد.

## بارودۆخی پێش لەشۆڕش:

خراپەکاران فەرمانیان لە مزگەوتەکانەوە وەردەگرت و مزگەوتەکان ئیشەکانیان لەرێگای ئەڵقەکانی پەیوەندییەوە کونتڕۆڵ دەکرد. لە ئاژاوەگێڕانیش بیسترا کەدەیان گوت ئیسلام و سۆسیالیزمی سۆڤیەت پێکەوە دەگونجێن. ئەم بیرۆکە سەرسووڕ هێنەرانەیە لە لایەن " موجاهیدنی خەلق" وە کەلە لیبیا و لوبناندا ڕاهێنرابوون سازدەکرا.

ڕۆژنامەچەپەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوایی دەربارەی ڕژێمی ترسناك شتیان دەنووسی، بەڵام هیچکات یادێکیان لە تیرۆریستەکان نەدەکردو هەمووشتێکیان بە ئیشی ساواك و پۆلیس دەزانی. ئەگەر بڕیاربێت باوڕ بە بابەتەکانی ئەم ڕۆژ نامانە بکەین دەبێت هێشتا سەدهەزار کەس لە ناڕازییانی شا لە زیندانەکاندا بن. بەڵام ڕاستییەکان شتێکی تربوون. ژمارەی زیندانیانی سیاسی هیچکات لە ٣١٦٤ کەس کە پێشتر ئاماژەم پێدا تێپەری نەکرد. لە نۆڤامبری ١٩٧٨دا تەنیا سێ سەدکەس لە زینداندا بوون کە هەموویان پەیوەندییان بە تاوانەوە هەبوو.

ئاشكرایە كە بارودۆخی پێش لەو شۆڕشەی كە ئێمە گیرمان كردبوو بە دەستیەوە زۆر بە وریاییەوە دارێژرابوو. لە شارەگەورەكاندا كە هێشتا باری نائاسایی هەڵنەگیرابوو، دەستەو تاقم بۆ ئازاردان و زیان پێگەیاندن پێكهاتبوو. ئەم تاقمانە كەرەستە پێویستەكانی چەكدارێكی شارییان پێ بوو، واتا هەڵگری چەك و تەقەمەنی بوون و زۆری پێنەچوو فەرمانیان پێكرا كە پەلاماری باڵوێزخانەكان و دام و دەزگا دەوڵەتیەكان بدەن. دەبوو وڵات هەرچی زووتر بەرە ئاژاوەو پشێوی پاڵ پێوەبنرێت.

## سەردانی بەڕێزان سەنجابی و بازرگان:

من كە لە تەنگانە كەوتبووم، هەوڵم دا تا دەوڵەتێكی یەكێتی میللی پێك بێنم. داوام لە بەرێز عەبدولائینتزام كردو ئەویش ئەگەرچی پیروپەككەوتە بوو بەلام پێكهێنانی دەوڵەتێكی یەككرتووی، كەلەودا ئەندامانی بەرەی میللی تێدا بەشداری بكەن قەبووڵ كرد. پەیوەندیم بەرێبەرانی ئۆپۆزیسیونەوەكرد، كەلە نێو ئەواندا، داواكارییەكانی بەرێزسەنجابی سەرۆكی بەرەی میللی جێگای پەسەند نەبوو. راستیەكەی ئەوەیە كە بەرێز سەنجابی لەو كاتەدا تازە لە نووفێل لووشاتۆ گەڕابووە وە. هەرلەم سەروبەندەدا، سەرۆكی ئەنجومەنی ئێرانیی پشتیوانی لەمافی مرۆڤ، واتا بەرێز مەهدی بازرگان پەیمانكاری دەوڵەمەندیش سەردانی نووفێل لووشاتۆی كردو لە گەڕانەوەی دا بۆ نیشتمان، بۆ ماوەیەكی كورت لە لەندەن دا مایەوە.

٥ی نۆڤامبری ١٩٧٨ ئاژاوە سەرانسەری پایتەختی گرتەوە. لە ناو زانكۆو قوتابخانە كاندا پەیامی پڕ لە نەفرەت و بێزاری لە بڵندگۆكانەوە بلاو دەبووەوەو هانی قوتابیان و خوێندكارانی دەدا كەبچنەپاڵ چالاكانی " شۆڕشی ئیسلامی، لە شەقامە كاندا.

فەرمان بەسوپاوپۆلیس کرا کە ئاگاداری خۆپیشاندەران بن‌و، تەنیا ئەوکاتەی کەبە تەواوی پێویست بێت تەقەبکەن. لەبەشی رۆژئاواو ناوەندی شارەوە، زۆربەی بانکەکان‌و سەدان دووکان‌و زۆرێک لە میوانخانەکان‌و سینەماکان وبینا دەوڵەتییەکان تالان کران‌و ئاگریان تێبەردا. ئەو سەربازانەی کە پارێزگارییان لە باڵوێزخانەی بریتانیا دەکرد نەیانتوانی رێگە لە سووتانی بەشێکی بگرن. وەزارەتی زانیاریی‌و گەشت‌وگوزاریش گەمارۆدراو تالان کرا.

## گرتنی بەرێز هۆیدا:

لە ٥ ی نۆامبردا، بەرێز شەریف ئیمامی دەستی لەکارکێشایەوەو منیش داوام لە غولام رەزائەزهاری، سەرۆکی ناوەندی فەرماندەیی سوپاکرد کە دەوڵەتێکی نوێ پێکبێنێت. ئەو پیاوێکی دروستکارو ئەمەگناس بوو کە هەمیشە خۆی لە سیاسەت بە دووردەگرت. بەڵام لەوکاتەدا کە مەدەنییەکان ئامادەنەبوون دەسەڵات بە دەستەوەبگرن، ژەنراڵ ئەزهاری ئەو ئیشەی وەك ئەنجامدانی ئەرکێك لە ئەستۆی گرت.

ئەزهاریش لە بەرئەوەی کە حەزی دەکرد نیازپاکی خۆی بۆ نارازییان نیشان بدات، دەسبەجێ دوازدەکەس لە بەرپرسانی پلە بەرزی گرت کەلەناویاندا بەرێزهۆیداش لە ماڵەکەیدا دەسبەسەربوو. ئەو بەمنی گوت کە تەنیا دادگایی کردنێکی دادپەروەرانە دەتوانێت چۆنیەتی ئەو تاوانانەی کە ئاراستەی سەرۆك وەزیرانی پێشووم و ئەوکەسانەی تر کەدەسبەسەری کردبوون روون بکاتەوە.

من ئەوەندە متمانەم بە ئەقڵانی بوونی ئەم بەڵگەهێنانەوە نەبوو، بەرێز هۆیدا، کە هێشتا لە ناخی دڵمەوە رێزی بۆدادەنێم، یەکێك لە ئامانجە دڵخوازەکانی نارازییان بوو. لە راستیدا ئەمە من بووم کە دەیان ویست لە رێگای ئەوە وە پەلاماری بدەن. بەهۆیدام گوت پۆستێك لە دەرەوە هەڵبژێرێت‌و باڵوێزخانەی بەلجیکام پێشنیازکرد. ئەو کەزۆر متمانەی بەخۆی هەبوو – یان رەنگە لەبەر ئەمەگناسی

لەپادەبەدەر – ئەم راسپاردەیەی قەبووڵ نەکرد. سەبارەت بەو هەڵس وکەوتە نەفرەتاوییەی کەپێش لەئێعدام کردنی لەگەڵ ئەوکردیان دواتر قسەدەکەم.

## هیواو بیّ هیوایی:

لە رۆژەکانی سەرەتای دەسەلاّتی ئەزهاری دا، هێشتا تروسکاییێك لە هیوا لە دلّماندا مابوو. ئیشەکان دەستی پێکردەوەو بەرهەم هێنانی نەوت کەزۆرکەمی کردبوو دیسان بەرزبووەوە بۆ ٥٣٠٠٠٠٠ بەرمیل لە رۆژێکدا. خەلّك کاردانەوەی باشی لە خۆی نیشاندا. مانگرتنی گشتی کە فەرمانەکەی بۆ رۆژی سیّ شەممە ١٢ی نۆڤامبر لە نووفێل لووشاتۆوە دەرکرابوو شکستی خوارد. لە هەموو شارەگەورەکاندا ( تاران، ئیسفەهان، تەورێز، مەشهەد، شیراز) کۆمەلێکی زۆر لە لاوان بە داروکوتەکەوە بەرەو رووی تاقمەپەلاماردەرەکانی سوورو ڕەش بوونەوە.
بەلاّم ئێمە خوازیاری ئاشتیو ئاشتەوایی بۆ هەموو ئێرانییەکان بووین.
دەولّەت کەلّکی لە هەموو تواناییەکانی وەرگرت هەتا ئیشێك ئەنجامی نەدات کەرەنگ بوو حالّەتی دژی تیرۆریزمیشی هەبێت. نەتەنیا لەماوەی چوارپێنج جاردا چەند سەد زیندانی سیاسیمان ئازادکرد، بەلّکو لەمانگی دیسامبردا ژەنراڵ ئەزهاری راگەیەنراوی ١٩ی ئۆکتوبەری ١٩٧٨ی دەولّەتی شەریف ئیمامی پەسەندکرد کە هەموو ئەو ئێرانییانەی کە رێزیان لە یاسای بنەڕەتی دەگرت دەکەوتنە بەر لێبوردنی گشتییەوە. هەرلەو کاتەدا دوایین زیندانیانی سیاسیمان ئازادکرد، مەگەر ئەو کەسانەی کە بەهۆی کوشتنو تاوانەوە سزایان بەسەردا سەپابوو.
بەلاّم کێشەکە تەنیا بە پیلانگێری ناڕازییان لە دژی من نەوەستابوو، هەموو هێزەتێکدەرەکان دەستیان وێك دابوو. پێویست بوو ئێرانی نویّو پێشکەوتوو وێران بکرێتو لەگەڵ ئەویشدا، نوێنەری بنەماڵەیەك کە زۆرجار ولاّتی لە فەوتان رزگارکردبوو بە هەرجۆرێك بووە دەبوو لەناوبچێت.

دواتر ئەو مانگرتنانەی کە دەبوو وڵات بەچۆکدابێنێت دەستی پێکرد. ڕۆژانە چەند کاتژمێر کارەبایان دەبڕی، گواستنەو گەیاندن مانی گرت، ئاو و نەوتیش ڕاگیرا، سەرئەنجام بانکەکان و زۆربەی وەزارەتە گرنگەکان یەك لەدوای یەك و یان هەموویان پێکەوە داخران و میللەت پەکی کەوت. جەماوەری بێکار هاتنە سەرشەقام و تووڕەیی و توندوتیژیی پەرەی سەند. کرێکاران و مانگرتووانی دیکەو بنەماڵەکانیان لەلایەن دەسەڵات بەدەستانەوە هەڕەشەیان لێدەکرا. ئاشکرایە کەلە ویزگەیەکدا پێنج یان شەش کەس دەتوانن تەزووی کارەبا ببڕن. سەبارەت بە ترومپاخانەکانی نەوتیش شتی وا هەر دەکرێت. هەر کەمبوونی ژمارەی ئەم چەندکەسە نیشانی دەدات کە چۆن توانییان ئەم مانگرتنە سەرپێچی کارانەیە بە تەواوەتی ڕێك بخەن. لە ماوەی دوومانگ دا مانگرتنی سەر بیرەنەوتەکان و پاڵاوگەکان زیانێکی بێ ژماری پێکهێنا.

هەوڵدان بۆ سەروسامان دانەوەی دووبارەی وڵاتێکی شێواو و یاخێتی لێدراو، بێ ئاکام مابووەوە. جیالەمەش، زۆری پێنەچوو کە دەرفەتێك بۆ درێژەدانی هەرجۆرە تێکۆشانێك نەما. لە بەرئەوەی لە کۆتاییەکانی دێسامبردا ژەنراڵ ئەزهاری تووشی نەخۆشی دڵ هات و ئیتر نەیتوانی درێژە بە بەرپرسایەتیەکانی بدات.

## ناکرێ دەسەڵات بسپێردریت بە کەسێکی تر:

کەسانێك هەن کە ئەمڕۆ دەڵێن دەبوو حکوومەتی سەربازی و باری نائاساییم لەو پەڕی توندی دا جێبەجێ بکردایەت. گومانی تێدا نییە کە دەمتوانی بە کەڵك وەرگرتن لەو کەرەستەو هۆکارانەی کەلەبەر دەستم دابوو تەکووزو ڕێك و پێکی پێك بێنم، بەڵام بە چ نرخێك؟

بەمن دەڵێن نرخی پێکهێنانی تەکووزو ڕێکخستنی وڵاتەکەم زۆر کەمتر لەم ئاڵۆزییە خوێناوییەی کە ئێستا زاڵە، تەواودەبوو. لە وڵامدا تەنیا دەتوانم بڵێم پاش ڕوودانی هەر ڕووداوێك گێڕانی دەوری کەسێك کە پیش بینی دەکات

زۆرئاسانە پاشا ناتوانێت بە رشتنی خوێنی هاونیشتمانەکانی تاجو تەختەکەی خۆی بپارێزێت. دیکتاتۆر دەتوانێت ئیشی وابکات، لە بەر ئەوەی لە ژێرئالآی ئایدۆلۆژیا و بیروباوڕدا کار دەکاتو لە ڕوانگەی ئەوەوە بە هەرنرخێك کە بکرێت پێویستە سەربکەوێت. بەڵام پاشا دیکتاتۆر نییە. لەنێوان شاو خەڵکەکەیدا پەیوەندییێك هەیە کە ئەو ناتوانێت پیێ شێلی بکات. دیکتاتۆر شتێکی نییە کە بیسپیرێت بە جێنشینەکەیو دەسەلآت تەنیا لەبوونی ئەو دایە بەلآم پاشا میراتگری تاجو تەختێکە کە دەبێت بیسپێرێت بە جێنشینەکەی. ولآتەکەی من لەبەر ئەوەی کەلەو کاتەدا گەیشت بوو بە ئاستێکی بەرچاو لە فەرهەنگو پیشەسازیو کشتوکاڵ و تەکنۆلوجیا، لە بیری بارودۆخێکی سیاسی تایبەت دابووم کە کوڕەکەم لەسەردەمی خۆم دا تاجوتەختەکەی لەمنەوە وەربگرێت.

لەماوەی هەفتەدژوارەکانی کۆتایی دەسەلآتم دا، تەلەفوون کردن زۆربەی کاتەکانمی گرتبوو. بەردەوام رستەیەکم دووپات دەکردەوە:" بە هەر نرخێك بووە لە خوێن رشتن خۆ ببوێرن."

رۆژێك کە شارەوانی شڵەژاوی مەشهەد رایگەیاند کە خۆپیشاندەران دەیانەوێت پەیکەرەکەم بێننەخوارەوە، گوتم لە کاتێکدا کە دەوڵەت خەریکە لە هەموو شوێنێکداو لە پەیوەندی لە گەل هەمووشتێکدا پاشەکشێ دەکات، نابێت هێزەکانی ئاسایش بۆ پاراستنی پەیکەرێك بەکاربێنیت.

# فەسڵی ٢٩
# بەختیار، سەرۆکی وەزیران
# ئەرکی سەیر و سەمەری ژەنراڵ هایزێر

بەدرێژایی ئەم ماوەیە هەوڵم دەدا خۆم ڕازی بکەم کە ناڕازییانم لە کارەکانیاندا نیازپاکییان هەیە. ئەگەر ئەوان بەدوای کەش و هەوای کراوەتری سیاسییەوە بوون دەبوو پێیان بدرێت. ئەگەر ئیدانەی بوونی گەندەڵییان دەکرد، من بەتەمای داواکاری ئەوان دانەنیشتبووم و بۆ بەتوندی بەرەو ڕوو بوونەوە لەگەڵ گەندەڵیدا هەنگاوم هەڵگرتبوو.

بڕیارم وابوو کە پەنا نەبەمە بەرهێز و هیواداربووم ئەوقەیرانەی کەپێش هاتبوو بە لەبەرچاوگرتنی یاسای بنەڕەتی و لە کەش و هەوایەکی ئاشتیخوازانەدا کۆتایی پێ بێت. بۆچوونم وابوو کە دەوڵەتێکی مەدەنی کە ئەندامانی بەرەی ناڕازیشی تێدابێت دەتوانێت ئەوکەسانەی کە وەك مەڕەکانی پانوورژ شوێنی پێی هاندەرانیان گرتووە هێوربکاتەوە و گرنگتر لەوەش دووبارە وڵات بخاتەوە گەڕ.

### داواکارییەکانی سیاسەتوانان:

سەرەتا ڕووم لەدوکتۆر سدیقی نا کە یەکێك بوو لە ئەندامانی بەرەی میللی، کە باوڕم وابوو پیاوێکی نیشتمانپەروەرە. ئەو بێ ئەوەی بچووکترین مەرجێك دابنێت

ڕایگەیاند کە ئامادەیە دەوڵەتێکی یەکگرتوو پێک بێنێت، بەلاّم حەوتوویەک دەرفەتی ویست بۆ ئەوەی لەبارەیەوە بیربکاتەوە. منیش داواکارییەکەیم قەبووڵ کرد. بەلاّم سەرئەنجام ئەو، خۆی دابەدەست ئەو پاڵەپەستۆیانەی کەلە لایەن حیزبەکەیەوە دەخرایە سەری و داوای کرد کەلە وڵاتدا بمێنمەوە بەلاّم ئەنجومەنێکی فەرمانڕەوایی پێك بێنم.

ئەم مەرجە جێی پەسەند نەبوو لەبەر ئەوەی هاوواتابوو لە گەل قەبووڵ کردنی ئەوەی کەمن شیاوی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی پاشایەتی نیم.( دوکتور سدێقی لانی کەم تەنیا سیاسەتوانێکی مەدەنی بوو کە داواکاری ئەوە بوو بەهیچ نرخێك وڵات بەجێ نەهێڵم.).

بەرێزسەنجابی و بەرێز بازرگان هەرکە گەڕانەوە بۆ تاران، شەڕێکی وایان بەدژی دەوڵەت بەڕێ خست کەبەهۆی لێدوانی ئاشکرایان لەدژی یاسای بنەڕەتی دەسبە سەرکران. بەرێزسەنجابی لە زیندانەوە داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ من کرد و داواکارییەکەشی لە رێگای سەرۆکی ساواکەوە بوو. هەمان ئەوکەسەی کەلە دەسەلاّتی ئاموزگاردا لەلایەن رێبەرێکی مەزهەبییەوە پەیامی بۆمن هێنابووو دواتریش لە سێدارەدرا.

من کە ئامادەبووم بۆ ئاشتی هەمووشتێك بکەم، پاش چەند رۆژ لە زیندانی بوونی بەرێز سەنجابی داوام کرد کەئازادبکرێت و بانگهێشتم کرد کە بمبینێت. ئەو لە چاوپێکەوتنەدا دەستی منی ماچ کردو بە گەرم وگوڕی ئەمەگناسی خۆی بەرامبەر بەمن دەربڕی و رایگەیاند کەئامادەیە دەوڵەت پێك بێنێت، بە مەرجێکە "بۆ پشوودان" ئێران بەجێ بێڵم.

نەباسێکی لەوەکرد کەپێش چوونم لە ئێران دەبێت ئەنجومەنی فەرمانڕەوایی پێك بێت – کەلە رووی یاسای بنەڕەتییەوە پێویست بوو – و نەپرسی گرتنی دەنگی متمانەی پەرلەمانی بۆ کابینەکەی هێنایەگۆڕێ. ناچاربووم وازلەم رێگایەبێنم و درێژە بە وتووێژی زیاتربدەم کەبەخراپتربوونی بارودۆخەکە رۆژ بە رۆژ دژواری ئەمەش زیاتر دەبوو. ئایا ئەم سیاسەتوانانە دەیانزانی کە وڵات لە لێواری

هەڵدێردایە؟ ئایا دەیانزانی کە ئیتر پرسی مافی تایبەتیو قۆرخکردن یان لە بەرترو بانتری حیزبێکی سیاسی لە ئارادا نییەو پرسی مانو ژیانی وڵاتێك لە گۆڕێدایە؟

## بەختیار دۆستەکانی فەوتاند یان:

تێکچوونی باری ئابووری کەلە هەموو شوێنێکدا بەرچاو بوو بەقەدەر ئاژاوەکانی سەرشەقامو زانکۆکان نیگەرانی دروستکردبوو. مانگرتنەکان یەك لەدوای یەك دەستی پێدەکرد. بەرهەمهێنانی نەوت کەبە زۆر دەگەیشتە ٥/٨ ملیۆن بەرمیل لە ٢٥ی دیسامبردا دابەزی بۆ ١/٧ ملیۆن بەرمیل کەبۆ ئابووریمان کارەسات بوو. گواستنەوەی گازی سروشتی بۆ سۆڤیەت (کە ئێمە گرنگترین دابینکاری بووین) لە ڕادەبەدەر کەم ببووەوە. وەها بارودۆخێك نەیدەتوانی بەردەوام بێت.

لەوەها هەلو مەرجێکدا، بەرێزشاپووری بەختیار یەکێکی تر لە ئەندامانی بەرەی میللی لە ڕێگای سەرۆکی ساواکەوە داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ من کرد. پێشتر بە هۆی بەرێزئامووزگارەوە کە لە کۆتاییەکانی مانگی ئاگوستدا پۆستێکی سیاسی نەبوو بەڵام هێشتا ڕاوێژکارێکی تێگەیشتوو و بەنرخ بوو، لەگەڵ بەرێز بەختیار پەیوەندیم هەبوو. هەرلەوکاتەوە دەمویست دەوڵەتێکی یەکگرتوو پێك بێنم، بەڵام بیانوو گرتنەکانی هەندێ لە سەرانی ناڕازی ڕێگای لەمن گرت، لەکاتێکدا کە بەرێز سەنجابی خەریکی بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونی هاندەرانەبوو، بەرێزبەختیار، بەش بەحاڵی خۆی هەڵسو کەوتێکی ژیرانەو بەپارێزی هەبوو.

هەرلەبەر ئەم هۆکارە بوو کە ئامادەبووم بەختیارببینم. پێم وایە ژەنراڵ موقەدەم بوو کە ئێوارەیەك پاش کاتی ئاسایی ئەوی بۆ کۆشکی نیاوەران هاوڕێیەتی کرد. ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر قسەمان کرد. بەرێزبەختیار ئەمەگناسییێکی زۆری بەرامبەر بە دەسەڵات نیشان داو هەوڵی دا بیسەلمێنێت کەتەنیا ئەو دەتوانێت لەو بارودۆخە قەیراناوییەی دا کە تێیکەوتبووین دەوڵەتێك پێك بێنێت.

لەبەرئەوەی کە رایگەیاند بۆ رێزگرتن لە یاسای بنەرەتی پێویستە پێش لە رۆشتن بۆ پشوو ئەنجومەنی فەرمانڕەوایی دەسنیشان بکەمو ئەویش لە پەرلمانەکان دەنگی متمانە بگرێت، پێشنیازەکەی جێگای پەسەندبوو. ئەو بە زەحمەتێکی زۆر کابینەیەکی مەدەنی پێکهێناو مەجلیسی شۆراش بە ١٤٩ دەنگی ئەریٌو ٤٣ دەنگی نا و ١٣ دەنگی بیٌ لایەن متمانەی بە کابینەکەی بەخشی. رەزامەندی زۆرینەی مەجلیسی سەنا زۆرتر مایەی دڵگەرمی بوو. بەلاّم ئەو نەیتوانی بەرنامەکەی بەو جۆرەی کە دەیویستو بۆ نێردراوانی تایبەتی کەلە چوار دەوری دونیاوە نێردرابوون بۆ تاران‌و لە تەلەفزیون دا باسی لێوە کردبوو، جێبەجیٌ بکات. دۆستە دێرینەکانی لەبەرەی میللی دا لێبڕان بۆ لەناوبردنی.

سەرسووڕهێنەر ئەوەی کە وادیاربوو رێبەرانی ولاّت لەوکاتەدا نیگەرانی گێرانەوەی تەکووزو وەگەڕخستنەوەی ئابووری نەبوون‌و ئەوەی کەئەوان بەدوایەوە بوون، چارە نووسی پاشا بوو. هەندیٌ لە کەسانی دەوروبەرم ئامۆژگارییان ئەوەبوو کە هەفتەیەك بڕۆم بۆ دەرەوی ولاّت تا کەف‌وکوڵەکە دامرکێتەوە. لە لایەکی دیکە ژەنراڵەکانم دژی ئەم رێگەچارەبوون‌و بەردەوام دەیان گوت :" قوربان، ئەگەر ئێوە برۆن هەموو خۆی دەدات بەدەستەوە."

رووداوەکانی ئێران لاپەڕەی یەکەمی هەموو رۆژنامەکانی دونیای پڕکردبوو.

## کارلە کار ترازا:

ئێستا دەتوانم بڵێم کە چەند هەفتەیەك دەبوو کە پێم وابوو یاری تەواوبووەو کارلە کار ترازاوە.

ماوەیەکی دووورودرێژبوو – نزیك بە دووساڵ – کە هەڵوێستی هەندیٌ لە ئەمریکییەکان منی نیگەران دەکرد. دەمزانی کە هەندێکیان لە بەرنامە سەربازییە کانی ئێمە ناڕازیین. ئەوان بە جۆرێکە هەمووکەس ببیسێت رایاندەگەیاند کە پێدەچێت ئەو تەکنیککارانەی کە خەریکی فێرکردنی چەکە نویٌ کانن لەلایەن

رووسەکانەوە بە بارمتە بگیرێن. ئایا بە سەرەنجدان بە شێوازی بیرکردنەوەیان، مەبەست ئەوەبوو کە پێویستە رێکەوتن نامەی دوولایەنەی نێوان ئێمەو ئەمریکا هەڵبووەشێتەوە؟ ماددەکانی ئەم رێکەوتننامەیە، ئەمریکییەکانی دەروەست کردبوو کەئەگەر ئێمە بکەوینە بەر پەلامار یان کونترۆڵی وڵاتێکی کۆمۆنیستی یارمەتیمان بدەن. بەڵام لەبەر ئەوەی هەڵوێستی ئەمریکییەکان منی نیگەران دەکرد، پەیوەندیم بە دەوڵەتی ئەمریکاوە کردو داوام کرد بۆچوونی خۆیان لەسەر ئەو رێکەوتننامانەی کەلە نێوانماندا هەبوو رابگەیێنن.

وڵامەکە بەمجۆرە بوو:" ویلایەتەیەکگرتووەکان هەمیشە رێز لە رێکەوتننامەکانی خۆیان دەگرن...."!

پاش چەندمانگ، دەرفەتێك رەخساو توانیم دۆستی خۆشەویستم نلسۆن راکفلێر ببینم. زۆر راشکاوانە پرسیارم کرد: " ئایا دەکرێ گومان بکەین ئەمریکییەکان‌و رووسەکان دونیایان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردبێت؟"

ئەو وڵامی دایەوە:" بێگومان کە نا. لانی کەم تا ئەو جێی کەمن دەزانم..."

لەمانگی سپتەمبری ١٩٧٨دا ئەوکاتەی کە بارودۆخەکە بەراستی خراپ ببوو، باڵوێزەکانی ئەمریکاو بریتانیا پێکەوە هاتن بۆ سەردانم‌و بەڵێنی پشتیوانی خۆیان بەمن دا. بە پێچەوانەی ساڵی ١٩٥١، کە دووساڵی خایاند تا بەرێکەوتنێك بگەن، رایانگەیاند کە بۆ پشتیوانی کردن لەمن یەکیان گرتووە.

### ئاگادارکردنەوەیەك لە پراڤادا:

تا سەرەتاکانی هاوین بە زۆری باڵوێزی سۆڤیەتم دەدیت. ئەو کەراست ماوەی یەك ساڵ بوو کەلە تاراندا دەژیا، بەردەوام بە جۆرێك دەدوا کە هەمیشە بەڵێنی دۆستایەتی‌و هاوکاری سۆڤیەتی بەمن دەدا. بەڵام پاش ئەوەی کە پشوویەکی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ تاران ئیتر هیچکات نەمدیت.

سەرەڕای ئەمەش، بەراستی ڕووسەکان نیگەرانی ڕووداوەکانی تاران بوون. بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم راستییە لەیەکێك لە وتارەکانی رۆژنامەی پراڤادا لە کۆتایی مانگی نۆڤامبردا دەرکەوت و ئاگادارکردنەوەیەکی باش بوو: " یەکیەتی سۆڤیەت کە پەیوەندییەکی باشی دراوسێتی لەگەڵ ئێراندا هەیە، دووپاتی دەکاتەوە کەلەگەڵ هەرجۆرە دەستێوەردانێکی دەرەکی لە کاروباری ناوخۆیی ئێراندا لەلایەن هەر کەسێکەوەو بەهەر شێوەو بیانوویەکەوە بێت دژایەتی دەکات. گێروگرفتێکی بە تەواوی ناوخۆیی دەربارەی یاساو رێك و پێکی لە ئێراندا سەری هەڵداوەو ئەم کێشەیە دەبێت لە رێگای ئێرانییەکان خۆیانەوە چارەسەربکرێت. پێویستە هەموووڵاتان جاڕنامەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و بنەماکانی کۆنووسە نێونەتەوەییەکان لەبەرچاو بگرن و رێز لە دەسەڵاتدارێتی و سەربەخۆیی ئێران و ئێرانییەکان بگرن.

پێویستە روون بێت کە هەرجۆرە دەستێوەردانێك، بەتایبەت دەستێوەردانی سەربازی لەکاروباری ناوخۆیی ئێران دا کە سنووری هاوبەشی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی دا هەیە، بە هێرش بۆ سەر ئاسایش و بەرژەوەندی رووسیا دادەنرێت."

لە ٧ی دیسامبردا، ویلایەتەیەکگرتووەکان بەفەرمی رایگەیاند کەبەهیچ جۆر دەست لە کاروباری ئێران وەرنادات. سەرەڕای ئەمانەش، باڵوێزەکانی بریتانیا و ئەمریکا لە هەرچاوپێکەوتنێکیان دا لەگەڵ من دەیانگوت:" پشتیوانی لە ئێوە دەکەین."

لە ماوەی پاییزو زستانی ١٩٧٨-٧٩دا ئەوان منیان بۆ پێکهێنانی کەش و هەوایەکی لەڕادەبەدەر کراوەی سیاسی هاندا. بێ گومان من لەگەڵ پێکهێنانی کەش وهەوای کراوەی سیاسی دا بووم، بەڵام پێکهێنانی بە پەلەی ئەم کەش وهەوایە لەم سەردەمە شێواوەدا ئەویش بە کەمبوونی کەسانێکی لێهاتووەوە کە بتوانن وەها سیاسەتێك جێبەجێ بکەن، تەنیا بەڵاو کارەساتی بەدواوە دەبوو. جیالەمەش، بەزۆری هەرکات سیاسەتوانان یان نێردراوانی ئەمریکییم دەدیت، من

یان بۆ خۆڕاگری هان دەدا. بەڵام کاتێک کەلەم بارەوە پرس وجۆم لە باڵوێزی ویلایەتەیەکگرتووەکان کرد، وڵامی دایەوە فەرمانێکی لەوجۆرەی پێنەگەیشتووە.

## رژێمێکی نوێ پێش بینی کراوە:

ئەمجۆرە دڵگەرمییانە لەگەڵ ئەو راپۆرتانەی کەلە قسەو لێدوانەکانی ترەوە بەدەستم دەگەیشت یەکی نەدەگرتەوە. چەند هەفتە دواتر لەکاتی چاوپێکەوتنم لەگەڵ نوێنەری نوێی دەزگای سیا لەتاراندا، لەبێ نێوەڕۆك بوونی لێدوانەکانی تووشی سەرسووڕمان هاتم. تۆزێك سەبارەت بە کەش وهەوای کراوەی سیاسی قسەمان کردو پێکەنینێکم بە روخساریەوە بینی. حەزی لە پرسی پێکهێنانی کەش وهەوای سیاسی دەکرد. داوایان لەو کردبوو لەم بارەوە لەگەڵ من قسەبکات، بەڵام نە سەبارەت بە ئاسایشی رۆژهەڵاتی ناڤین!
پاش ئەوەی کە ئاژاوەگێڕان باڵوێزخانەی بریتانیایان ئاگرتێبەردا، یەکێك لە ژەنراڵەکانی من لەگەڵ بەرپرسی بەشی سەربازی باڵوێزخانەکە چاوپێکەوتنی هەبووو ئەویش هاواری کردبوو:" تێنەگەیشتوون کە رێگە چارەی ئەم کێشەیە، سیاسییە!" سەرئەنجام لە کۆتاییەکانی مانگی دیسامبردا سەناتۆر موحەمەدعەلی مەسعوودی بەمنی وت کە بەرێز جۆرج لامبراکیس، بەرپرسی یەکەمی باڵوێزخانەی ئەمریکا بە نهێنی بەئەوی گوتبوو:" بەم زووانە لە ئێراندا رژێمێکی نوێ دێتە سەرکار."
بەهەرحاڵ، ئەو کەسانەی کەبەدرێژایی ساڵانێك هاوپەیمانانی بە ئەمەگی ئێمە بوون ، شتی سەیروسەمەری دیکەیان بۆ من لە هەگبەدا هەبوو.

## ئەرکی سەیروسەمەری ژەنراڵ هایزێر:

لە سەرەتاکانی مانگی جەنیوەری دا، بە سەرسووڕمانەوە ئاگاداربووم کە چەند رۆژێکە ژەنراڵ هایزێر لەتاراندایە. بەڵام رووداوەکانی چەند هەفتەی رابردوو

دەبوو منی تێگەیاندبێت کەلە شتێك سەرم سوور نەمێنێت. بەهەرحاڵ، ژەنراڵ هایزێر کە کەسایەتییکی بچووك نەبوو. لەکاتێکدا کە جێگری فەرماندەی ناتۆ بوو چەند جارێك سەردانی تارانی کردبوو وهەمیشەیش پێشتر داوای چاوپێکەوتنی دەکرد.

ئەم چاوپێکەوتنانە تەنیا بۆ دەربڕینی رێزنەبوو بەڵکو بە سەرنجدان بەوەی کە فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکان بووم‌و ئێرانیش ئەندامی رێکخراوی پەیمانی سەنتۆ بوو ئەم چاو پێکەوتنانە پێویست بوو.

هاتووچۆکانی ژەنراڵ‌هایزێر هەمیشە لەپێشدا بەرنامەرێژی بۆدەکرا. بەڵام ئەم سەردانەی بەتەواوی ناروون بوو. هاتنەکەیان زۆر بەنهێنی هێشت بووەوە. هەڵبەت ئەندامانی سوپای ئەمریکا بە فڕۆکەکانی خۆیان گەشتیان دەکردو زۆر ئاسایی بوو کە بتوانن لەکاتی هاتنیان بۆ پێگە سەربازییەکانیان رێوڕەسمی ئاسایی پێشوازی کردن ئەنجام نەدەن.

لە ژەنراڵەکانم پرس‌وجۆم کرد، شتێك زیاتر لەمنیان نەدەزانی. کەوابوو ئەم ژەنراڵەئەمریکییە بۆچی هاتبوو بۆتاران؟ چۆنیەتی ئامادەبوونی لەوێ بە راستی نائاسایی بوو. کەسێکە خەریکی جێبەجێ کردنی ئەرکێکی گرنگە بەبێ هۆ چاوشارکێ ناکات. هەرکە هەواڵی بوونی لە تاراندا بڵاوبووەوە رۆژنامەکانی سۆڤیەت کاردانەوەی خۆیان بەم شێوەیە نیشان دا:" ژەنراڵ هایزێر لەتاران دایە بۆ ئەوەی کوودەتایەك بەڕێ بخات." ئەم هەواڵەی خۆی لە خۆیدا جۆرێك ئاگادارکردنەوە بوو لەلایەن کرملینەوە.

لە پاریسەوە، رۆژنامەی هێراڵد تریبون بە ئەرکی خۆی زانی کە باڵوێزخانەکان لەتاراندا هێوربکاتەوە. نووسەرانی ئەم رۆژنامەیە تەنیا وشەی " بەڕێ بخات" یان لە هەواڵی رۆژنامەکانی سۆڤیەت دا گۆڕی بۆ " رێ بگرێت". کەواتە رێبەرانی ئەمریکا لە ئەگەری روودانی کوودەتایەك لە ئێراندا نیگەران بوون . ئایا بەراستی وەها مەترسییێك هەبوو؟ من کەوابیر ناکەمەوە. ئەفسەرەکانی من لەبەر ئەوەی سوێندی وەفادارییان خواردبوو، لەگەڵ تاج‌وتەخت‌و یاسای بنەڕەتی دا لێك

گرێدرابوون. تا کاتێکە ڕێز لەیاسای بنەڕەتی دەگیرا، ئەوان لە شوێنی خۆیان نەدەجوولان.
بەڵام دوورنییە کە دەزگا جۆراوجۆرەکانی هەواڵگری ئەمریکا بەڵگەی پێویستیان هەبووە کە لەوانەیە یاسای بنەڕەتی لەمەترسی دابێت و بەمجۆرە دەیان ویست سوپای ئێران بێ لایەن بکەن. ئاشکرایە کە ژەنراڵ هایزێر هەر بەم بۆنەیەوە هاتبوو بۆ تاران و من لەم سەردانەیدا تەنیا جارێك دیتم. هایزێر بە هاوڕێیەتی سالیوان باڵوێزی ئەمریکا هات بۆلام بەڵام هیچکامیان حەزیان نەدەکرد لەسەر هیچ بابەتێکی دیکە قسەبکەن جگە لە ڕۆژ و کاتی ڕۆشتنی من لە ئێران نەبێت.

## سوپای بێ سەر :

ژەنراڵ هایزێر پێشنیازێکی سەیری بە ژەنراڵ قەرەباغی سەرۆکی ناوەندی سەربازی من کرد و داوای لێکرد کە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بازرگان بۆ ڕێکبخات. ژەنراڵ قەرەباغی بۆخۆی ئەم شتەی بەمن گوت.
لەو چاوپێکەوتنەدا چ بڕیارێك درا؟ تەنیا دەزانم کە ژەنراڵ قەرەباغی بە کەڵك وەرگرتن لە هێزوتوانای خۆی ڕێی لە جموجۆڵی ئەفسەرانی ژێردەستی خۆی گرت. تەنیا ئەویش لەم بڕیارانە ئاگادارە، لە بەرئەوە ژەنراڵەکان یەك لەدوای یەك لە سێدارەدران. تەنیا ژەنراڵ قەرەباغی لەم سڕینەوە خوێناوییەدا رزگاری بوو. بەڕێز بازرگان، هەڵبژێراوی ژەنراڵ هایزێر توانی ئەو رزگار بکات.
ژەنراڵ هایزێر تا چەند ڕۆژێك پاش ڕۆشتنی من لەتاران مایەوە. لەو ڕۆژانەدا چی رووی دا؟ تەنیا شتێك کە دەیزانم ئەوەیە کە ژەنراڵ ڕەبیعی فەرماندەی گشتی هێزی ئاسمانی لەکاتی دادگایی کردنی گاڵتەجاڕانەی پێش لە سێدارەدانیدا بە دادوەرە کانی گوتبوو : " ژەنراڵ هایزێر شای وەك مشکێکی مردوو لە وڵات فڕێ دایە دەرەوە."

# فەسڵی ٣٠

# دوورخستنەوە

بڕیاروابوو پاش ئەوەی کە بەرێزبەختیار دەنگی متمانەی لەپەرلمانەکان گرت منو شابانوو کەڵك لەچەند هەفتەیەك پشوو وەربگرین. ڕۆژەکانی کۆتایی بەژان بوونو شەوانی بێ خەویی بە دواوەبوو. هەرچەند وادەی ڕۆشتنمان نزیکتر دەبووەوە بەلاّم ئیشەکان دەبوو بەردەوام بن. چرکەبەچرکە نیگەرانی بارودۆخی ولاّتەکەم بوو.

## دوایین ماڵئاوایی:

ناتوانمو نامەوێت باس لەهەستی ئەوکاتەی خۆم بکەم کە لەڕۆژی ١٦ی جەنیوەری ١٩٧٩دا لەگەڵ شابانوو بەرەو فڕۆکەخانە دەڕۆشتین. هەستم دەکرد ڕووداوێکی شووم خەریکە ڕوودەدات، چوونکە بە ئەزموونتر لەوەی بووم کەسەبارەت بەو شتەی کە پێدەچوو ڕووبدات، بێ خەیاڵ بم. دەمویست خۆم رازی بکەم کە ڕۆشتنم لە ئێران کەفوکوڵەکە دادەمرکێنێتەوەو لە بێزارییەکان کەم دەکاتەوەو دارلەدەستی مرۆڤ کوژەکان دادەخات. هیواداربووم سەرەڕای ئەو هەمووە

وێرانییەی کە بەفەرمانی شێتانی دەروون شێواوەو دروست ببوو، بەخت یارمەتی شاپووری بەختیاربدات و ولات نە ڕووخێت.

بایەکی سارد کەلەم وەرزەی ساڵدا هەیە، لە فڕۆکەخانەی میهرئاباد دا هەڵیکردبوو. چەند ریز لە فڕۆکەکان بە هۆی مانگرتنەوە بێ ئیش وەستابوون. بەرپرسانی ولات بۆ ماڵئاوایی کردن لەمن لە ژێر فڕۆکەیەکی بۆئینگ دا راوەستابوون: شاپووری بەختیار، سەرۆکی پەرلەمانەکان، وەزیرەکان و ژەنراڵەکان. ئامۆژگاریم کردن کە بەوریایی و دووربینیەوە هەنگاو هەڵبگرن. خواشایەتە ئەوەی کەلە توانام داهەبوو بۆ پاراستنی ئەوانەی کە خزمەتیان بەمن کرد ئەنجامم دا.

ئیمام جومعەش کە هەمیشە لەکاتی گەشتەکانم دا بۆ جێبەجێ کردنی رێورەسمی ئایینی ئامادە دەبوو، نەهاتبوو. هەربۆیە خەڵکانێك ئامادە نەبوونی ئەویان خراپ لێکدابووە وە و گومانیان لا دروست ببوو.

ئەم پیاوە هەژارە، بەراستی نەخۆش بوو وچەند هەفتە دواتر لە جنێڤ کۆچی دوایی کرد. بەلام من بۆخۆم قورئانێکم پێبوو کە هیچکاتیش داینانێم و هەمیشە لە گەڵمە.

لە هەستی ئەمەگناسیێك کەئەو رۆژە بەرامبەر بەمن دەربڕا، هەستم بەتەواوەتی جوولا. بێ دەنگییێکی دڵتەزێن باڵی بەسەرماندا کێشابوو کەتەنیا بەدەنگی پڕمەی گریان دەشکا. دوایین کاریگەری ولاتێك لەسەرمن کە سی وحەوت ساڵ بەسەریەوە فەرمانڕەوایم کردبوو و تۆزێ خوێنی منیش لە پێناویدا ڕژابوو، بەگشتی بە هۆی دیتنی ئەو خەم و نیگەرانییە قووڵەوە بوو کەبە سەر ڕوخساری ئەو کەسانەوە دەبینرا کە بۆماڵئاوایی کردن لەمن کۆببوونەوەو فرمێسك لە چاوەکانیاندا قەتیس مابوو.

**مەڕۆ بۆ ئەمریکا:**

یەکەم ویستگەی سەفەری دوورخرانەوەم ئاسوان بوو. تووشی سەرسووڕمان نەهاتم کە سەرۆك ساداتو هاوسەرەکەی لەویٚ پێشوازییان لەمن کرد. لە ڕەوشت بەرزی ئەو ئاگاداربووم. لەو چەند ڕۆژەی کە لەلای ئەوان ماینەوەو تێکەڵ بە ژیانی خێزانی ئەوان بووین، سەرۆك ساداتو هاوسەرەکەی ئەوپەری ڕێزو قەدریان لێمان نا. ئەو ڕێزو یەك دڵییەی کە لەپێشوازی کردن لە ئێمە نیشانیان دا زۆر سوکنایی بەمنو شابانوو بەخشی.

سەرۆك کۆمار داوای لە ئێمە کرد کە لەمیسردا بمێنینەوە، بەڵام پێم وابوو باشترە بۆماوەیەك لە شوێنێکی دوورتر لە نیشتمان بەسەرببەم. لەوکاتەدا دەمویست بڕۆم بۆئەمریکا کە منداڵەکانیشم لەویٚ دەژیان. بەڵام لە هەمولایکەوە نەیان دەهێشت و دەیان گوت:" تا شوێنێکی تر مابێت، مەڕۆ بۆ ئەمریکا." بەهەرحاڵ، بڕیاربوو بڕۆم بۆ مەراکێشو هەر ئەم کارەشم کرد. مەلیك حەسەن وەك برایەك پێشوازی لێم کردو لە یەکێك لە کۆشکەکانی مەراکێش دا میوانداریەتی لەمن کرد.

کاتێك لەسەرەتای مانگی مای دا ویستم بڕۆم بۆ باهاما، بەو فڕۆکەی کە مەلیك تەرخانی کرد بۆمان چووم بۆ ئەوەیٚ. بە ژانترین ڕۆژەکانی تاراوگەنشینیم لە باهامادا تێپەڕاند. هەموو ڕۆژێك هەواڵی لە سێدارەدانی نوێ لە ئێرانەوە دەگەشت. ئەم مۆتەکەیە بڕانەوەی بۆ نەبوو. ئێمە لە ڤیلایەکی کەناری دەریادا دەژیاین کە هەموو کەس دەیتوانی بێت بۆ ئەوەیٚ. هەربۆیە ژمارەیەکی زۆری پۆلیس بۆ پاراستنی ئێمە ڕەوانەی ئەویٚ کرا، لەگەڵ ئەوەی کە نیازپاکییان لێدەبینرا بەڵام سەرەنجی هەموانیان ڕاکێشابوو. لەم سەردەمە تاڵەدا تەنیا مایەی دڵخۆشی ئێمە بینینی گەشتیارەکان بوو کەلە دوورەوە هەستی هاودەردییان لەگەڵ دەکردین.

ئەوان بەزۆری فەرەنسیو ئەڵمانی بوون.

لە ناکاو بڕیاردرا کە مانەوەمان لە باهاما بۆ ماوەیەکی کورت بێت. هاوکات چاوەڕێی ولاتێك بووین کە بۆماوەیەکی درێژتر قەبوولمان بکات. کاتێك دەرکەوت ئەم ولاتە مەکزیکە تووشی سەرسووڕمان نەهاتم. چوارساڵ لەمەوبەر لە گەشتێکی فەرمی دا سەردانی ئەویم کردبوو، ئەو پێشوازییە گەرمو گوڕەی کە لەمنیان کرد کاریگەری لەسەرم دانابوو. لەم سەردانەدا دەرفەتی ئەوەم بە نسیوبوو کە سەرۆك لوپێزپۆرتی یو بناسمو سیفاتی سیاسەتوانانەشی ستایش هەڵگربوو. هەروەها بۆم دەرکەوت کەلە بواری وزەو پەیوەندی لەگەڵ ولاتانی پیشەسازیو لە حالی گەشەکردندا بیروڕای هاوبەشمان هەیە.

## سەردانی نیکسۆن:

بڕوای من سەبارەت بە لێهاتوویی و جوامێری سەرۆك پورتی یو کاتێك بە ڕاست دەرچوو کە دواتر بۆم دەرکەوت چۆن چۆنی لە کۆنفرانسە نێونەتەوەییەکاندا کە بە نوێنەرایەتی لە ولاتەکەی ئامادە دەبوو هەنگاوی بۆ ئەنجام دانی کاروبارەکان هەلدەگرت. هەروەها میواندارى ناوبراو بەرامبەر بەمن لە ولاتەکەیدا لە ساڵی ١٩٧٩دا هەموو ئەوشتانەی سەلماند کەمن سەبارەت بە ڕەوشت بەرزی سەرۆك پورتی یو دەمزانی.

باری تەندروستیم ڕێگای نەدا بەوجۆرەی کە دەمویست ولاتی مەکزیك ببینم. هەڵبەت لە لایەکی دیکە بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیم لە هێنری کیسێنجێرو ڕیچارد نیکسۆن کرد کە بۆ سەردانی من هاتن بۆ کوئێرناواکا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەندێ لە ئەمریکییەکان بەرامبەر بە دۆستەکانیان وەفادار دەمێننەوە. سەرەتا بڕیاربوو سەرۆك نیکسۆنو هاوسەرەکەی پێکەوەبێنو منو شابانوو لەبیری پێشوازیو خزمەتکردنی ئەواندا خۆشحاڵ بووین. بەلام لە دوایین ساتەکاندا خانمی نیکسۆن بە هۆی نەخۆشییەوە نەیتوانی سەفەربکاتو بەرێزنیکسۆن بەتەنیا هات بۆئەوەی.

ئەو چل‌وهەشت کاتژمێر لەگەڵ ئێمە مایەوەو کاتێکی خۆشمان بەڕێ کرد. پێم وایە هەردووکمان بەقەی یەك لەچاوپێکەوتن لەگەڵ یەکتر خۆشحاڵ بووین چوونکە دۆستایەتی ئێمە تەنیا لەسەر بنەمای ئۆگری دوولایەنە نەبوو، بەڵکو لەو ڕاستیەوە سەرچاوەی دەگرت کەلە زۆرێك لە پرسەکاندا، بە تایبەت سەبارەت بە جیوپۆلیتیك بیروڕای هاوبەشمان هەبوو. ئەو پێش لەوەی ببێت بە سەرۆك کۆماری ویلایەتەیەکگرتوەکان لە گەشتێکی جیهانی دا بۆ ناسینی من هات بۆ ئێران. لە سەردەمی سەرۆك کۆماریشی دا سەردانی ئێرانی کرد. هیچ کەس بەقەی ئەو نەیدەزانی کە بوونی هاوپەیمانێکی بەهێز لەوبەشە لەجیهاندا چەندە بۆ ڕۆژئاوا پێویستە.



# فەسڵی ٣١

## ترس

ئەو کەسانەی کەپاش ڕۆشتنی من لە ئێران دەسەڵاتیان لە تاران بەدەستەوەگرتووە بێ توانایی و نابەرپرسایەتی خۆیان سەلماند. شاپووری بەختیار دەیویست حکوومەت بکات بەڵام نەیتوانی. مەهدی بازرگان، نیمچە سەرۆکی ئەنجومەنی خەیاڵی کۆماری " ئیسلامی" دەسەڵاتی بەسەر هیچ شتێکدانییە. لە بەرامبەر یاسادا داماو وبێ توانایە. لەبەر ئەوە یاسایەکی بنەرەتی لە گۆڕێ دانییە، ئەنجومەنێك نییە، سەنایەك نییە. ورەی بەتەواوی رووخاوە. وەك ئاراستە پێوێکی با وایە لەهەر لایەکەوە بای بێت بەرەوئەوێ دەوەستێت. ئەو خۆی بەدرۆ دەخاتەوەو ڕێگا دەدات مەلاکان و " راوێژکارەکانیان" کە وڵاتیان شێواندوە بە درۆی بخەنەوە.
بەرێزبازرگان لە ٢٤ی جەنیوەری ١٩٧٩ دا رایگەیاند:" ئەو کۆماری ئیسلامیەی کە ئێمە دایدەمەرزێنین نەلە لیبیا دەچێت و نەلە عەرەبستانی سعودی بەڵکو وەك ئەو دەسەڵاتەئیسلامیەی وایە کە لە دەساڵی یەکەمی دەسەڵاتی عەلی دا هەبوو." ئەم کۆمارە لە ٢ی ئاپریل دا راگەیەنراو ئێرانی یازدە سەدە گێڕایەوە بۆ دواوە.

**دەمارگیری:**

ئەمەش لە توانجو تەشەرەناخۆشەکانی چارەنووسە کە بەرێزبازرگان پێشتر سەرۆکی ئەنجومەنی بەرگری لە مافی مرۆڤ بووەو لە دەسەلأتی ئەودا ئێران تەنیا سەردەمی خەمو ترسو تۆقاندن بەڕێ دەکات. چ گێلن ئەو پیاوکوژە جەلادانەی کە بە ئەنقەست مێژوو لەبەرچاو ناگرنو بانگی ئەوەدەدەن کە " بەناوی خواوە" دادپەروەری جێبەجێ دەکەن.

یازدەسەدە تێکۆشانو شانازی کە بەدرێژایی ئەوماوەیە ئێرانییەکان بەشێك لە بەنرخ ترین داهێنانەکانیان بەخشی بە مرۆڤایەتی، بە بیانووی لادان لە ئیسلامو، وەك بێ باوڕیو دژایەتی لەگەڵ ئیمانی راستەقینە بەلاوەی دەنێن. پاش لە ئیسلامیش باوڕیان وایە کەجگەلە دەسالّ دەسەلأتداریێتی عەلی،( نزیکەی ٥ سالّ حکوومەتی کرد نە دەسالّ –و.) دەسەلأت بە زۆر دەستی بەسەرداگیراوە. بێ گومان، دەمارگیرو کەللە وشکانێکی قامك ژمێر کە ئەمڕۆ دەسەلأتیان بەدەستەوە گرتووە، باوڕیان وایە کەلە سەردەمی عەلی بەملاوە، ئەوانو تەنیا ئەوانن کەبە رێگای راستیو دادپەروەرییدا هەنگاو هەڵدەگرن. دەمارگیری، دەسەلأتی شێتیو ترسو بێ ئاوزی بەسەر ولأتی ئێمەدا زالّ کردووە.

بەلأم ئەو شتەی کە تێگەیشتنی زۆر گرانە ئەوەیە کەهەمان ئەو دەزگا راگەیاندنانەی کەلە سەردەمی مندا پۆلیسو زیندانیانی ئێگجار زۆرو کوشتنی بێ بنەماو توندوتیژی بەربلأویان لە شەقامو شارەکاندا دەدیت، لەناکاو چاویان نابینێت و یان کوشتنی سەدان کەس دەبینن و گرنگی پێنادەن. لەوەش دێرفام تر، ئەم راستییە کە یەکیەتی مافناسانی نێونەتەوەیی کە ئەو هەمووە ڕاسپاردە چاکانەیان بۆ " مرۆیی کردنی" سییتەمی دادی ئێمە ئاراستەدەکرد، لە جێگیربوونی سیستەمێکی دڕندەی بیروڕا پشکێن شتێکیان نەگوتووە.

رەنگە تێبینی یان کردبێت کەنەمانی تەواو وئاشکرای مافەکانی زیندانیانو تۆمەتباران هاوکات بوو لەگەڵ هاتنە دەرەوەی من لە ولأتو هەموو گومان

لێکراوێك بە زۆر بڕیاری بەسەردا دەسەپێت. ئەو پارێزەرانەی کە قسەیان لەناوی جوانی پێشکەوتن دەکرد باشتربوو لە دژی بە کارهێنانی دووبارەی سزای وەحشیانەی جەستەیی وەك قامچی لێدان کاردانەوەیان هەبێت و ناڕەزایەتی دەرببڕن.

لە دادگاکانی پشکنینی بیروڕادا، تاوان هەمیشە یەك شتە، زیندانیەکان هەمیشە بە " مفسد فی الارچ" دەناسرێن. بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە هەندێ لە هەواڵنووسانی رۆژئاوایی پێیان وایە ئەمە بەومانا نییەکە تۆمەتبار بە خواردنەوەی چەندپەرداخێك خواردنەوە یان دزینی سامانی گشتی گەندەڵی کردووە. " مفسد فی الارچ " زاراوەیەکی قورئانییەو بەواتای کەسێکە کە گەندەڵی و تاوان و خراپەکارییەکانی خواوەندی رەنجاندبێت.

هیچ یاسایەکی سزادان لە دونیادا بەوەها واتایێکی نا روون تاوان پێناسە ناکات. ئاشکرایە کە بەهەزارویەك هۆکار دەکرێ کەسێك لە روانگەی لێکۆڵەرەوە " مفسد فی الارچ" بێت. پاشان تۆمەتبار لە روانگەی خواوە بەکردەوە بە ناپاك رادەگەیەنرێت و پێویستە دەسبەجێ زەوی لە پیس و گلاوی بوونی ئەو پاك بکرێتەوە.

## ئێوە پێویستتان بەسەرە:

دادگایی کردنەکانی " ئیسلامی" لە ڕووی گوێ نەدانیان بە سەرەتایی ترین شێوەی بەرگری کردن، جێی تێبینین. بەڕای دادوەرە " ئاینیەکان، تاوانبارکراوەکان هەرلەبەر ئەوەی کەلە ژیانی سیاسی و جڤاکی و ئابووری ئێرانی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئێمەدا بەشدارییان هەبوو، تاوانبارانێکی حاشاهەڵنەگرن. بەڵام " خراپە کارانێك " کە لە بەرامبەر تاوانبارکردنیاندا ناڕەزایەتیان نیشان داو ئاماژەیان کرد کە مەلاکانیش لەو سەردەمەدا باش ژیان، تەنیا بارودۆخی خۆیان خراپترکرد. کەواتە نیشاندانی بەڵگە یان بەرگری کردن بێ سوودە.

لەسەرەتای فیبریوەری ١٩٧٩دا، بازرگان بەڵێنیدا کە تاوانبارانی سیاسی لە دادگاگەلێکی شایستەو بەوێژدانــدا بــە ئاشــکرا دادگــایی دەکــرێن، هــەروەها رایگەیاند کە بە توندی لە دژی دادگایی کردنی بە پەلەیە. چەند رۆژ دواتر ژەنراڵ نیعمەت الله نەسیری کە سەرۆکی پۆلیسی پاراستن بوو لە لایەن سوپاوە لە بەندیخانەیەکدا کەلەوێ چاوەڕوانی دادگایی کردن بوو برایەدەرەوە. ئەویان ئەشکەنجەکردو لێیان داو لە کاتێکدا کەلە ئێوارەی ١١ی فیبریوەری دا لە تەلەفزیونەوە دەرکەوت روخساری هەلأساو وپێچرابوو، بە زەحمەت دەیتوانی قسەبکات.

بەم حاڵەش نەسیری لە بارودۆخێکدا کە بکوژانی چواردەوریان گرتبوو رایگەیاند کە هەرگیز فەرمانی کوشتنی کەسێکی نەداوەو هەرگیز بۆ ئەشکەنجەی زیندانیان فەرمانی لە کەسێك وەر نەگرتبووە.

لە شەوی ١٥ لە سەر ١٦ی فیبریوەری دا ئەویان لەگەڵ سێ ژەنراڵی دیکە کە ئەمەگناسی خۆیان بۆ ئێران و پاشاکەیان دەربڕی بوو گوللەباران کرد. ئەم سێ ژەنراڵە بریتی بوون لە : رەحیمی، فەرماندەری سەربازیی پێشووی تاران، خوسرەوی داد فەرماندەی هێزی هەوایی و ناجی فەرماندەری سەربازیی ئیسفەهان.

لە ٢٨ی فیبریوەری دا، بازرگان هێشتا هەڕەشەی دەکرد کە ئەگەر دەسەلأتی بێ سنووری کومیتەکان دیاری و بەرتەسك نەکرێتەوە، ئەوا دەست لەکاردەکێشێتەوە. لە ٨ی مارس دا لەم بارەوە " دڵنیایی تەواو" یان بەناوبراودا. بەلأم لە راستیدا، دەست بەسەرکرانەکان، کە سەرئەنجامیان گوللەباران و لە سێدارەدانی خێراو بێ دواکەوتن بوو چەندقات بووەوە. بە زۆری هەموو ئەو ژەنراڵانەی کە پلەی بالأیان لە سوپاداهەبوو گوللەباران کران و تاوانەکانیان ئەوەبوو کە گوناحی دڵسۆزی و خزمەت کردن بەمنیان ئەنجام دابوو. سەناتۆرێك کەزیاتر لە سەدساڵ تەمەنی بوو لەبەر وەفاداری بە پاشاکەی و زۆرێك لە تاوانبارکراوانی دیکە کە تەمەنیان لە سەروی حەفتاساڵەوە بوو بەکۆمەڵ ئێعدام کران. لەبەر ئەوەی کە هەمووکەس

تاوانبـــاربوو قوربانیـــەکانیان هەڵدەبـــژارد. ژمارەیـــان ئەوەنـــدە زۆربـــوو کـــە نەدەژمێردران.
لەناو ئەو ئێعدام کراوانەی کە ناوەکانیان بڵاوکرایەوە ئەمانە دەبینران: وەزیران، وەزیرانـــی دەرەوە، دیپلۆماتـــەکان، سیاســـەتوانان، پارێزگاران،شـــارەوانەکان، ئەنـــدامانی ئەنجومـــەنی شـــارەکان، ژەنـــراڵو ئەفـــسەرانێکی زۆر لـــەهێزە جۆراوجۆرەکان، پلەدارو سەربازانی ئاسایی‌وپۆلیس، رۆژنامەنووسان، بەرپرسانی دەزگاکانی چاپ‌و پەخشی پەرتووك، بێژەرانی رادیۆ، دادوەرو پارێزەران، زانایانی ئایینی، پزیشکان، مامۆستایانی زانکۆ، وەرزش وانان‌و بازرگانان. هەمووی ئەوانە بڕیاریان بەسەردا سەپا و بە پەلە " بەناوی خواوە" ئێعدام کران.
بە خۆشییەوە هـەزاران هـاوڵاتی لـە کاتێکدا کە هێشتا شاپووری بەختیار هـەوڵی دەدا دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرێت ئاموژگارییەکانی ئـەویان بیست‌و وەك خۆی خۆیان شاردەوە. هەڵبەت دواتر بە بێ ئامادەبوونی بەختیارسزای مـەرگی بەسەردا سەپا. رۆژنامە بەناوبانگەکانی رۆژئاوا نامەیەکی کراوەیـان لـە کوڕەکـەی بەختیارەوە بۆ خومەینی بڵاوکردەوە کەبەمجۆرە کوتایی دەهات:
"... بەرێزخومـەینی ئێـوە پێویـستان بەسـەرەو لـە کاتێکـدا ئـەم نامەیـە دەنووسـم چەندسـەری تـر بـە ویـستی ئێـوە لـەخاك گـەوزاوە بـێ ئـەوەی کـە کەسـێك لـە گوناحـەکانیان ئاگاداربێـت.... بـێ گومـان ئێـوە دەتـوانن دەسـت‌و پێوەنـدەکانی خۆتان بنێرن پەلاماری خانووخنجیلانەکەی باوکم بدەن بۆ ئەوەی تالانی بکەن، خاپووری بکەن‌و وەبەر گوللەی بدەن.... ئایا شاپووری بەختیار تاوانبارە؟ ئەی ئێوەچی کەبە بەشداریتان هـەزاران گـەنجی دەمارگیرتـان بـە رووخۆشییەوە بەرەو مەرگ پاڵ پێوەنا؟ هیواتان ئەوە نەبێت کەمێـژوو ستایش تان بکات. ئێوە ناهێڵن ئێـران ببێـت بـە وڵاتێکـی دیموکراسـی. ئێـوە بەرپرسـی شـەهیدانێکی زۆرن‌و هەرگیزنابن بە قارەمانێکی مێژوو."

ئـەم نامەیـە پـێش لـەوێ کـەهێزەکانی بـەناو" شۆڕشـی ئیـسلامی" بـە تـەواوی سـازوئامادە بکـرێن لــە ژمــارەی ٨ی مارسـی ١٩٧٩ی ڕۆژنامــەی لۆمۆنــد دا بڵاوکرایەوە.

زۆرێك لە " کەسانی گومان لێکراو"، بەتایبەت لە شارەکاندا، توانییان لـە دەسـتی ئەندامـەکانی کومیتـەکان و ئەوتاقمـە دەسنیشان کراوانـەی کـە لەلایـەن " دادگـا ئیسلامیەکانەوە" ڕەوانە دەکران هەڵێن‌و بەمجۆرە لـە دادگایی کردن‌و ئێعدامی بە پەلەو سەرئەنجام تالآن کردن خۆیان ڕزگاربکەن. کاتێکە لە مانگەکانی جەنیوەری‌و فیبریـوەری دا سـەربازگەکان لەلایـەن جـەماوەرەوە داگیرکـراو عـەمبارەکانی چەك‌وچـۆڵ بـەتالآن چـوو، ژمـارەی ئـەم دەسـتەو تاقمانـە چـەند هێنـدە زیـادی کرد.ئەوەندەی من ئاگادارم ئەمانە هەرگیز چەکیان لەشان دانەناوە. ناسراوترین‌و بەهێزترینی ئەم تاقمانە بریتیە لـە :" کومیتـەکانی شـۆڕش" کـە خاوەنی نزیکـەی دەهەزارپاسـدارن کەکـەس سـەریان لێـدەرناکات. هـەروەها " سـوپای پاسـدارانی شـۆڕش" کـە ڕێکخراوێکی شێوە سەربازییەو ئیبراهیمی یەزدی ڕێکی خستووە. ئـەو هـەمان راوێـژکاری ناسراوی نووفێل لووشـاتۆ یـەو کەسێکی نائاسـاییە کەبە پاسـپۆرتی ئەمریکییـەوە گەشـت دەکـات‌و جێگـری ئەنجومـەنی شۆڕشـەو بـووە بەوەزیری کاروباری دەرەوە.

بەدرێـژایی مـانگی مارسی سـامناك ژمارەیـەکی زۆری بـێ تـاوان " دادگـایی" و ئێعـدام کـران. ئـەم قوربانیـە بـێ دەرەتـان‌و ئەشـکەنجەکراوانە نـەیان زانـی چ تاوانێکیـان لەسـەرەو ئەگـەریش دەیـان زانـی، دەرفـەتی بـەرگری کـردن لـە خۆیـان پێنـەدەدرا. پارێزەرێکیـان نـەبوو بـەرگرییان لێبکـات‌و دادگـایی کردنـەکانیان بـە نهێنی‌و بە هۆی دادوەرانێکی نەناسراوە بەڕێوە دەچووە.

هەروەها ئەو شایەتانەش کەدەیان توانی سکالاّ بکەن تیرۆر دەکران. لە ١١ی مانگی مـارس دا، ئـەمیر ئینتـزام، وتەبێـژی کابینـەی بازرگـان بـە ڕۆژنامـەکانی گـوت:" دەوڵـەت بەگـشتی‌و وەزیـری داد بەتایبـەتی، ناتوانێـت هـیچ چاودێرییێکی بەسـەر بڕیارو شێوازی بەڕێوەچوونی دادگاکانی شۆڕشی ئیسلامی وە هەبێت."

جارێکی تر بازرگان هەڕەشەی دەست لە کارکێشانەوەی کرد. بەڵام هەرمایەوە.

## کوشتنی ئەمیرعەباسی هۆیدا:

لە ١٧ی مارس دا، بازرگان داوای ڕاگرتنی دادگایی کردنی ئەمیرعەباسی هۆیدای کرد. هۆیدا، پیاوێکی شیاو کەسیازدەساڵ سەرۆك وەزیرانی من بوو تەنیا تاوانێکی هەبوو: ئازایەتی لە ڕادەبەدەری ڕێگای لە دوارۆژبینی ئەوگرتبوو. کەلەم بارەوە پێویستە نەختێ ڕوونکردنەوەم هەبێت.

لە پاییزی ساڵی ١٩٧٨دا درۆ وفێڵی جۆراوجۆریان بۆ سووککردنی دەسەڵاتی پاشایەتی بەڕێ خست. ئەمیرعەباسی هۆیدایان کردە ئامانج. هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان بەهۆی ئەوەوەیان کرد بە بیانوویەك بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ڕژێم. دەستە سازکردنێکی زیرەکانە لە دژی ئەو ڕێکخرابوو و پێم وابوو کە هۆیدا – کەمن ئەوم بە کەسایەتییێکی بەوەفاو دڵساف دەناسی– ئەو مەترسیانەی ناناسێت کە هەڕەشەیان لەودەکرد.پێویست بوو بە لەبەرچاوگرتنی هەموو زەمانەتە یاساییەکان‌و بەپێی یاسای بنەرەتی دادگایێك بەڕێوەبچێت بۆ ئەوەی هۆیداو هەموو ئەو کەسانەی کەماوەیەکی دوورو درێژ لە دەوڵەتی ئەودا خزمەتیان کردبوو بێ هیچ دوودڵی‌و گومانیك بێ تاوانییان بسەلمێنرێت. ئەو ئیشێکی نەکردبوو کەلە دادگایی کردنێکی دادپەروەرانە بترسێت.

هۆیدا لە ٨ی نۆڤامبری ١٩٧٨دا دەسبەسەرکرا چەند حەوتوو دواتر بەهۆی یاخی بووانەوە لە زیندان ئازادکرا. لەجیاتی ئەوەی خۆی حەشاربدات ڕۆشت بۆماڵی یەکێك لە دۆستانی‌و تەلەفونی بۆ کومیتە کردو ناونیشانی خۆی دا. ئەویان لە ژوورێك دا زیندانی کردو بەڵێنیدا نامەی بەرگری کردن لە خۆی ئامادەبکات. هەربۆیە داوای مانگێك دەرفەتی کرد بۆ ئەوەی تەواوی بکات.

بەڵام لێکۆڵەرەکان قەبووڵیان نەکرد. کەسانی نابەرپرسی نەخۆش‌و نەزان، بێ شەرمانە لەگەڵ ئەو هەڵس‌و کەوتیان کردو بەرەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە ١٥ی مارس ئەویان بە کێشەکێشە بەرەو " دادگای شۆڕش" ێکی بێبایەخ هێناو سزای

مەرگیان بەسەردا بڕی بیٚ ئەوەی دەرفەتێكی پێبدەن لە بەرامبەر تۆمەتە ترسناك‌و گەمژانانەكانیاندا بەرگری لە خۆبكات.

كاتێك ئەویان بە " شەڕ لە دژی خوا " تاوانباركرد. بەسەر دادوەرانی نەناسراودا هاواری كرد كە :" نەتەنیا هەرگیز شەڕم لەدژی خوانەكردوە ( وە چۆن دەمتوانی وەها ئیشێك بكەم؟) بەڵكو لەبەر ئەوەی مرۆڤێكی ئیماندارم سەردانی مەككەیشم كردوە. ئەگەر بڕیارتان داوە سزام بدەن، قسەیەكم نییە، هەرچی تان لەدەست دێت بیكەن. بەڵام هەموومان لە پەنای یاسایەكداو لە سیستەمێكی حكوومەتیدا ژیاوین....هەموو یاساكانی ئێمە لەلایەن پەرلمانەوە پەسەندكراوە."

دەربارەی هۆكارەكانی بازرگان لە پەیوەندی لەگەڵ داواكردن بۆ راگرتنی ئەم دادگایی كردنە پرسیاركراوە. بەڕای من تا ئەوكاتە بیٚ هیچ بەڵگەوبیانوویەك خەڵكیان دەكوشت. بەڵام راوێژكارانی ئایەتوڵلا سەرئەنجام بۆیان دەركەوت كە باشترە رواڵەتێكی یاسایی بە ئێعدامەكان بدەن‌و هەربۆیە بە پەلە یاسایەكی سزادانی ئیسلامییان ئامادەكرد. ئەم یاسایە كە پێكەنیناوی‌و كۆنەپەرستانە بوو نكۆڵی لە دادپەروەری دەكرد، رۆژی ٥ی ئاپریلی ١٩٧٩ راگەیەنرا. بەرەبەیانی ٧ی ئاپریل ئەمیرعەباسی هۆیدایان وەبەر گوللەدا، بەڵام وادیاربوو، پێشتر لەئاكامی ئەو هەڵس‌وكەوتە خراپەی كەلە گەلی كرابوو ڕەنگی مردنی لیٚ نیشتبوو.

كاتیٚ لەكوشتنی ئەو ئاگاداربووم رۆژێكی تەواو دەرگەم لەسەرخۆم داخست‌و دۆعام كرد. هۆیدا شایەتێك بوو كە دەیتوانی ئەوانەی كە ئەویان تاوانباركردبوو تاوانباربكات‌و مردنیشی نموونەیەكی سادەبوو لە مرۆڤ كوژی. لە بەر ئەوەی نەدەكرا كوشتنی ئەو بشاردرێتەوە، هەربۆیە هاواری ترسی راستەقینە‌و بێزاری لە رۆژنامەكانی دونیای ئازادەوە بەرز بووەوە. دەوڵەتەكانی ئەمریكا، بریتانیا، ئەڵمان، ئیتالیا، فەرەنسا‌و ئەوانی تر بەفەرمی " زوێری‌و سەرسامی‌و نیگەرانی قووڵی" خۆیان دەربڕی. لە رێكخراوی نەتەوەكان بەرێز كورت والدهایم تەنیا ئاماژەی " بە تەنگەوە نەهاتنی بەرپرسانی نوێی ئێران بەرامبەر بە داوای لێبوردەیی‌و دادپەروەری" كرد. (٩ی ئاپریل)

لەم بارودۆخەدا بکوژەکان سەرقاڵی ئیشی خۆیان بوون.
لە کاتژمێر ٢ی پاش نیوەشەوی ١١ی ئاپریل دا " دادگایەك" پاش لێکۆڵینەوەیەکی کورت سزای مەرگی بەسەر یازدەکەس لە بەرپرسانی پێشوودا سەپاند. نیو کاتژمێر دواتر هەموویان کوژران. یەکەم کەسی ئەم قوربانیانە ژەنراڵ حەسەنی پاکرەوان بوو. تەنیا تاوانی ئەوەبوو کە پازدەساڵ پێش سەرۆکایەتی ساواکی لە ئەستۆبوو. ئەو بەنموونەی مرۆڤێکی زۆر شایستە ناسراوبوو. بە زۆری بە بۆنەی لێبوردن لەو ناڕازییانەی کە دادگاکان بڕیاری لە سەردەدان ڕووی لەمن دەنا، بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ زۆرێك لەمەلاکاندا.
چوار ژەنراڵی دیکەش لەگەڵ ئەو کوژران: ناسری موقەدەم کەوەك ئەڵقەی پەیوەندی نێوان منو بەرێز کەریم سەنجابی ئیشی دەکرد، حوجەتی کاشانی بەرپرسی پێشووی وەرزش، عەلی نشات فەرماندەی پێشووی گاردی پاشایەتی، تەقی مەجیدی کەلانی کەم پازدەساڵ پێش خانەنشین کرابوو. وەزیرانی پێشوو مەنسوور ڕۆحانیو عەباس عەلی خەلعەتبەریش وەك عەبدوڵلاریازی سەرۆکی پەرلەمانو سەناتۆری سەدساڵە عەلامە وەحیدیو عەلی بەیات نوێنەری پەرلمانو غولام ڕەزا نیك پەی شارەوانی تاران لەناو کوژراوەکاندا بوون.
لە ئاکامی ئەم تیرۆرانەدا بوو کەکومیسیۆنی نێونەتەوەیی مافناسان کەلە جنێڤ دا کۆببوونەوە ڕایانگەیاند:" دادگا ئیسلامیەکان" کە بە بڕیارەکانی خۆیان سزای مەرگ بەسەر خەڵك لە ئێراندا دەسەپێنن " بە ئەنقەست" ئەو پەیماننامە نێونەتەوەی یانەی کە پەیوەندییان بە مافە سیاسیو مەدەنیەکانەوە هەیەو ئێرانیش واژۆی کردوە، پێشێل دەکەن.
ئایەتوڵلا وەڵامێکی کورتی بەم ناڕەزایەتیانە دایەوە. لە ٤ی مای لە قومدا ڕایگەیاند: " شۆڕش دەبێت دەستی خراپەکاران ببڕێت... پێویستە خوێن بڕێژرێت. هەرچی ئێران زیاتر خوێن بدات شۆڕش سەرکەوتووتر دەبێت."

## سەرکوتی خوێناوی:

" پاسدارانی شۆڕش" لە ٨ی مای دا، پاش دادگایی کردنێکی بە پەلە بیستو یەك کەسیان کوشت. جەوادی سەعید، دوایین سەرۆکی پەرلەمانو سەرۆکی حیزبی رستاخیز، موحەممەد ڕەزاعاملی تارانی، وەزیری پێشووی زانیاریو پاشان وەزیری پەروەردەو فێرکردن، غولام رەزا کیانپوور وەزیری پێشووی زانیاریو داد، ژەنڕاڵ عەلی فەتحی ئەمین فەرماندەی تیپی زرێی هەمەدان، شادمانی ئێسفەندیان دادوەری لێکۆڵەرو چەندسەربازو بەرپرسی پۆلیس لەناوکوژراوەکاندابوون.

لەماوەی مانگەکانی فیبریوەری تا جوون، ئەم سەرکوتە خوێناویە شتێکی کەم وێنە نەبوو. لەم ماوەدا زیاتر لە بیست ژەنڕاڵو ئەفسەری پلەبەرزو سەرهەنگو ئەفسەری هەوایی و دەریایی کوژران. ژەنڕاڵ بەدرەئیی ئەمەگناسو جێی متمانەو دڵاوا، فەرماندەی پێشووی گاردی پاشایەتیو فەرماندەی سوپا بەهۆی بەرکەوتنی گوللە لەپشتەوە لە گەڵ ژەنڕاڵ بیگلەری دا کوژرا.

لە ٢٦ی فیبریوەری دا کومیتەکانی بەرپرس لە کاروباری سەربازی شۆڕش خوازیاری سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی تەواوی سوپابوون کە، بۆ گۆڕینی بە " سوپایەکی خەڵکی" دەبوو لە سەرکردەکانی، کە رابردوویان بە تەواوەتی ئاشکرابوو پاك بکرێتەوە.

لە ١٠ی مای دا، ژەنڕاڵ فەزلۆڵلانازمی، کە فەرماندەی تیپێك بوو لەگاردی جاویدان، کوژرا. تاپێش لەنیوەی مانگی جوون، ژمارەیەك لە ژەنڕاڵو سەرهەنگو فەرماندەو بەرپرسانی پۆلیس بە بەردەوامی کوژران. لە ١٣ی مای دا دادگای کردنێکی بە کۆمەڵ لە کرماندا بەڕێوەچوو، کەلەودا ئەفسەرانو ژنانو قەرەچەکان بێ بەڵگەوبیانوو سزادران. ١١٤ کەس بە " مفسد" ناسرا. ٢٥٠ ژەنڕاڵو ئەفسەر بە پۆستو پلەی جیاوازەوە رەوانەی زیندان کران یان دەرکرانو دوورخرانەوە.

بەمجۆرە سوپا هەموو سەرکردەکانی لەدەست دا.

لــە ســەرەتاکانی مــانگی ســپتەمبردا ڕۆژنامــەکانی دونیــا نــاوی ٥٧٥ کەســیان بڵاوکردەوە کەلە ١٦ فیبریوەرییەوە لەئاکامی بڕیاری بەناو " دادگاکانی ئیسلامی" دا بەفەرمی ئێعدام کرابوون. ئەم ڕۆژنامانە ئامارەیان بەخاڵێکی ورد نەکرد. کە خاڵێکی گرنگ بوو. هیچ ڕێبەر یان تێکۆشەرێکی کۆمۆنیست بە شێوەیەکی جیدی تووشــی کێشەنەهات، تابگــات بــەوەی کــە ئێعــدام کرابێــت. تــەنیا ئیمانــدارانی دروســتکاریان بــە " نــاوی خــواوە" دەکوشــت. ژمــارەی ئــەو کەســانەی کەلــەتاران و شــارەکاندا، بــەهۆی تاقمەچــەکدارەکان و ســەربازانی نیمــچە فەرمییــەوە کــوژران لەژمارە نایەت.

لەسەرەتای ساڵدا، کۆمەڵەخەڵکانێکی بێ سەرەوبەرە سەربازگەکانیان داگیرکردو دەســتیان بەســەر چەك وچــۆڵەکاندا گــرت و جێبــەجێکردنی دادپــەروەرییان لــە ئەستۆگرت. ئەم تاقمانە لە ژێر ئاڵای " شۆڕشی ئیسلامیدا" دەستیان دایە تاڵان و کوشتن. لــەماوەی مــانگی فیبریــوەری دا، لــە سەرانســەری وڵاتــدا، ئــەو کەســانەی کــەخۆیان بــە دادگاســەربازییەکان یــان تەنانــەت دادگــا ئیــسلامییەکان بەناســاندبوو بەدەســتی تاقمــە چــەکدارەکان کــوژران. هــیچ کــەس لــە ژمــارەی ئــەو کوژراوانــە ئاگادارنییە.

## ٢٠٠٠٠ زیندانی کە خاچی سوور دەستی پێراناگات:

لــە کۆتــایی مــانگی مارســی ١٩٧٩دا، " پاســدارانی شــۆڕش" ئــەمیر حوســەین عــەتاپوور، ژەنڕاڵــی ٧٨ ســاڵەیان زینــدانی کــرد کەلــە ســاڵی ١٩٥٢ەوە خانەنــشین ببوو. کــوڕی ئــەم ژەنڕاڵــە کەلەنووســەرانی ناســراوی ڕۆژنامــەی تــاران جۆرنــاڵ بــوو، تــووڕەیی ســەرتاپێی داگــرت و وتــارێکی ئازایانــەی بڵاوکــردەوە ولــەودا ئاشــکرای کردکە ..لانی کەم ٢٠٠٠٠ زیندانی سیاسی لە زیندانەکاندا خەریکە لەناودەچن."

بۆچــی هەمووکــەس ســەبارەت بــەئازارو مەینــەتی ئــەم گومــان لێکــراوە بــێ تاوانانــە بێدەنگ بــوون؟ لــە ســەردەمی دەســەڵاتی مــن دا هــیچکات ژمــارەی زینــدانیانی بــەناو

سیاسی لە ٣١٦٤ کەس تێنەپەری کە زۆربەشیان تیرۆریست بوون. قسەی تێدانییە کەلەمانگی فیبریوەریەوە دەیان هەزار ژن و پیاو دەسبەسەرکراون و لە بارودۆخێکی بەزۆری نامرۆڤانەدا زیندانین. هەندێ جار دارکاری کراوان و ئەشکەنجەیش دراون. ژمارەی ئەوکەسانەی کەلە زیندانەکاندا گیانیان لەدەست داوە نادیارە.
ئەمە ڕاستییێکە کەلە سەردەمی دەسەڵاتداری مندا، نوێنەرانی خاچی سوور دەیان توانی سەربەستانە سەردانی هەموو زیندانەکانی وڵات بکەن. دەرگای هەموو زیندانەکانمان بە ڕووی پشکێنەرانی فەرمی دا کراوەبوو. هەموو پارێزەرێکی داکۆکی کار لە وردەکارییەکانی ئەو تۆمەتانەی کە دەدرایە پاڵ ئەوکەسەی داکۆکی لێدەکرد ئاگاداربوو ،دەرفەتی هەبوو تا بەرگری نامەکەی ڕێکبخات و بەڵگەو شایەتی پێویستیش ئامادەبکات. سەرئەنجام ئەویکە، هەموو سزادراوێك مافی ئەوەی هەبوو داوای پێداچوونەوە بە بڕیارەکانی دادگادا بکات و لەو کاتەش دا بە زۆری لە مافی خۆم بۆ لێبوردن کەڵکم وەردەگرت. ئێستا ئیتر وانییە. دادگاکانی بەناو " ئیسلامی" سووکایەتین بە ڕێبازە پیرۆزەکانی قورئان.
بۆچی کاتێك لەمارسی ١٩٧٩دا زیندانەوانی گەورە ڕێگای لە سەردانی خاچی سوور گرت و یارمەتیەکانی قەبووڵ نەکرد، ڕاگەیێنەگشتییەکان ناڕەزایەتیان دەرنەبڕی؟ چ شتێکی ترسناك لەوێ رووی دەدا کە دەبوو بە نهێنی بمێنێتەوە؟
لە ١٤ی مارسی ١٩٧٩دا بەڕێز لاهیجی ئەندامی یەکیەتی مافناسانی ئێران داوای لە وەزیری نوێی دادکرد تا ڕێگا بە گومان لێکراوانی بەندکراو بدرێت کە ١) بزانن بە چ تاوانێك بەندکراون ٢) لە یارمەتی پارێزەری داکۆکی کار سوودمەند بن ٣) دەرفەتی ئامادەکردنی بەرگری نامەیان پێ بدرێت ٤) بە ئاشکرا دادگایی بکرێن ٥) سزادراوان مافی ئەوەیان هەبێت داوای پێداچوونەوە بە بڕیارەکان دا بکەن. لەگەڵ هەموو ئەم داواکاریانە دژایەتی کرا. بەڵام بەهەرحاڵ ڕێگایان بە بەڕێز لاهیجی دا کە سەردانی خۆی لە زیندانی قەسری تارانەوە، کە بارودۆخی زۆرخراپ بوو، دەست پێبکات.

کاتێك لە سەرەتای ئاپریل دا، ئاغا! " کۆماری ئیسلامی " ڕاگەیاند ئامارەشیان بە چارەنووسی ژنان و پیاوانێکی زۆری ئێرانی کرد کەلە بەندیخانەکاندا ڕاگیرابوون.

**قسەکانی ئەو دەگێڕمەوە:**

".... هەموو ئەو کەسانە لە سەرەتادا لە جیاتی ئەوەی کەلە زیندانەکاندا قەرەباڵغی دروست بکەن دەبێت لەناو ببرایەن. پرسی " تاوانبارکردن" لە گۆڕێ دا نییە. ئەمانە تاوانکارن. تەنیا تاوانکارانی بەدناو کوژراون و ئێستا ئێمە سەبارەت بەم کەسانە بە پێی بەڵگەنامەکان خەریکین داوەری دەکەین. لە کاتێکدا؛ کە نەدەبوو دادگایی بکرێن، بەڵکو دەبوو بکوژرێن! جێگای داخەکە دەبینین هێشتا ئەوەندە ڕۆژئاواچیەتی لەناو ئێمەدا باوە..."

مرۆڤ کاتێك دەبیسێت کە بەرێز ئاندرۆیانگ، داکۆکی کاری ماف مرۆڤ، بێژەری ئەم قسانەو ئاخاوتنی لەمجۆرە لە "خواناسان" دەزانێت، سەری سووڕ دەمێنێت.

## هەڵەی گەورە بەناوی ئیسلامەوە:

چەند ڕۆژدواتر، لە ١٣ی مای دا، ئاژانسی فرانس پرێس ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە:

" تاران. ئایەتوڵلا خومەینی لە پەیامێکدا بۆ سەرۆك ژیسکاردێستن لە " دۆستانی فەرەنسی" لە بەر ئەو پێشوازییەی کە لەویان کرد سوپاسی کرد، بەڵام بەداخ بوونی خۆی دەربڕی لەوەی کە بۆ بەرگری کردن لە دزو تاوانکاران باسی ماف مرۆڤی بۆ دەکەن."

سەرئەنجام، لە ئێراندا تەنانەت ئەو کۆمەڵە هاووڵاتیانەی کەلە تیرۆر ڕزگاریان ببوو کاردانەوەیان نیشاندا. لە سەروی ئەو نەڕانەی کە تینوبوون بەخوێن و تاوانکارییان دەویست، نەفرەت و لەعنەتی دەنارد، دەنگی ئەقڵ و ژیریش بیسترا.

لە ٢٨ی مای دا، هەواڵدەرییەکانی ڕۆژئاوا ئەم هەواڵەیان لەتارانەوە بڵاوکردەوە کەلە کونگرەی پارێزەراندا بەرێز حەسەن نەزیە، یەکێك لە لیبراڵەکان و سەرۆکی

پێشووی ناوەندی پاریزەران رایگەیاندبوو:" هەلەگەلێ زۆر گەورە بەناوی ئیسلامەوە ئەنجام دەدەن. زۆرئاشکرایە کە ڕێگەچارەی گیروگرفتەکانی سیاسیو ئابووریو ماف بەتەنیا لە چوارچێوەی ئیسلام دا پەیدا نابێت. تەنانەت لایەنی ئایینیش بە تەواوەتی بۆی دەرکەوتووە کەلە بارودۆخی ئێستادا نابێت تەنیا پەنابردن بۆ ئیسلام راسپێردرێت، چونکە نەدەکرێو نەبە سوودە."

لە پاش ئەم قسانە، لەناو چەپڵەلێدانی ئەندامانی کۆنگرەدا، بەرێزحەسەن نەزیە گوتی"... خەڵك دەبیینن هەرکەس بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستێت، بەرنامەی ئابووری دەدات بۆ وڵاتو بەرنامەرێژی دەکات. هەمووی ئەمانە خەڵك بەرەو نیگەرانیو دڵەڕاوکێو بێ هیوایی پاڵ پێوەدەنێت.." پاشان دەگاتە ئەو ئەنجامەی:" تەنیا لێبوردنێکی گشتی دەتوانێت دەرفەت بە خاوەن پیشەو بازرگانان بدات کە چالاکییەکانیان دەست پێبکەنەوەو بەمجۆرە بەرەنگاری لەگەڵ بێکاری فەراهەم بکات."

بێکاران ؟ هیچ کەس نەیتوانیوە و ئێستاش ناتوانێت ژمارەیان دەست نیشان بکات. سێ ملیۆنو نیو؟ چوارملیۆن؟ کێ دەزانێت؟ لە سەردەمی دەسەلاّتداری من دا نەتەنیا بێکاری نەبوو، بەڵکو، دیسان دووپاتی دەکەمەوە، ئێران زیاتر لە یەك ملیۆن بیانی دامەزراندبوو.

بە دڵنیاییەوە بێ هیوایی ئاکامی دووشتە: سەرەتا ترسو پاشان گەوجی. هەرچۆن بێت نەلەبەر ڕەزامەندی پەروەردگارەوەو نەلە بەر بەرژەوەندی مەلاکان، کە ئێران وا وێرانو پارچەپارچە کراوە کە هیچ کەس ناتوانێت دووبارە کۆی بکاتەوە. لە سەردەمی ئێمەدا ئەمە جاری سێیەمە کەبۆ لەناوبردنی ئەم وڵاتە وەك وڵاتێکی سەربەخۆ هەنگاو هەڵگیراوە. لە ١٩٠٧دا رووسەکانو بریتانییەکان وڵاتیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد. لە ١٩٤٥دا، هەنگاوی دووەم بە قازانجی سۆڤیەتو بریتانیای گەورە بۆ لەناوبردنی ئەم وڵاتە لە ڕێگای دەستو پەیوەندی ناوخۆییو ناسراوی ئەوانەوە هەڵگیرا. ئەمرۆ هەوڵی سێیەم بەناوی ئایینەوە بەردەوامە.

وڵات گرفتاری داگیرکەرێکی نەریتیی ڕاستەقینەیە. بەڵام دەبێت ترس لەوەش هەبێت کە نئۆکلۆنیالیزمی گوێ لەمستە کانی هەندێ لە وڵاتانی زلهێزی دەوڵەمەند، ڕێگا بۆ داگیرکەرێکی سووری خوێن مژ ئاوەڵا بکات. هەنووکە کەنداوی فارس بۆ شتێکی وەها ئامادەیە.



# فەسڵی ٣٢

# نەشیاوی، فریو و ئیفلاس

لە مێژووی هاوچەرخی ئێمەدا ساڵەگرنگەکان بەمجۆرەیە: ١٩٠٧، ١٩٤٥، ١٩٧٨.
بۆ پاراستنی راستگۆیی لەم پەرتووکەدا، دەبێت بڵێم کە بێ گومان گەورەترین هەڵەی من ئەوە بوو کە هەوڵم دا بە زۆر میللەتێکی دێرین بەرەوسەربەخۆیی و بێوەیی و فەرهەنگ و خۆش بژێوی و ئاسایش ببەمەپێش. کۆی هەمووی ئەمانە ئەو شتەیە کەمن بە شارستانیەتی مەزن ناوی دەبەم.
دەمویست تا ئەوکاتەی کەنەوت هەیە ئێران ئاوەدان بکەمەوە بۆئەوەی ژیانی وڵاتم پاش لە کۆتایی هاتنی سەرچاوەکانی نەوت زەمانەت کردبێت. رێگەچارەی پرسەکە لەمەدابوو. دەبوو بە خێرایی هەنگاو بنێین، کاتی زیادەمان نەبوو. سەرئەنجام هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە بێگومان گرووپە خاوەن دەسەڵاتەکان لە پیشەسازی نەوت دا چالاکانە بۆ رووخاندنی من یەکیان گرت.
ئەم گرووپانە نەیان دەتوانی قەبووڵی بکەن کە سیاسەتی دیاری کردنی دادپەروەرانەی نرخی نەوت بە هۆی منەوە بچەسپێت. هەروەها بە پێچەوانەی ئەوشتەی کە چاوەروانیان لێدەکرا ئامادەنەبوون بۆ دابەشکردنی سروەت لە نێوان وڵاتانی پیشەسازی و لەحاڵی گەشەکردندا ئیشێك ئەنجام بدەن. پیاوانی نەوت دوژمنی رێکەوتنی نێوان باشوورو باکوورن. هەر لە بەر ئەم هۆکارە بوو کە ئەوان

ئێرانیان وەك قوربانییێك بۆ پاك كردنەوەی گوناحەكانی خۆیان هەڵبژارد نەك لیبیا یان وڵاتێكی دیكی خاوەن نەوت.
لەساڵی ١٩٧٦دا دووكەس لە پیاوانی نەوتیی ئەمریكا رایانگەیاند:" شا دووساڵی تری ماوە." ئەوان پێش بینی یان نەدەكرد كە هەر بەم لێدانو تێسرەواندنە، كاریگەری لە سەرئابووری هەموو وڵاتانی بێ نەوت دادەنێن.

## ئەو ئیشانەی كە دەمانویست بیكەین:

ئەمڕۆ لە بەرنامەپێشكەوتنخوازانەكانی ئێمە چی ماوەتەوە؟
ئایا پێویستە دیسان دووپاتی بكەمەوە كەلە شەش ویزگەی ناووكی كە بەدامەزراندنیان پێدەچوو ئێران ببێت بە دەسەڵاتێكی گەورەی پیشەسازی، دوو یەكەیان بەفەرەنسا سپێردرابوو؟ ئەم دوو ویزگەیە كە توانای هەركامیان ٩٠٠ مێگاوات بوو، پێویستی بە سەرمایەیەكی پازدە ملیارفرانكی بوو. دەمان ویست ناوەندێكی لێكۆڵینەوەی ناووكی لە ئیسفەهاندا دروست بكەین. دروستكردنی هێڵی ئاسنی ژێرزەوی لە تاران (دە ملیارفرانك). جووت هێڵ كردنو كارەبایی كردنی هێڵی شەمەندەفەری تاران – بەندەری شاپوور (١٠ تا ١٥ ملیارفرانك)و هەروەها دروستكردنی جادەیەكی شەش سایدی لە تەنیشت ئەم هێڵەوە. دەبوو كۆمپانیای پژۆ بە بەشداری كۆمپانیای ئێران ناسیوناڵ لە ساڵی ١٩٨٣ دا سەدهەزار ئۆتومبیل لە ئێران دروست بكات. وەك دەسپێكێك پێشنیاری كڕینی شەش فڕۆكەی یەك ملیارفرانكی مان ئاراستەی ئێرباس كرد. بڕیاربوو تامسۆن ئامێری بڵاوكەرەوەی شەپۆلی كورتمان بۆ دروستبكات. سەرئەنجام كۆمپانیا جۆراوجۆرە فەرەنسیەكان بۆ كاروباری بیناسازی لە تارانو شیرازدا بە كرێگیرابوون.
بیستوومە نیوەی ئەو ١٨٠ كۆمپانیا فەرەنسیەی كەلە ساڵی ١٩٧٨دا لەئێران ئیشیان دەكرد تا مانگی مارسی ١٩٧٩ ئێرانیان بە جێی هێشتووە. هەموو ئەو

کۆمپانیا دەرەکیانەش کەمانەوە لە بارودۆخێکی زۆر دژواردا کاریان کرد، لە بەر ئەوە کۆمیتەکانی شۆڕش کۆمەلێك داواکارییان هەبوو کە قەبوڵکردنیان مەیسەر نەبوو. جیالەمەش، بەرپرسانی نوێی ئێرانی بە هەموویان راگەیاندوە کەلە بری هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتنەکان هیچ قەرەبوویەك بە کۆمپانیا دەرەکییەکان نادەن، چونکە شۆڕش و گۆڕانی رژیم حاڵەتی بارێکی نائاسایی هەیە.
رق لە بیگانەو بێ سەرەو بەرەیی سیاسی و مەزهەبی زاڵ بەسەر ئێراندا وەك یەك زیانی گەیاندووە بە دامەزراوە ئەمریکی و ئەڵمانی و ئیتالیایی و ژاپۆنییەکان و ئەو دامەزراوانەی دیکە کە ئیتر راسپاردەی گرنگیان بۆ کەل و پەل و دروستکردن پێناگات. دووپێن نمووری( ئەمریکی)و میتسۆبیشی( ژاپۆنی) پارەیەکی ئێگجار زۆریان لە ئێراندا وەگەڕخستبوو. بەلأم گەورەترین دۆڕاو ئەمریکایە. ئێمەلە گەل ئەوان رێکەوتنێکی پێنج ساڵەمان واژۆکردبوو کە دەبوو هەمووساڵێك بایی دەملیار دۆلار کالأ و شتومەك بدەن بەئێمە. هەمووی ئەمانە هەڵوەشاوەتەوە.
نیوزویك ئاشکرای کردووە کە قوتب زادە راوێژکاری پلەبەرزو دۆستی جێی متمانەی ئایەتوڵلا " لە پیاوانی ناسراوی سۆڤیەت"ە. ئەو دانیشتووی سووریایەو بۆ ماوەیەکیش لە پاریس دا" ئەڵقەی پەیوەندی حیزبی توودە بووە لە گەل حیزبەکانی ترو رێکخراوەکانی ئەنتەرناسیونالی سێی یەم دا."

## قەیرانی ئابووری و وەستانی بازرگانی:

ئاکامی ئەو شێواوی و بێ سەرەوبەرەییەی کەلە ئابووری دا هەیە تەنانەت زۆر زیاتر لە مانەش بۆ ئێرانییەکان جێگای داخە. قازانجی هەوڵ و تێکۆشانی ئەو هەمووساڵە بە فیڕۆچوو. بەرهەم هێنانی نەوتی ئێمەدابەزیوەو لە تاران دا رایانگەیاندووە کە بەرهەمهێنان هەرگیز ناگاتەوە ئاستی پێشوو. لەبەر ئەوەی کە بەڕێوەبردنی کارو بارەکانی نەوت لە ئەستۆی کەسانێکی نەشیاو – و رەنگە کرێکارانی ئاسایی– دایە، دەڵێن لە هەندێ لە بیرەکاندا ئاوەکانی ژێرزەوی لە گەل نەوتدا تێکەڵ بووە. کەواتە هەندێ لە چاڵەنەوتەکان کەوتووەتە ژێرئاو.

کۆمۆنیستەکان و هاودەستەکانیان، بەرەبەرە دەست بەسەر رێکخراوەکانی کرێکاری و جووتیاری دا دەگرن. بەڵام ئەوە کرێکارانی ئاسایین کە لابردن و دانانی بەڕێوەبەران و ئەندازیاران و سەرپەرشتیاران و هتد جێبەجێ دەکەن. ئەنجومەنەکرێکارییەکان دەربارەی رادەی بەرهەم هێنان بڕیاردەدەن و بۆ خۆیان زیادە مووچەی سەرسووڕهێنەر لەبەرچاو دەگرن.

لەبەر ئەوەی دەرکردنی کرێکاران لە کارگەکان قەدەغەکراوە و ناکرێ هیچ جۆرە سزادانێکیش هەبێت، تەنیا رێگەچارە بۆ کۆتایی هێنان بە پەك خستنی کارەکان (سابوتاژ) داخستنی کارگە یان " نیشتمانی کردن" یەتی. هەرواکە لە هەندێ حاڵەت دا، ئەو خاوەن کارگانەی کە هیچ بە دەستیانەوە نامێنێت داوای نیشتمانی کردنی دەکەن.

بەڕێوبردنی کارگەکان بە شێوەی شوورایی، بەردەوام لە زیادبووندایە کەئەمەش بۆ خۆی بریتییە لە ناچارکردنی میللەت بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم کەم و کورتیانەی کە بەهۆی نەشیاوی و گەندەڵی و دەزگای نوێی کارگێڕی روو لە زیادبوونەوە پێك دێت. لەماوەی هاویندا، ژێرخانی پیشەسازی وڵات لە ئاکامی هەمووی ئەمانەدا بە کردەوە لێکهەڵوەشا: بەتایبەت پیشەسازی پۆڵا و مس و ئەلەمینیۆم، کانەکان، لەنگەرگەکان و کارگەکانی دروستکردنی ئۆتومبیل و تەراکتۆر. ئەم کارو پیشانە پێش لەوەی کە بۆ هەمیشە لەناوبچن، زەرەرێکی زۆر لە سەردەستی ئەو کەسانە دادەنێن کەباج دەدەن.

لەبەر نەبوونی داواکاری و ماددەی خاو، زۆربەی کارگەکان بەلەسەدا ٢٥ تا ٣٠ی توانایی خۆیانەوە ئیش دەکەن و بەرەو داخران دەڕۆن. بە دڵنیاییەوە کرێکارانیش ئەو سوودانەی کە بەهۆی شۆڕشی سپییەوە بەریان کەوتبوو لە دەستیانداوە. جیالەمەش، شتێك بۆ هاوبەشی کردن نەماوەتەوە. بەمجۆرە شۆڕشی "ئیسلامی" درۆیین زوڵمێکی زۆری لە چینی زەحمەتکێش کردووە و شتێکە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەوان و هەموو ئەو ماف و سوودانەی کەبەدەستیان هێنابوو.

من بەزۆرترین ژمارەی ئەو هاووڵاتیانەی کە دەیان توانی دەرفەتم دابوو کە بۆرزگاری خۆیان لە هەل‌ومەرجی تاقەت پڕووکێنی کار راپەڕن. بەداخەوە ئەمڕۆ دەبینم کە کرێکاران‌و جووتیاران‌و فەرمانبەران تووشی گرفتارییەکانی رابردوو هاتوون‌و هەژاری‌و بێکاری لە ڕادەبەدەر پەرەی سەندووە.

دابەزینی خێرای نرخی دراو هەڵاوسانی هەوساربچراو، رێگای لە دانانی بەرنامەی گونجاو بۆ بەرهەمهێنان گرتووە، جێگیرکردنی نرخی تەواوبووی ئەو کاڵاو شت‌ومەکانەی کە بەرهەم دێت مەیسەر نییە. راوەستانی کاروباری بیناسازی‌و کارگێڕی لە زستانی رابردوو بەم لاوە بە کردەوە گشت گیر بووە. ئەو شتەی کە جێنشینی " دەوڵەتە" لە هەموو بەڵێنەگەورەکانی خۆی پاشگەز بووەتەوە و کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان لەگەڵ رژیمێکدا کە راسپاردەو داواکاریەکانی پێشووی بێ دانی زیانانەو بژاردن هەڵوەشاندوەتەوە ناتوانن هیچ کارێك بکەن.

## گەندەڵی ئەمڕۆییانە:

سەبارەت بەگەندەڵی کە ئیدعایەکی باو بوو لە سەردەمی دەسەڵاتداری مندا هەمووشتێك وتراوە. پێموایە سەبارەت بەم بابەتە قسەم کردوەو خۆم لەو تۆمەتانە کەبەهۆی رۆژنامەکانەوە درایە پاڵ ڕژێمەکەم پاك کردبێتەوە.

کەواتە بۆچی ئەو رۆژنامانەی کەکاتێك من لەتاراندا بووم، ئەوەندە سەبارەت بەلە بەرچاوگرتنی بنەماکانی ئەخلاق‌و ڕەوشت هات‌و هاواریان دەکرد، بەڵام سەبارەت بە گەندەڵییێك کە هەنووکە وەك نەخۆشی چاووەقوڵە سەرانسەری ئێرانی گرتووەتەوە شتێك ناڵێن؟ بەو جۆرەی کەدیومانە، دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەو دەستدرێژییە بەردەوامەی کە دەکرێتە سەرمافەکانی مرۆڤ هیچێك ناڵێن. بەم حاڵەش، هەموو رشۆژێك هەواڵی ترسناك بە ئێمە دەگات. وڵات نقومی گەندەڵییێکی بێ دەرمان‌و بێوێنە دەبێت.

دیسان هیوایەکی تر بەرگی بێ هیوایی پۆشیوە. پاش سی‌وحەوت ساڵ دەسەڵاتداری، پێم وابوو ئێرانم لەو جۆرە بەڵاو ڕۆژە ڕەشیانە ڕزگارکردەوەو

سیستەمێکی رۆژئاواییم بونیاد ناوە، کەبە بەرەکەتی دادویاسا، گەندەڵی بەرتەسك کردوەتەوە. بەڵام نا، وانەبوو.

هەموو ئەو ئێرانیانەی کە، ئەگەر بیانەوێت گەشتی دەرەوەی وڵات بکەن، پێویستە پارەیەکی زۆر بدەن بە یەکەم مەلای سەر ڕێگایان‌و ئەو پارەش بریتی هیچ ناکەوێت‌و نادیارە. هەروەها، ژمارەی ئەو کەسانەی کە بۆ پاراستنی خۆیان پێویستە یەك لەسەر پێنجی تەواوی سامانی خۆیان بدەن لە رادەبەدەرە. وەچی بڵێم لەو فڕۆکانەی کە پڕ لە ئاسەواری هونەری دەنێردرێن بۆ ئەورووپا هەتا بە فروشتنیان بەرپرسانی پلەبەرزو دەوروبەرەکانیان دەوڵەمەند ببنەوە. ئایا وەها کردەوەیەك کە بە فەرمی پشتیوانیشی لێدەکرێت، گەندەڵی نییە؟ ئەم جۆرەکردارانە جیا لەوەی کە زیانی مەعنەوی بۆ خەڵك هەیە، دەبێتە هۆی لە ناوچوونی وڵات، لەبەر ئەوە سەرمایە لەناو دەبات‌و پشت بە ئیشیش نابەستێت. هێنانە بەرچاوی بارودۆخێك کە ئێران بە مزووانە لە گەلی بەرەوروو دەبێتەوە، بە ئازارە. هەم ئاسەوارە هونەرییەکانی بە تاڵان چووە هەم سەرچاوەکانی چەپاوکراوە و، هەم ئیتر متمانەی پێناکرێت.

### شێوە راپرسی:

لە ئێراندا نە دەوڵەتێك هەیەو نە تەنانەت پەرلەمانێك. سزای مەرگیان بەسەر دووسیاسەتواندا سەپاند تەنیا لەبەر ئەوەی کە بەرپرسایەتی سەرۆکایەتی پەرلەمانیان لە ئەستۆ دابوو. دەسەڵاتی یاسادانان نییە. دەسەڵاتی دادیش کە دەبوو چاودێری بە سەر جێبەجێ بوونی دادپەروەرانەی یاساکانەوە بکات لە گۆڕێدا نییە. بەڵام دەسەڵاتی جێبەجێ کردن کەلە دەستی کەسێك کۆبووەتەوە بووە بە جەللادێك. لە ٣٠و ٣١ی مارس دا "شێوە راپرسی" یێك بۆ پەسەندکردنی " کۆماری ئیسلامی" بەرێوەچوو. شانۆیەکی گاڵتەجاڕانە بوو. پازدەساڵەکانیش دەیانتوانی دەنگ بدەن.

کاغەزێکی سەوز دەنگی ئەرێی بە کۆماری ئیسلامی دیاری دەکردو کاغەزێکی سووریش دەنگی نای نیشان دەدا. لە بەر ئەوەی کە دەنگ دان بە شێوەیەکی ئاشکرابووو لە ژێرچاودێری پاسدارانی شۆڕش دا بەرێوەدەچوو، بە ئاسانی دەکرا رابگەیەنرێت کە ٩٨٪ دەنگدەران دەنگی ئەرێنی یان داوە. لە کاتێکدا لە تورکەمەنستان تێکهەڵچوون رووی دابوو لە ئازەربایجان لە باکووری خۆرئاوا، لە بەلووچستان لە باشووری خۆرهەلاّت، لە خووزستانو کوردستان ئاژاوەو خوێن رێژی لە گۆڕێ دابوو.

رۆژنامەکانو رادێوو تەلەفیزیون رایانگەیاند کە نزیکەی ٢٣ملیۆن ئێرانی دەنگیان بە کۆماری ئیسلامی داوە. لە کاتێکدا کەنیوەی دانیشتوان واتە هەژدەملیۆن کەس تەمەنیان لە ژێر پازدەساڵ دایە، خۆ ئەگەر وایدابنێن کە هەموو هەژدەملیۆنەکەی دیکەش کە ماوەتەوە دەنگیان دابێت، خۆ هێشتا پێنج ملیۆنی زیادە.

شتێکی تری لەو جۆرە، چوارمانگ دواتراکێشانی خەڵك بۆ سەرسندوقەکانی دەنگدان بۆ بەشداری کردن لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی بناخەدانانی گچکەدا کە پێکهاتبوو لە ٧٣ ئەندام، لاسایی کردنەوەیەکی پووچو بێ مانا بوو لە هەڵبژاردنی یەکەم. ئەم ئەنجومەنی بناخەدانانە دەبوو " دەستوورێکی نوێ ئامادەو پەسەند بکات." ئەمجارە، هەموو ئەو حیزبە رێكوپێكو رێکخراوانەی کەخۆیان بە " دیمۆکراتێك" دەزانی، بەشدارییان لە هەڵبژاردن دا نەکردو لە ئاوزانایانی ئایینیش دا کەسانێکی پلە بەرز هەمان رێگەیان گرتەبەر. لە راستیدا هەموودەسەلاّتێك لە دەست رێکخراوێکی شەش کەسی دابوو بە ناوی " ئەنجومەنی شۆڕش". یەکێك لەوان، ئایەتوڵلا موتەهەری لە مانگی ئاپریل دا تیرۆرکراو، ژەنراڵ قەرەنی یش، کە یەکێك بوو لە فەرماندەسەربازییەکان بە فەرمانی خومەینی تووشی ئەم چارەنووسە هات. تۆڵەکردنەوەی رێکخراوی نهێنی " مونافقین" هۆکاری ئەم دووکوشتنەبوو.

## شەڕی ئایەتوڵلاکان:

لە سەرەتای ١٩٧٩وە، زۆرجار وتراوە کە مەزهەبی شیعە، وەك کۆماری کاتیی ١٧٩٢ی فەرەنسا " یەك پارچەیەو دابەش ناکرێت"، هیچ شتێك ئەوەندە لەڕاستییەوە دوورنییە. ئەوانە کە دەسەڵاتیان بە دەستەوەگرتووە، لە هەڵبژاردەکانی توێژی ڕۆحانیەت نین. کۆلکەو بیرتەسکن و لە ڕێبازی پێغەمبەر زۆر دوورن. لە ڕاستیە گرنگەکانی سیاسیی و ئابووریو جڤاکی ڕۆژ ئاگادار نینو، سەرەڕای ئەمەش ئیدعای یاسا دانانیش دەکەن.

ئێمە لەگەڵ شتێکی زۆر نائاسایی دا بەرەو رووین کەلە مێژووی نوێدا نموونەکەی تەنیا لە – ڤنیز– دا بینراوە. تێکڕای میللەتێك بە هۆی ئەنجومەنێکی نهێنی یەوە بەڕێوەدەچێت. ئەندامانی نەناسراوو نهێنی ئەنجومەن دەستیان بەسەر هەموو دەسەڵاتێکدا گرتووە. هەرواکە دیتمان، مافی مانو ژیانی هەموو هاووڵاتیانیان لەدەست دایە بێ ئەوەی کە ئەوان بتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن یان مافی ئەوەیان هەبێت داوای پێداچوونەوە بکەن. ئەمە دەسەڵاتێکە لە تاریکیدا کەلە گەل پێشکەوتن دژایەتی دەکاتو لە قومەوە خۆراکی پێدەگات.

لەمانگی فیبریوەری ١٩٧٩وە، تەنانەت مەزهەبییەکانیش تیرۆرو ئێعدام کراون. تا ئێستا، ئەو ترسو تۆقاندنەی کەبە هۆی تاقمەچەکدارەکانەوە پەیدابووە ڕێگای نەداوە کە ئایەتوڵلاکان بە ئاشکرا ئیدانەی ئەو کۆمەڵ کوژیانەی بکەن کەبە فەرمانی دادگا بەناو ئیسلامییەکان بەڕێوەدەچێت. لە گەرماو گەرمی شۆڕش دا، ژمارەیەکی زۆرخەڵك بەهۆی ترساندنو تۆقاندنەوە، کەوتنە شوێن هەندێ لە ریبەران. بەڵام تەنیا لە ئێستادایە کە خەڵك لە ئێراندا بەرەبەرە چاوی دەکرێتەوەو بە بینینی ئەو راستیە ترسناکانە، نێوەرۆکی راستەقینەی ئەمجۆرە " پێغەمبەرانە" یان بۆ دەردەکەوێت.

کاتێك دەسەڵات پەرستییەکانی ئایەتوڵلا توانی لە پێکهاتەی کاتی حیزبێکی مەزهەبیی دا کە ڕێگای بە ناوبراو دا هەتا بە سەر کۆمارێکی بیروڕا پشکێن دا

سەرۆکایەتی بکات، دەرکەوت و خۆی نیشان دا، گورج کاردانەوەکان خۆیان نیشان دا.

لەلایەن بەشێکی زۆر لە باڵی راست و ناوەندەوە هێرش کرایە سەر ئایەتوڵلاخومەینی. لە باڵی چەپیش دا ئایەتوڵلایەک لەتاران دا بەناوی تاڵەقانی – کەئێستا مردووە– هێرشی کردەسەری. تاڵەقانی لە ٣ی جوون دا بەرەیەکی دیموکراتیکی میللی دامەزراند( هدایەت مەتین دەفتەری دایمەزراند نە تاڵەقانی و لەمانگی فیبریوەریش دابوو –و.) و راگەیەنراوێکی بڵاوکردەوە کەلەودا تۆمەت گەلێکی دایە پاڵ ئایەتوڵلا خومەینی و ئەوی لەبەر دەسەلاّت پەرستی رەهای سیاسی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی پووچەڵ و بێ توانا لۆمەکرد. لە راگەیەنراوەکەدا هاتبوو:" ئەگەر روحانیەت حکوومەت بکات، راگەیەنراو و بڕیارەکانی پێویستە وەك پەیام لە لایەن خواوە قبووڵ بکرێت. کەوابوو سیستەمی حکوومەتێکی ئایینی کە ئێوە دەتانەوێت جێگیری بکەن، هەر چەشنە یاسایەکی بنەرەتی بێ سوود دەکات.

سەرئەنجام، رێبەری ئایینی تاران باسی لەو دەستەو تاقمانە کرد کە خۆیان بەناوی ئایینەکەیانەوە ئامادەکردبوو" رۆژنامەگەلێك بەتاوانبار دادەنێن و لە هەوڵدان پێش بە بڵاوبوونەوەیان بگرن". باسی لە " پیاوانی خاوەن قەڵەم" کردکە" کتێبخانەکان ئاگردەدەن...". ئایەتوڵلا زەنجانیش کەلە دۆستانی تاڵەقانی و راوێژکاری بەرەی دیموکراتیکی میللی بوو دژی ئایەتوڵلا خومەینی یە.

لە مانگی جوولای دا، ئایەتوڵلاخومەینی گومانێکی لانەمابوو کە لە شەڕی نێوان ئایەتوڵلاکان دا سەردەکەوێت. لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا، یەکێك لە دۆستانی، ئایەتوڵلا مەهدەوی کەنی، پاکسازی کۆمیتە ئیسلامییەکانی لە ئەستۆگرتبوو بۆ ئەوەی بیانکات بە هێزێکی چەکداری بەتوانا. پاشان ئایەتوڵلا توانی لە بەرامبەر دەسەلاّتی ئەوانەی کە رۆحانی نەبوون بوەستێت و لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی بناخەدانان دا دژایەتی بکات. هەروەها، لە ١٨ی جوون دا بە شێوازی تایبەت بە خۆی رایگەیاند:" دەخوازم بەبیری خەڵکی ئێرانی بێنمەوە کە ئەنجومەنی

بناخـەدانان لـەو شـتانەیە کـە شـەیتان ئەیخاتـە دڵـەوە. کرێکـارانو جووتیـاران ئاگاداری شەیتان بن!"

بەم حاڵەش، ئەو ناچاربوو خۆی بدات بە دەستەوەو لە مانگی ئاگۆست دا پاش بڵاوبوونەوەی ئاکامی بەشداری نەکردنی هەڵبژاردن لەلایەن حیزبە دیمۆکراتیکە کانـەوە، ئـیتر شـاردنەوەی دەنگـی نـەرێنی لـە "هەڵبـژاردنی" ئەنجومـەنی بناخەدانانی ٧٣ کەسی دا کە ئەندامەکانی بە وردبینیەوە لە قوم دا هەڵبژێرابوون مەیسەر نەبوو. فریوکاری بەڵگە نەویستو ئاشکرا بوو. چەند مانگ دەسەڵاتی رژیمێکـی نـەگونجاو وناپەسـەند بـەس بـوو بـۆ ئـەوەی نەشیاوی دوژمنـەکانم بسەلمێنێت.

## زانایی و کارامەیی:

بەڵام، ئەگەر خەڵکی ئێران وەها رێگەیەکی ترسناکیان گرتەبەر، تەنیا لەبەر ئەوە نییە کە فریویان خواردووە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەمنیش هەڵخەڵەتام.

من پێم وابووئەو هەوڵە زۆرانەی کەلە ١٩٦٣ بە دوادامان، لەگەڵ هەموو دەسکەوتە کۆمەڵایەتیەکانمان خۆیان دەناسێنن. بەڵام بەهەڵەدا چووبووم. مەبەست ئەوە نییە کە شەوقو توانایی کارکردنی توێژە جۆراوجۆرەکانی خـەڵکم ئەوەنـدە لـە سـەر راگرتبێت، بـەڵکو لەهـەر کـوێ کارامـەیی هەیـە پێویستە زانیاریش هـەبێتو ئەمـە خاڵێکـە کەلـە بەرچـاوم نـەگرتبوو. گەیانـدنی پەیامـەکان بـە هـۆی لاوانـی سـێ سوپاکەوە بێ گومان بەسوود بوو بەڵام لە لایەکی دیکەوە راگەیاندنی فریوکارانەو بـەردەوام، کاریگـەری ئـەوی لـەناودەبرد. راگەیانـدن لەلایـەن کەسـانێکەوە کـە شتێکیان نـەبوو لـە دەسـتی بـدەنو دەیـان ویـست زۆرشـت بەدەسـت بێـنن، هـەر ئەوانـەی کـە بۆمـاوەی نیوسـەدە دەسـتیان بـە پـارەو دەسـەڵاتی سیاسـی رانەدەگەشت.

زانکۆکان، قوتابخانەکان، یاریگاکان، نەخۆشخانەکان، دامەزراوەکان، بەرنامەکانی دروستکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون لەشارو گوندەکان، ناوەندە فەرهەنگییەکان، ئەو دامەزراوانەی کە خولی راهێنانی بۆ پیشەکان دەکردەوە، هاوکاری نێوان کرێکارو تەکنیك کارو خاوەن کار، ئازادی ژنان، هەموویان بەشێوەیەکی تر نیشان دەدران.

لەبەر ئەو رێزەی کەبۆ ئایینەکەمان هەمە نەمتوانی بەرامبەر بە هەندێ لە بوختانکەران توند بجووڵێمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، باوڕم نەدەکرد کە خەڵك باوڕ بەو هەمووە درۆ دەلەسانە بکەن.

بەڵام سەبارەت بە تەلەفیزیون، واتا بەهێزترین ئامێری راگەیاندن، زۆر درەنگ زانیم کەلە لایەن کۆمۆنیستەکانەوە کاری تێکراوە. لە جەنیوەری ١٩٧٩دا تەنیا سەدکەس لە هەزارکەس لە بەڕێوەبەران و تەکنیك کاران لەسەر ئیشەکانی خۆیان مابوونەوە. بەڵام کۆمۆنیستەکانی پێشوو کە دڵسۆزانە پەیوەست ببوون بە شۆڕشی شاو خەڵکەوە و لە تەلەفیزیون دا ئیشیان دەکرد، تا کۆتایی ئەمەگناس مانەوە. هەرلەبەر ئەم هۆکارە بوو " سوورەکان"و " رەشەکان" پێداگرییان دەکرد کە دەبێت کە ئەوانیش گوللەباران بکرێن.

ئەم کارەساتە وەك پێویست کاریگەری خراپیش لەسەر لایەنی مەعنەوی دادەنێت.

ئاکامە خوێناوییەکانی ئەم دۆڕانە بۆ هەموو موسڵمانان و بەتایبەت شیعەکان مەینەتی بەدواوە دەبێت. وڵات و کۆمەڵگەیەك کە بە وریاییەوە پارێزەری ئاشتی بوون، تێکدان و رووخاندنی بەپێی بەرنامەو بەناوی خواوە، پێدەچێت لەم بەشە لە جیهاندا ئاکامێکی لێ بکەوێتەوە کە بۆ ئیماندارانی شوێن کەوتووی قورئان و تەنانەت بۆ ئەوانەش کەلە دڵەوە بڕوایەکی لاوازتریان هەیە کارەسات هێنەر بێت.

لێرەدا جاریکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە کە خۆپەرەستی کوشندەو فیتنەنانەوەکانی قوم، لەگەڵ رەفتاری دیکتاتۆرانەی مشتێك مەلا، راستەوخۆ لەگەڵ بنەما سەرەکییە کانی ئیسلام دا لەناکۆکی دایە.

لەکاتێکدا کە ئایەتوڵلا، یاخی بووانی بە " بڕیارەکانی دادگای خوا" دەترساند، لە ٥ی فیبریوەری ١٩٧٩دا، بازرگان رایگەیاند:" حکوومەتە ئیسلامیەکەی ئێمە یەکێك لە باشترین حکوومەتەکانی دونیا دەبێت."

ئەمڕۆ فریو و هەموو ئاکامە ترسناکەکانی لە هەمووشوێنێکدا دەبینرێت. ئەمانە چۆن دەوێرن لە جیهادو " ئایدۆلۆژی دروستی ئیسلامی" قسەبکەن لەکاتێکدا مەبەستیان شۆڕشێکە کە بەزاڵ بوونی ئایدۆلۆژییکی تێکەڵ بەبێ بڕوایی بەخوا بەسەرخەڵکدا سەپاوە.

ئەمڕۆ لەکاتێکدا کە بارودۆخی ئێران دەبینمو بیر لە داهاتووی دەکەمەوە قرچە لەجەرگمەوە دێت. بڕوام بەلە سەرهەق بوونی خۆم هەیە، بەڵام بەباشتری دەزانم کە خەڵکەکەمان شادمانو رازی بنو من لە هەڵەدا بم. سەرانسەری وڵاتم بەهۆی تاقمێك شێتەوە خوێناوی بووە ، داتەپیوەو تووشی تاڵانو تێکچوون هاتووە. بەڵام ئەگەرچی برینەکە قووڵە، بێ چارەسەرو دەرمان نییە. پێویستە خەلکی ئێران لە ناوخۆیاندا بەدوای رێگای رزگاری دا بگەرێن.

# ئەنجام

لە١٣ی جوولای رابردوودا، لە کۆبوونەوەیەکی رۆژنامەوانی دا کەلە کوئێرناواکا (مەکزیك) وەرێم خست بەو ئەنجامە گەیشتم کە :" لە ئێران دا نە دەوڵەتێك هەیەو نە حکوومەتێك. ولاتەکەم لە بەرەبەری لێك هەڵوەشاندن دایە."

ئێران لە چنگی دژی شۆڕشیکدایە کە ئامانجی لەناوبردنی هەموو دەسکەوتەکانی شۆڕشی سپییە. بەو پەڕی ترس و نیگەرانییەوە لە رۆشتنی میللەتەکەم بەرەو هەڵدێر دەڕوانم. بێ گومان لە کۆتایی ئەم رێگەیەدا جۆرە بەرهەمێکی لاوەکی کۆمۆنیزم، زۆرخراپتر لەوەی کە ئێستا هەیە، زۆر دڕندە خوو و گێل و خوێن مژتر چاوەڕێ دەکات.

## حکوومەتی بیروڕا پشکێن:

حکوومەتی بیروڕا پشکێن هیچکات پەسەندو رەزاسووك نەبووە. بەم حاڵەش لە جەنیوەری ١٩٧٩وە ولاتی ئێمە لە ژێر نیری دەسەلاتێکی بیروڕاپشکێن دایە. پێنج سەدە پاش لە سەردەمی پشکنینی بیروڕا لە ئیسپانیا، ئێران لە ژێردەسەلاتی تیرۆری "تورکمادا" (فەرمانڕەوای ئیسپانیا لە سەدەکانی ناوەڕاست دا –و.) یەکی نوێ دا دەژی کە زۆر لە باپیرانی خۆی دڵڕەقترو مەترسی دارترە. لە راستی دا دادگاکانی پشکنینی بیروڕا تا کافربوونی کەسەکەیان بۆ دەرنەکەوتبا سزایان نەدەدا. بەم کافرانە دەرفەتی تۆبەو پەژیوانی دەدراو ئەوان دەیان توانی لە

شایەتی دانی شایەتەکان کەڵك وەرگرن، بەڵام تورکمادای ئێران وەها دەرفەتێك نادات.

دەڵێن ئەم دادگایانە ئیسلامین، بەڵام ناکرێ ڕاستی لەبەرچاو نەگیرێت، یاسای ڕاستەقینەی ئیسلامی، جەخت لەسەر مافی تۆمەت بار دەکات بۆ بەرگری کردن لە خۆی. ئیسلام هەرگیز کەڵکی لە نەفرەتو تۆڵەکردنەوەو کۆمەڵکوژی وەرنەگرتووە بەڵکو پشتی بە دادپەروەریو چاکەو لێبوردەییو ڕەوشت بەرزی بەستووە. ئەم نەفرەت بڵاوکردنەوە، گریمان" بەناوی خوا " یشەوە بێت، سووکایەتییەکە بە خواو ئایینە کەمان. دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم سووکایەتیە، بەداخەوە هەڕەشەی زیانێکی گەورە لە ئیسلام دەکات، ڕاست وەك ئەو زەرەرەو زیانەگەورەی کە پشکنینی بیروڕا هێنای بەسەر مەزهەبی کاتۆلیك دا.

هەمیشە باوڕم وابووە کە ئیمانی ڕاستەقینە دەبێتە هۆی پاراستنی ڕێزو پەیرەوی کردن لە نێوەڕۆکی ئایین، نەسەپاندنی بڕیاری تاقمێك. بە داخستنی قوتابخانە تێکەڵاوەکانو ناچارکردنی ژنان بە پۆشینی چارشێوو بەشدارکردنی ژنێکی تر لە ژیانی خێزانیان داو، ڕێگە پێنەدانیان بۆ کەڵك وەرگرتن لە مافی جیاییو تەڵاق کاتێکە هاوسەرانو گەورەکانیان هەرکات حەزیان کرد لەوان جیاببنەوەو هەروەها بە دابەزاندنی پلەو پێگەی ژنان خزمەتی ئیسلام ناکرێت.

بەڵکو بە پێچەوانە، ژنان دەبێت ئازادبکرێنو دەرفەتی خوێندنیان بۆ فەراهەم بکرێت، پێویستە ڕێز لە پلەو پایە یان بگیرێتو لەهەموو ڕوویێکەوە هاوشانی پیاوان بێنە ئەژمار.

## نەفرەت لە مێژوومان:

ئایا دەتوانی بیربکەیتەوە کە مرۆڤێك، بکرێ پێی بڵێت مرۆڤ، خەڵك بەردەباران بکات، وەبەر قامچی یان بداتو دەستیان ببڕێت بەو بیانووەی کە ئەم جۆرە سزادانانە لە سەدەکانی ناوەڕاست داو لە سەردەمی خەلیفەکاندا جێبەجێ کراوە؟

ئەگەر شەیتانێك هەبێت، شەڕكردن لەگەڵ ئەو لەزاتی پاكی ئیسلام دا، بۆ پەروەردەكردن و بەرز كردنەوەو بەخشینی مرۆڤە. ناكرێ لە رابردووی شووم دا بەدوای داهاتووی ئێراندا بگەریت و، لەلایەكی دیكە، تێكڕای كەلەپوورو میراتی فەرهەنگی خەڵك كە ئاكامی سێ هەزار ساڵ زەحمەت و لەخۆبردوویی و داهێنانی رەسەنە، فڕێ بدرێت.

ئالاّی ئێران، كە مێژووی پەیدابوونەكەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش لەبنەماڵەی ئێمەو بەدرێژایی مێژوو لەژێر ئەو ئالاّیەدا بە ملیۆن ئێرانی گیانی بەخشیوە،ئێستا لەلایەن رێبەرانی بەناو شۆڕشەوە گاڵتەی پێدەكرێت هەرواكە پاشایانی دێرین كە ئێرانیان لەكاتی سەركەوتن و تاڵییەكانی یەكێك لە جێی شانازی ترین مێژووەكانی جیهاندا رێبەری كردوە، بووە بەجێگای گاڵتە پێكردنیان.

وەها نەفرەتێك لە مێژوو، لە گشت مێژووی ئێران، وای كردووە كە گوێیان بە فەرموودەی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام نەدا كە فەرمووی:" لە سەردەمی دەسەلاّتداری پاشایەكی دادپەروەردا لە دایك بووم"و هەروەها ئەنوشیروان (خوسرەو) یان بە ستەمكار ناوبردو بە شێوەیەكی ناشیرین باسی شائیسماعیل دەكەن كە ئێرانی كرد بەتەنیا ولاّتی شیعە.

هیچ شتێك بەقەی بینینی ئەو هەڕەشە ترسناكەی كە ڕووی كردووەتە شوناسی نەتەوەیی و میراتی فەرهەنگی و مەعنەوی ئێران، بۆ من بەژان نییە. چونكە ئەمانە گەورەترین جیاوازییەكانی ئێمەن و بناخەو بنەرەتێكی پێویستن بۆ سەرئەنجام گێڕانەوەی هەموو ئەوشتانەی كەلەدەست چووەو بێ ئەوەش هەمووشتێك لەناو دەچێت.

# " خوای گەورە خەڵکەکەمان رزگاربکە"

بیستوومە کەلەم دواییانەدا ئەم دروشمە لە ئێراندا بەرزبووەتەوە کە:" مەرگ بۆ ئێمە کە وتمان مەرگ بۆشا " بێگومان ئەمە هەڵەی من بوو کە چاوم بڕیبووە داهاتوویکی وەها دوورو هەوڵم دەدا خێرا هەنگاو بنێم. بەڵام ئایا دەستێوەردانی هەندێ هۆکاری دەرەکی ئاشکرانییە؟ ئایا بە ئاشکرا نابینرێت کەمن زۆرئاسانتر لەوەی کە هەندێ لە کێشەکانم چارەسەرکرد لە هەمبەر هێزە دەسەڵاتدارەکاندا راست بوومەوە؟

سەرئەنجام خاڵی کۆتایی. هەرچەند کەئێران پێش لەئیسلامیش هەبوو، واباشە لەبیری نەکەین کە پێغەمبەر ئێرانییەکانی هاوچەرخی خۆی ستایش دەکردو ئەوانی بە " پرسای راستیەکان" ناودەبرد. من بە دۆزینەوەی هەڵەکانمو هەوڵدان بۆ راست کردنەوەیان راستگۆیانە بە دوای راستیدا گەرام. لەماوەی دەسەڵاتداری من دا ئێرانییەکان بە دوای درۆوە نەبوون.

بیرم هیچکات لە وڵاتەکەم دانەبڕاوەو هێشتا هەموو بیروخەیاڵم بەلای ئێرانەوەیە. بیرم بە لای ئەوکەسانەوەیە کە بەرامبەر بە ئاڵاو پاشاکەیان وەفادارمانەوە، بیرم لای ئەو کەسانەیە کەتا ئەمڕۆ لەبەردەم بکوژەکانیان دا دانیان بە ئەمەگناسی خۆیاندا نا، لای ئەو نیشتمانپەروەرانەیە کەلە سەردەمی دەسەڵاتداری من وباوکم دا ئێرانیان لەتاریکیو بن دەستی دەرهێناو " میللەتی گەورە"ی ١٩٧٨یان پێکهێنا. پاشا دور لەزێدو نیشتمانی ئەوان، تەنیا بە یەك ڕێگا دەتوانێت سپاسو پێزانینی خۆی دەرببڕێت، بەڵام بە ڕێگایەك کەبە بڕوای من لە هەموورێگاکانی تر بەهێزترەو– ئەویش نزایە.

نزادەکەم بۆ ئەوکەسانەی کەبەهۆی تۆمەتو بوختانەوە هابن بە دوایانەوەو ئازاری تاراوگە دەچێژن.
نزادەکەم بۆ دەیان ملیۆن ئێرانی کەلەنیشتمانی خۆیاندا لە تاراوگەدا دەژین.
نزادەکەم بۆ دایکانی بنەماڵە ستەم لێکراوەکان.
نزادەکەم بۆ لاوانی هەڵخەڵەتاومان کەبەلارێداچوونو بێ هیواو بەتەنیا ماونەتەوە.
نزادەکەم بۆ ئەوانەی کە خۆشەویستێکیان لەدەست داوە.
نزادەکەم بۆ بەملیۆن بێکار. بۆ ئەوانەی کە هەمووشتێکیان لە دەست داوە. بۆ ئەوانەی کەلە بێ دەنگی دا ئازار دەچێژن، بۆ ئەوانەی کە بەربینگیان پێ گیراو کۆت کراون. سەرئەنجام، نزادەکەم بۆ ئەوانەی کە چاویان بەدرۆ و فریو بەستراوە. خۆزگە خواوەند چاویانی دەکردەوەو تۆزی نەفرەتی بۆ هەمیشە لە دڵیان دەسرییەوە.
ئەی خواوەندی مەزن کەلە هەموو ژیانمدا بڕوام بەتۆ هەبووە، وڵاتەکەم بپارێزەو خەڵکەکەمان رزگاربکە.

کوئێرناواکا، ١٦ سپتەمبری ١٩٧٩

# فەسڵی پاشکۆ

## درێژەی دوورخستنەوە

کاتێک یەکەم پێشنووسی وەڵامی مێژووم لە ١٦ سپتەمبری ١٩٧٩دا لەوڵاتی مەکزیک تەواوکرد، هەرگیز بیرم نەدەکردەوە کە دەبێت ئەم هەمووەی لێ زیادبکەم. پوختەکردنی پێش نووسی یەکەم لە ڕوانگەی منەوە وەك کێبرکێ یەك بوو لەگەڵ زەمان. لەچەندمانگی رابردوودا باری تەندروستیم بەرەو خراپی چووبوو ئێش و لەرزوتای زۆر ئازاری دەدام.

پزیشکانی تایبەتم لە کوئێرناواکا سەرەتا نەخوشییەکەمیان بە زەردەیی و مەلاریا زانی و سەرئەنجام بەو ئاکامە گەیشتن کەرەنگە بەهۆی سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجەی رژێنەری لیمفاویەوە بێت کەلەماوەی شەش ساڵی رابردوودا لە ئێران بە شاراوەیی لەگەڵی بەربەرەکانێم دەکردو بۆ ماوەیەکی کاتی دامرۆکابوو.

پاش چەند حەوتوو، پزیشکانی مەکزیکی و فەرەنسی و ئەمریکی کەلە گەلیان راوێژم دەکرد منیان هاندا بۆ ئەوەی سەردانی ئەمریکا بکەم بۆئەوێ کۆمەڵێك تاقیکردنەوەم بۆ بکرێت کەتەنیا لەنەخۆشخانەگەورەکانی هوستن یان نیویورکدا مەیسەر بوو. زۆر حەزم بەم سەردانە نەدەکرد، لەبەر ئەوە پاش رۆشتنم لەتاران لە ١٦ی جەنیوەری ١٩٧٩دا، کەویلیام سالیوان، باڵوێزی ئەمریکا، بە " پشووی کورت خایەن" ناوی برد، واشنگتون هیچ ئۆگرییێکی بۆ سەردانی من بۆ ئەوەی

نیشان نەدابوو. هەڵبەت ئەمریکیەکان بەردەوام بەئاشکرا دەیان گوت کەئەگەر تەندروستیم کەوتە مەترسییەوە، بۆ دەرمان کردن‌و یارمەتی هەمیشە دەتوانم سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەم.

لە مانگی ئۆکتۆبەردا کە بڕیاردرا بۆ دەرمان کردن بڕۆم بۆ نیویورک، ئەوەندە نەخۆش بووم کە گومانێك بۆ ئەم کارە نەمابووەوە. هاوڕێیانم ئامادەکارییەکانیان کردو لە ٢٢ئۆکتۆبەردا کاتێك بەخۆم زانی کەلە فڕۆکەخانەی مەکزیکۆسیتی دا بەرەو فڕۆکەیەکی جتی گالفستریم دەڕۆشتم. بەرپرسی کونسولخانەی ئەمریکا لە مەکزیکۆسیتی، لە نزیك فڕۆکەکەوە چاوەڕێ بوو بۆ ئەوەی بەڵگەنامەکانی پێویست بۆ ڕۆشتنم بۆ ئەمریکا ئامادەبکات. کاتێك چاوی بەمن کەوت ئاسەواری سەرسووڕمانم بە روخساریەوە بینی. پێی وانەبوو ئەمە هەر ئەو پاشایە بێت کەبەقسەی دەزگاکانی راگەیاندن ماف مرۆڤی پێشێل دەکردو زوڵمی لە خەڵك دەکرد. ئاشکرابوو کە پیاوێکی زۆرنەخۆشم. هەر کە کاروباری ئامادەکردنی ڤیزا تەواوبوو لەگەڵ هاوڕێیانی قامك ژمێرم دا سواری فڕۆکەکە بووم.

نۆ مانگ بە سەرچوونم لە ئێراندا تێدەپەڕی، ماوەیەکی پڕئازارو ترس‌و بێ هیوایی‌و تێفکرین. نیگەرانی بارودۆخی ئێران بووم، هەموو ڕۆژێك ئەو هەواڵانەی دەهات کە باسی لە کوشتن‌و خوێن ڕێژی‌و لە سێدارەدانی شۆڕشگێرانەو بێ دادگایی کردن‌و، مردنی دۆستان‌و بێتاوانانی دیکە دەکرد. هەمووی ئەم ترس‌و تۆقاندنانە بەشێك بوو لەو چالاکییە بە بەرنامەی ئایەتوڵلا خومەینی بۆ تێکدان‌و شێکردنەوەی ئەو تان‌وپۆ کۆمەلاّیەتیەی کەلە ماوەی سی‌وحەوت ساڵدا بۆ میللەتەکەم پێکم هێنابوو.

بەلاّم لە لایەنگرانی ماف مرۆڤی ئەمریکی کەلە ئیدانەکردنی رژیمی "ستەمکاری" من دا هاواریان لێ هەڵسابوو وشەیکی ناڕەزایەتی نەبیسترا. بەڕای من ئەمریکاو بێگومان زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی لێکدانەوەیەکی خەماوییان لە ماف مرۆڤ کردبوو، پێوەرێکی دووفاق یان بۆ ئاکارو رەوشتی نێونەتەوەیی لەبەرچاو گرتبوو: هەرشتێکی دەستەچەپی، بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە چەندە نزمو

خوێناوی بێت، پەسەندە، بەڵام سیاسەتەکانی دەوڵەتانی دەستەڕاستی و میانەڕۆ خراپن.

هیچکات ئەوەندەی چەندمانگی سەرەتای دوورکەوتنەوەم لە بێ توانایی رۆژئاوا لە تێگەیشتنی پیلانی گەورەی کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی تووشی سەرسووڕمان نەهاتبووم. هەموو ماوەی ژیانی گەورەساڵیم لە پەیوەندی نزیك لەگەڵ ئاغەکانی کرملین دا بە سەربردووە. لەم ماوەی چل ساڵەدا هەرگیز نەم بینی کەلەیەکێك لە ئامانجەکانی کرملین دا، واتا هەوڵدانی بێوچان بۆ زاڵبوون بەسەر جیهاندا، بچووکترین سستی یەك پەیدا ببێت.

من بەردەوام تەبایی و دۆستایەتیم بە باشتر دەزانی بەڵام نەبەشێوەی باوی ئەمریکا و وڵاتانی رۆژئاوایی کەلەپێگەی لاوازی و سەرلێ شێواوی دا قەبووڵیان کردووە ئاشتی وتەبایی کاتێك پەسەندە کە رۆژئاوا لە پێگەی دەسەڵات و هێزەوە، یان لانیکەم یەکسانەوە، وتووێژبکات. ساڵانی دەیەی هەشتا بۆنی مەترسی سەر سووڕهێنەری لێدێت. رووسیا لە ساڵی ١٩٨٣دا بەو پەڕی هێزوتوانای خۆی دەگات و ئەگەر بارودۆخەکەش بەمجۆرە بڕواتە پێش، ویلایەتەیەکگرتووەکان بۆ ئاستی هەرەنزمی خۆی، واتا لاوازترین پێگەیەك کە وەك هێزێکی جیهانی هەیبوو دادەبەزێت.

ئەمڕۆ بەکارهێنانی هێز لەناو پێکهاتەی جیوپۆلیتیکی دونیادا ئیتر بابەتێکی سەرەنجڕاکێش نییە بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوەی سیاسی. بیردۆزانی "نوێ" لە روانگەی " وێستگەی خەڵووز وەرگرتن" ی ئەو کەسانەی کەلە وتووێژە نێونەتەوەییەکاندا، پرسی ئاسایشی نەتەوەیی تاوتوێ دەکەن پێکەنینیان دێت و سووکایەتی پێدەکەن.(Coalig Station- وێستگەی خەڵووزگرتن لە کاروباری سیاسی دا بەجۆرێك دابەشکردنی دەسەڵات لە پێکهاتەیەکی جیوپۆلیتیك دا دەوترێت – و .) بەڵام ئەمانە ئەو رۆژگارانەیان لەبیرکردووە کەهێزی دەریایی بریتانیا لەهەر زەریایەکدا خەڵووزخانەیەکی بۆ خۆی هەبووو ئاسایشی دونیا زۆرزیاتر بوو.

تەنانەت لە سەردەمی مووشەکەکان و تێکهەڵچوونی ناووکیشدا، هێزێکی جیا لە هێزی ناووکی هێشتا پێویستە بۆ سیاسەتی نەتەوەیی. هێزو دەسەڵاتێکی بەمجۆرە پێکدێت لەو پێگەیانەی کەلە دەرەوەن و ئەو هاوپەیمانە دەرەکییانەی کە پایەدارو هەمیشەیین. من بڕوام بە هەر دووی ئەمانە هەبوو. کاتێکە بریتانیا لە ١٩٦٨دا هێزەکانی خۆی لە خۆرهەڵاتی سوئێزدا کشاندەوە، بە خوشحاڵییەوە پارێزگاری کردن لە کەنداوی فارسم لە ئەستۆگرت. بۆ بەجێ گەیاندنی ئەرکە نوێکەمان، پێویست بوو ئێران ببێت بە هێزێکی سەربازیی پلەیەك کە بتوانێت پارێزگاری لە پێگەکانمان بکات. متمانەم وابوو کە هاوپەیمانانی ئەمریکی و بریتانی پشتیوانی لەم هەوڵانەدەکەن. ئەم متمانەیە چەندە بێجێ بوو.

بەم حاڵەش ئەم متمانەیەم بەتەواوی لەدەست نەدا. تەنانەت لە تاراوگەش دا دڵنیابووم کە وڵاتانی رۆژئاوایی بەرنامەگەلێکیان هەیەو، بۆ پێش گرتن لە پەرەسەندنی کۆمۆنیزم و شێتی خۆ دوورخستنەوە لە بێگانە لە ناوچەیەکدا کە بۆ گەشەوئاسایشی دونیای ئازاد پێویستە، بیری پەسەندو شیاو بە مێشکیاندا دێت. لە یەکەمین رۆژەکانی رۆشتنم لە ئێران لە ئاسوان دا بیرم لەو شتە دەکردەوەو لەگەڵ سەرۆك ساداتیش لەم بارەوە قسەو باسی زۆرمان کرد. بەلام ئەو بارخراپییانەی کەلە چەندمانگی سەرەتای دوورخرانەوەم لە میسرداو پاشان لە مەراکیش دا رووی دا دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ لێکدانەوەو شرۆڤەی دروست نەهێشتەوە.

کەمێك پاش رۆشتنم لە ئێران، دەمویست بڕۆم بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکان، بەڵام ئەوکاتەی کەلەمەراکیش دابووم لە دۆستانی تایبەتیم لە ئەمریکا کەلەگەڵ دەوڵت پەیوەندییان هەبووو هەروەها لەو سەرچاوانەی کەلە دەزگای کارتێردابوون، پەیامێن سەرسوورهێنەرو مایەی ناڕەحەتیم بەدەست گەیشت. ئەو پەیامانە، هەرچەند کەوادیارنەبوو نادۆستانەیشن، بەڵام زۆربە پارێزەوە بوون: رەنگە کاتێکی گونجاو نەبێت بۆ هاتنتان، رەنگە دواتر بتوانن بێن، رەنگە واباشتر بێت چاوەڕێ بکەین تا بزانین چۆن دەبێت.

مانگێك پاش ڕۆشتنم لەئێران، پەیامەکان تۆزێ گەرمتربوون و دەربڕی ئەمەبوون کە هەڵبەت دەتوانم ئەگەر زۆر حەزبکەم بڕۆم بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکان. بەڵام ئیتر ئەوەندە حەزم نەدەکرد، چونکە نەمدەتوانی بڕۆم بۆ وڵاتێك کەمنی رووخاندبوو. بەرەبەرە دەهاتمە سەر ئەو باوڕەی کە ویلایەتەیەکگرتووەکان لەم کارەدا دەورێکی سەرەکییان گێڕابوو.

ڕۆژگارێك نەبوو کە ئاسوودەیی تێدابێت، بەشێکی زۆری بەوەوە تێدەپەڕی کە گوێ بیستی ئەو هەواڵانەی دەبووم کەلە رادیۆتارانەوە بڵاودەبووەوە و دڵمی دەهەژاند. دادگاکانی شۆڕش وەگەڕکەوتبوون. هەموو ڕۆژێ چیرۆك گەلێکی نوێ لە وڵاتەکەمدا بەرگوێ دەکەوت. دۆستان و هاورێیانم بە کۆمەڵ گولەباران دەکران. ماڵی لایەنگرەکانمیان داگیردەکرد، حەسیبەبانکییە کانیان چەپاوەدەکرد، ئۆتومبیل و کەلوپەلی ناوماڵەکانیان بەتاڵان دەبرد.

ئێعدامی ئەمیر عەباسی هۆیدا سەرۆك وەزیرانی درێژماوەم کە چەندهەفتە پێش بەرێوەچوو منی بەتەواوی خەمبارکرد بەڵام ئەمە بۆ بکوژەکان دەسپێکی کارەکە بوو. هەرکات لەراپۆرتەکانی دەسدرێژی بەردەوام و دڵڕەقی بێ بیانووی ڕۆژانە بەرامبەر بە ئەندامانی دەوڵەتەکەم و خێزانەکانیان، بە هۆی ئەم کۆماری بەناو ئیسلامیەوە ئاگادار دەبووم، زیاترو زیاتر بۆم دەردەکەوت کە ئەمانە تاچ ئاستێك دڕندەخوون.

ئەوکاتەی کەلە باهامادا بووم پەیوەندییەکانم لەگەڵ ئەمریکا زۆرزۆر کەم ببووەوە. لە ڕێگای جیاوازەوە دڵنیاییان دەدا بەمن کە بنەماڵەکەم هەرکات بیانەوەدێت دەتوانن بڕۆن بۆ ئەوێ و منیش هەمیشەدەتوانم بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سەردانی ئەوێ بکەم. بەڵام واشینگتۆن پێی خۆش نەبووکەمن لەوێ بم. پێدەچوو ئەم هەستەش گوێزرابێتەوە بۆ بەرپرسانی دەوڵەتی باهاما، لەبەر ئەوە پەیوەندییمان شێوازێکی دروست و ڕێك و پێکی هەبوو بەڵام نزیك و دۆستانە نەبوو.

سێ حەوتوو پێش لەوەی ڤیزای مانەوەمان ماوەکەی بەسەر بچێت لەلایەن ئێمە داوای درێژکردنەەی ماوەکە کرا. دە رۆژی مابوو بۆ بەسەرچوونی ماوەی ڤیزاکان ئاگادارکراین کەماوەکە درێژناکەنەوە.

تەنیا دە رۆژ دەرفەتمان هەبوو کەلە باهاما بڕۆین! هیچ روونکردنەوەیەکیان نەدا، هیچ بەداخ بوونێکیان دەرنەبڕی‌و، ئیتر هیچ وتووێژێك لەگەڵ بەرپرسانی باهامایی دا نەکرا. سەبارەت بەداواکاری ئەوان بۆ چوونەدەرەوەمان، هەنووکە بیرۆکەگەلێکم هەیە کەلەوکاتەدا گومانێکی ناروون بوون. هەرچەند کەتەنیا سەرچاوەی داهاتی سەرەکی باهاما قازانجی گازینۆکانە، بەڵام ئەم دەوڵەتە وەك بووکەڵەیەك وایە بەدەست بریتانیاوە. کاریگەری بریتانیا لەسەر ئەم وڵاتە کە پێشتر ژێردەستەی بووە وەك ژێردەستەکانی تری کاریگەرییەکی بەهێزو بەرچاوە. سەبارەت بەنیازو مەبەستی بریتانیاو سیاسەتی بریتانیا گومانێکی لە مێژینەم هەیە کە هۆکارێك بۆ گۆڕینی نابینم.

بە سەرنج دان بە خۆ دوورگرتن‌و ساردی ویلایەتەیەککرتووەکان‌و دوژمنایەتی هەمیشەیی بریتانیا، پیندلینگ، سەرۆك وەزیرانی باهاما سەرەڕای ئەو هەمووە پارە زۆرەی کەلەماوەی مانەوەی دە هەفتەیمدا لەباهامادا خەرجم کردبوو خوازیاری رۆشتنی من بوو.

بەڵام گرفتی هەنووکەیی پەیداکردنی شوێنی دواتربوو. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کەلە لایەن دەوڵەتی پاناماوە بانگهێشتێکی گەرم‌و گوڕ کرابووین. گابریل لوئیس، باڵوێزی پێشووی پانامە لە ئەمریکا، هات بۆ سەردانم بۆ باهاماو بانگهێشتی پاناماى کردم .بەهۆکاری جۆراوجۆر، لەوکاتەدا ئەوەندە حەزم نەکرد ئەم داوایە قبوڵ بکەم.

بەڵام جێگرەوەی دیاری کراوم، رەزام بۆ چاوپێکەوتنێك رەوانەی ئەوێ کرد. ئەو لەوێ چاوی بەژەنراڵ توریخوس کەوت‌و گەشتێکی بەو وڵاتەدا کردو لەوانە سەردانی دوورگەی کونتادورای کرد. لەوکاتەدا نەمدەزانی کەئەم دوورگەیە ماوەیەك دواتر دەبێت بەماڵی من.

لە ریزی ئەو ولاتانەی کەپێم باش بوو دوورخرانەوەم لەوێدا تێپەرێت، مەکزیك لە ریزی پێشەوە بوو. هەوڵی زۆردرا تا بەشکوو بتوانم لە مەکزیك وەك پەناگەیەك کەڵك وەربگرم چەند دۆستێکم لە ئەمریکا، وەك هێنری کیسینجێرو هەندێ لە بەرپرسانی دەزگای کارتێر لەم کارەدا یارمەتیان دا. تا سەرئەنجام، دوو رۆژ پێش لە بەسەرچوونی ماوەی ڤیزاکانمان لە باهاما، لەلایەن مەکزیکەوە بانگهێشت کراین. ئەفسەرانی تایبەتم پێشتر لە ئێمە رۆشتن و لە شەقامێکی بچووکی ناواکا کە کاتژمێرو نیوێك لە مەکزیکوسیتی دوور بوو، خانووێکیان پەیداکرد.

رۆژی ١٠ی جوون رۆشتین بەرەو مەکزیك و لە فرۆکەخانە تا کوێرناواکا لە لایەن کۆمەڵێکی بچووك لە پاسەوانانی ماتۆرسوارەوە بەرێکراین. سەرۆك لوپزپورتی یو زۆربەی پێداویستیەکانی پاراستنی دابین کردبوو. لەوێ تەنیایی و ئارامی بایەخی زۆری بۆمن هەبوو. چونکە لە باهاما زۆر کەم وەها شوێنێکم هەبوو وشوێنەکەم بەر چاو ولە گەماڕۆی خەڵکدابووم. لەوکاتەدا بارودۆخی تەندروستیم باش بووو ئەو خەڵکەی کە دەمدیت رەفتارێکی دۆستانە وبێ ئازاریان هەبوو. بۆ دەربرینی رێزو پێزانین بەرامبەر بە سەرۆك لوپزپورتی یو جارێك سەردانیم کردو ئیتر ژیانێکی کۆمەڵایەتی ئارامم گرتەبەر. هەرچی بوو، دەرفەتێکم لە تەنیایی دا بۆ هەڵکەوتبوو تا سەبارەت بە لایەنە جۆگرافیاییەکانی رووداوەکانی ئێران تێفکرم و لە ژێر رووناکی ئەوشتەی کەلە ولاتەکەمدا رووی دابوو سەرلە نوێ فەلسەفەی خۆم دەربارەی دونیای ئازاد دابرێژمەوە.

دۆستانێکی زۆر سەردانیان کردم و لەم ئیشەدا یارمەتیان دام. لەوەی کە سەرۆك نیکسۆن و وەزیری کاروباری دەرەوەی، کیسێنجێر سەردانیان کردم، هەم زۆرسوپاسیانم کردو هەم نارەحەتیش بووم. هەردووکیان لە دۆستانی دێرین و بە نرخی من و سەردانی ئەوان نیشانی دا کە هێشتا چەندە لە بیری من دان. نە تەنیا لە بیری من، بەڵکو گرنگتر لەوەش، لە بیری کۆمەڵێك پرس دا کە پێکەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بۆ چارەسەرکردنیان زۆران بازیمان کردبوو. لەگەڵ هەردووکیان وتووێژی دوورودرێژم هەبووو بۆم دەرکەوت کە هێشتا روانگەو

بۆچوونەکانمان سەبارەت بە پرسێن جیوپۆلیتیك وەك یەك وایە، راست وەك ئەوکاتەی کە پێکەوە لەسەرکورسی دەسەلآتدا بووین‌و پەیوەندی نێوان ئێران‌و ئەمریکا زۆرنزیك بوو.

دۆستایەتی من‌و ریچاردنیکسۆن دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٩٥٣، ئەو کاتەی کە ئەو جێگری سەرۆك ئایزێنهاڤێربوو. کاتێکیش بوو بەسەرۆك کۆماری ئەمریکا پەیوەندییەکانمان چ وەك دۆست‌و چ وەك هاوپەیمان بتەوترمایەوەو لە سەردەمی سەرۆك فۆرد- یشدا ئەم پەیوەندییە هەر بەردەوام بوو. لە پەیوەندی لەگەل پرسەدەرەکییەکانیش دا، سەرۆك نیکسۆن روانگەو تێگەیشتنێکی بەرچاوی سەبارەت بە رووداوەکان‌و کەسەکان هەیە. سیاسەتی ئەو بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی ڤیتنام‌و ئاسایی کردنەوەی پەیوەندی لەگەل کۆماری خەلکی چین دا، سیاسەتێك بوو لە سەر بنەمای ژیری‌و لۆژیك‌و دووربینی. بەهەمان شێوە بیرکردنەوەی ئەو دەربارەی هاوسەنگی هێزەکان لە دوونیادا، بایەخێکی بەرچاوی بە ئەمریکا بەخشی بوو. پێش لەوەی کەببێت بە سەرۆك کۆمار لە پەیوەندی لەگەل پرسێن جیوپولیتیکدا زۆر وتووێژی دووردرێژمان لەتاراندا هەبوو بۆمان دەرکەوت کە سەبارەت بە زۆرێك لە پرسەکان بۆچوونی وەك یەکمان هەیە.

بۆ نموونە، هەر دووکمان باوڕمان وابووکە: هەر نەتەوەیەك دەبێت بە دوای " هاوپەیمانانی سروشتیی" خۆیدا بگەڕێت (ئەو ولآتانەی کە پەیوەندییان لە سەربنەمای بەرژەوەندی بەردەوام‌و هاوبەش بێت)، دەبێت لە هاوپەیمانانی گومانـاوی کە دەتوانن ببنە هۆی سەرئێشە دووری بکرێت‌و، هاوپەیمانێکی هەمیشەیی چاکترە لە دە هاوبەش کەلە کاتی مەترسی دا لاوازی نیشان بدەن....ریچاردنیکسۆن راست یەکێك لەو ئەمریکیانەیە کە بەسەردانی لەمن لە کوئێرناواکا ئەمەگناسی خۆی بۆ دۆستێکی دێرین سەلماند. لە هەل‌و مەرجێکی زۆرجیاوازدا هێنری کیسێنجێرم ناسی.

یەکەم جار کاتێك بوو کە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ئەستۆبوو، دواتر لەوکاتەی دابوو کە وەزیری کاروباری دەرەوەی سەرۆك

نیکسۆن و سەرۆك فۆرد بوو. سیاسەتوانێکی زانایە کە توانای تێگەیشتنی لە سیاسەتی ئەمریکاو جیهان هاوتای نییە. ئەو کە هەمیشە وەفادارە بەو بنەمایانەی کە باوڕی پێیەتی، بە ئاگاداربوونی بەردەوام لە بەرپرسایەتەکانی ئەمریکا بۆ پاراستنی ئاشتییەکی بە ئابڕۆ لە جیهاندا، خزمەتی نیشتمانەکەی کرد. زیرەکی بەرچاوی ناوبراو لەگەڵ دووسیفەتی دیکەی تەواوکەری یەکتر بوون: توانایی گوێگرتن لە بەرامبەرەکەی و شۆخ بوونێکی لە ڕادەبەدەر زیرەکانە.

هەموومان کۆك بووین لە سەر ئەوخاڵەی کە چیرۆکی کۆمۆنیزمی ئەورووپی وەك جێگرەوەیەکی نەمری زاڵبوونی کۆمۆنیستەکان بەسەر جیهانی رۆژئاوادا بەرەو لە ناوچوون دەچێت. لە فەرەنسادا پەیوەندی ژۆرژ مارشە لەگەڵ شەریکە سۆسیالیستەکانی بە رێبەرایەتی فرانسوامیتران بەرەو کزی چووبوو. ئەم رەوتە ئێمەی تووشی سەرسووڕمان نەدەکرد. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٧دا سەردانی پۆڵەند و چێکوسلۆڤاکیام کردبوو، هەم لە ڤەرشۆ و هەم لە پراگ گوێم بۆ قسەی بەرپرسانی کۆمۆنیست گرتبوو کەبە نیگەرانییەوە باوڕیان وابوو باڵی چەپی فەرەنسا هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی ١٩٧٨دەباتەوە. ئەوان بەمنیان دەگوت کە شتێکی وا هەرگیز بە دڵی ئێمە نییە. کۆمۆنیستەکان حەزیان نەدەکرد دەسەڵات لەگەڵ ئەوانی تردا دابەش بکەن.

زاڵبوون و باڵادەستی تەواویان دەویست. یەکێتی یان هاوپەیمانییێکی وەك ئەوەی مارشەی فەرەنسی و برلینگوێری ئیتالیایی و کاری یوی ئیسپانیایی پێکیان هێنابوو، ئەوانی رازی نەدەکرد. تەنیا مل نەدانی کۆنهال لە پورتورگالدا جێگای پەسەند بوو کە ئەوەندی نەمابوو سەربکەوێت بەڵام وازی لە مامەڵە کە هێنا.

پێویست بوو پەڵپگرتن و یاخێتی کۆمۆنیستەکان لە شوێنەکانی تردا لەبەر چاو بگیرێت. زیاتر لە چل هەزار بە کرێگیراوی کووبایی بە وەڕێخستنی شەڕو ئاژاوەو زاڵکردنی کۆمۆنیزم لە ئانگۆلا تا ئەتیوپیا رەوتێکی تاڵیان بۆ پارچەپارچەکردنی ئەفریقا وەڕێخستووە. ئەفریقا کیشوەری داهاتووە، کە هەنووکەژیانی رۆژئاوا گرێدراوی ماددەخاوەکانیەتی و بە تێپەڕبوونی کات گرنگی ئەم ماددانە زیاتر

دەبێت و زیاتر دەکەوێتە بەر هەڕەشە. کێشمەکێشە خێڵەکییەکان کە گۆڕاوە بۆ وڵاتانی شەڕانی ودوژمن ئەم کیشوەرەی لەبەر یەك هەڵوەشاندووەو خنجێری دووبەرەکی و شەڕی ڕەگەزی دڵی ئەفریقای باشووری کونکردووە. چین هێشتا لاوازە، ژاپۆن ئامادە نییە تۆزقاڵێك لە سروەتی نوێ و بەربلاوی خۆی لە ڕێگای بەرگری کردن لە خوێدا خەرج بکات. تۆکیو هێشتا پشتی بە پاراستنی ئەمریکا گەرمە. ئەزموونی تایبەتی ئەوەی بە من نیشان داوە کە ئەم پاراستنە چەندە پووچە.

لەم بارودۆخەدا ئێران بەرەو ئاڵۆزی و شێواوی دەڕوات. ئەومیللەتەی بەرەو لووتکەی پێشکەوتن و بەهێزی و متمانەبەخۆیی ڕێبەرایەتیم کردبوو لەت وکوت و خوێناوی داکەوتووە.

پیرەپیاوێکی دەمارگیرویەککەوتە بەردەوام بۆ خەڵکی ئێرانی دووپات دەکاتەوە کە چەندهەژارو بێدەرەتان بوونە. مافەکانی ژنان کە بەو هەمووە زەحمەتە لە سەربنەمای رووسووری و سەرفیرازی مرۆیی دابینم کردبوو لە تەپ و تۆزی سەدەکانی ناوەڕاستدا پێشێل کرا. زۆرێك لەو پرۆژانەی کە دەستم پێکردبوو و نەمتوانی تەواوی بکەم وەك خۆی ماوەتەوە. مەلاکان ویزگەناووکییەکانی کارەبا یان بۆ چی بوو کە نەخشەکێشان و بیناکردنیان دەستی پێکردبوو؟ دوو ویزگەی یەکەم کەلە حاڵی جێبەجێ کردن دابوو ٢٥٠٠ میگاوات کارەبایی بە تۆڕی کارەبای ئێران زیاد دەکردو شوێنەکەشیان کەلە باکووری بیابانی ناوەندی دابووئەو دەرفەتەی فەراهەم دەکرد کەپاشماوە رادیوئەکتیڤەکان لە شوێنێکی بێ ترس و دڵنیادا بشارینەوە. چی بەسەر ئەو قوتابخانەو نەخۆشخانەو زانکۆو دامەزراوەکۆمەلآیەتی و کارگە نوێیانەدا دێت کە خەریکی دروستکردنی بووین؟ بیرمان لە پرۆژەگەلێك کردبووە وە کە جێبە جێ کردنیان ئێرانی دەکرد بە گەورەترین بەرهەم هێنەری پەیینی کیمیایی. چ خەونێکی بە فیڕۆچوو!

ئەو شەوەی کە لەمەکزیکەوە بەرەوچارەنووسێکی نادیارفڕین ئەم خەونانە وەك مۆتەکەیەك ئازاری دەدام. باری تەندروستیم باش نەبوو. شەکەت بووم و لەرزوتام

کردبوو. نەمدەزانی کە لە نیویورکدا چۆن لە گەڵمان بەرەورووو دەبن. وەك بڵێیت بە چوونم بۆ ئەوێ سوکنایم دەهات و دڵنیابووم کەلە باشترین چاودێرییەپزیشکییەکان سوودمەند دەبم. لە بنەڕەتدا وامدانابوو کەلە ماڵی خوشکم لە مەنهەتەن دا بمێنمەوەو لەوێ هامڕاکانم ببینمەوە. بەڵام لە ڕێگای رادیۆی پۆلیسەوە ئاگادار کراین کە وێنەگرێك لە پێش ماڵەکەدا چاوەڕێی ئێمەیە. هەر بۆیە بڕیارم دا راستەو خۆ بڕۆم بۆ نەخۆشخانە.

بەیانی رۆژی دواتر تیمێکی پزیشکی بە سەرۆکایەتی دکتوربنیامین کین بە مەبەستی پشکنینی تەواو وئەنجام دانی زنجیرەیەك تاقیکردنەوە سەردانی کردم، دوکتورکین پێشتر لە مەکزیکدا پشکنینی بۆم کردبوو ودەیویست کە سەردانی نیویورك بکەم. نزیکەی بیست وچوارکاتژمێر دواتر، لە ٢٤ی ئۆکتوبەردا نەشتەرگەریم بۆکرا.

پاش چەند کاتژمێرێك ڕێگام دا راگەیەنراوێکی پزیشکی سەبارەت بەباری تەندروستیم بڵاوبکرێتەوە. پزیشکەکان نەخۆشییەکەمیان بە لیمفوم زانی کەماوەی شەش ساڵ بوو تیمێك پزیشکی فەرەنسی سەرقاڵی دەرمانکردنی بوون بەڵام لە بەر پاراستنی بەرژەوەندی وڵاتەکەم، نەمدەویست ئاشکرابێت. لەم دواییانەدا بە بەردەوامی تووشی زەردویی گیران ( بەهۆی گیرانی ڕێڕەوی زراو) دەبووم کە نەیان دەتوانی هۆکارەکەی دەسنیشان بکەن. دیاری کردنی ئەوەی کە ئایا ئەم بارودۆخە پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە یان نا، پێویستی بە لێکۆڵینەوەو شیکارییێکی ئاڵۆز هەبوو. پزیشکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە زەردویی گیران بە هۆی بەردێکەوەیە کە ڕێڕەوی زراوی داخستووە. کاتژمێر هەشتی بەیانی هەمان رۆژ بۆ لابردنی ئەم بەردە نەشتەرگەریم بۆکرا. زراویشم بەردی تێدابوو کە لایان برد.

دوو رۆژپاش لەم نەشتەرگەرییە، بەئامادەبوونی بنەماڵەکەم جێژنی شەستەمین ساڵی لە دایك بوونم گرت. هێشتا بێ تین بووم بەڵام توانایی و گەشبینیم بە دەست هێنایەوە.

لەو ماوەیدا کەلە نەخۆشخانەی نیویورکدا بووم پەیوەندییێکی زۆر کەمم لە گەل دەسەڵاتی ئەمریکادا هەبوو. سەرۆك کارتێر بە هیچ جۆر تەلەفوونی نەکردو پەیامێکی نەنارد. گەورە بەرپرسانی دیکەی ئەمریکاش بەهەمان شێوە. بەڵام هەر کە تینێکی زیاترم بەبەرداهاتەوە. خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ سەردانم. تۆزێکیش سەیری تەلەفیزیونم دەکردو سەرمسووڕدەما لەوەی کە دەمدیت دەزگاکانی راگەیاندن حەزدەکەن راپۆرت لە سەر ئەو دەستەو تاقمە بچووکانە بڵاوبکەنەوە کە لە نزیکی نەخۆشخانەکە لە دژی من خۆپیشاندانیان دەکرد. وەك هەمیشە، لایك بەلای دەربڕینی پشتیوانی دا نەدەکرایەوە: جارێك فرۆکەیەکی بچووك نووسراوەیەکی هەڵگرتبوو کە نووسرابوو " بژی شا "و ئەمە هامڕاکانی منی خۆشحاڵ کرد.

لە ٤ی نۆڤامبردا، دووحەوتووپاش رۆشتنم بۆ نیویورك، شۆڕشگێڕانی دەمارگیرو کەللەویشك لەتاراندا باڵوێزخانەی ئەمریکایان داگیرکردو زیاتر لە پەنجاکەسیان بە بارمتە گرت. سەبارەت بەم کردەوە شەڕانییە شتێکی ئەوتۆ ناتوانم بڵێم. دەیان گوت کە بۆ تۆڵەکردنەوەی یارمەتی پزیشکی بەمن، "سزای" ئەمریکایان داوە. تەنانەت ئەمڕۆش، شیکردنەوەی بە سەرهاتەکە پەیوەندی بەباسەکەی منەوە نییە. بەمحاڵەش، ئەم رووداوە کاریگەرییێکی قووڵی لە سەر ژیانی من بەجێهێشت. لەگەڵ ئەوەی کە واشنگتۆن هێشتا راستەوخۆ لەگەڵ من پەیوەندی نەدەگرت، ئەو ئاماژانەی کە دەکرا گومانێکی نەدەهێشتەوە. دەزگای کارتێر داوای لەمن دەکرد هەرکە باری تەندروستیم باش بوو لەو وڵاتە بڕۆم. من بەش بەحاڵی خۆم حەزم نەدەکرد زیاد لە پێویست لەو وڵاتەدا بمێنەوە.

بەمجۆرە لە ٨ی نۆڤامبردا، راگەیەنراوێکم بڵاوکردەوەو لەودا ئۆگری خۆم بۆ ڕۆشتن لە ئەمریکا دەربڕی بەو هیوایەی کە ببێتە هۆی ئازادکردنی بارمتەئەمریکییەکان. لەم راگەیەنراوەدا بە دووردرێژی بۆچوونی پزیشکەکان باسکرابوو لە مەڕ ئەوەی کەلەو بارودۆخەدا سەفەرکردن رەنگە بە قیمەتی گیانم تەواو ببێت. لەو راگەیەنراوەدا دڵنیاییم دا کە دۆستایەتیم لە گەل ئەمریکا خەۆشی تێنەکەوتووەو

بە بیرم هێنایەوە کەلە سەردەمی دەسەڵاتداری من دا پازدە هەزارئەمریکی لە " ئاشتی و ئارامی و ئاسوودەیی دا" لە ئێراندا دەژیان.
یەکەمین کاردانەوە بە راگەیەنراوەکەی من، نەلە واشینگتۆن بە ڵکولە قاهیرەوە بوو. سەرۆک سادات " ئەشرەف غەربال" باڵوێزی میسر لە ئەمریکای ناردبۆ نەخۆشخانە تا پێشنیاری پەنابەری سیاسی و بەڵێنی درێژەی دەرمانکردنەکەم لە قاهیرەدا پێبدات. بێگومان کاری تێکردم، بەڵام نەمدەویست لەوکاتەدا جارێکیتر لە سەرمیهرەبانی و دڵوایی دۆستەکەم بارگرانی بکەم. ماڵەکەمان لە کوئێرناواکا سەروزیادمان بوو.
هەرچەند کە ڤیزای چوونم بۆ مەکزیك لە ٩ی دیسامبردا بەسەرچووبوو، بەڵام پێم وانەبوو نوێکرکردنەوەی گرفتێکی ئەوتۆی هەبێت. سەرۆك لوپزپورتی یو بۆ خۆی دووجار بەمنی گوتبووکە:" مەکزیك بەماڵی خۆت بزانە. ئێمە لێرە بەخەیرهاتننتان دەکەین." بە پێی نووسراوی رۆژنامەکانیش، دەوڵەتی مەکزیك بە بێدەنگی ئەمریکای ئاگادار کردبووەوە کە گەڕانەوەم بۆ ئەوەیٚ گرفتێك دروست ناکات. دیسان هەرچیم دەخوێندەوە باوڕم پێکرد سەرەڕای ئەو هەمووە بیٚ هیواییانەی کەلە رۆژئاوا کێشا بووم، هێشتا باوڕم پێی بوو.
لەو ڕۆژانەدا خۆم لە رەخنەگرتن لە رۆژئاوا دەبواردو ئەمڕۆش بە دوودڵییەوە ئەم کارە دەکەم. بەڵام دەبینم بەرەبەرە قبووڵ نەکردنی ئەم خاڵە گران و دژوار دەبێت کە سیاسەتی رۆژئاوا لە ئێرانداو بێگومان لە سەرانسەری جیهاندا، بە شێوەیەکی مەترسیدار بەرتەسك و بەزۆری نەگونجاوو هەندیٚ جاریش بەتەواوی گەمژانەبوو. گەیشتنم بەم ئەنجامانە بە پێی ئەوشتانەی بووە کەلەم دواییانەدا بۆم دەرکەوتووە. تەنیا یەکێك لەوانە باسدەکەم: کاتێکە تەلەفیزیون کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان و وتووێژی سەبارەت بە قەیرانی بە بارمتەگرتنی لە ئێران دا نیشاندەدا، ئانتونی پارسۆنز – م لە تەلەفیزیون دا دیت کەلەوکاتەدا باڵوێزی بریتانیا بوو لە نەتەوەیەکگرتووەکان و ساڵێك پێشتر باڵوێزی خاوەن شکۆ بوو لەتاران. ئەوەی کە دەمبیست نەمدەتوانی باوڕی پێبکەم! تەنیا

ناوەرۆکی قسەکانی ناوبراوم لە بیرماوە :" ڕێگابدەن با ئەمانە بێن"و شۆڕشەکەیان بۆ ئێمە باس بکەن. مەبەستی ئەندامانی ئەنجومەنی شۆڕش بوو کەتا ئەوکاتە زۆرێك لە خەڵکانی بێ تاوانیان کوشتبوو.

ئەمە هەر ئەو پارسۆنزە بوو کەلە پاییزی ١٩٧٨دا ئەوکاتەی کەلە بیری هەڵبژاردنی ئازاددابووم بەمنی گوت کەئەگەر لەم هەڵبژاردنەدا سەرنەکەوم، گەرچی تاج و تەختەکەم لەدەست دەچێت، بەلأم ناوم لە مێژوودا وەك پاشایەك کە وەفادارماوەتەوە بە ئامانجەدیمۆکراتیکەکانی تۆماردەکرێت.

ئەم شانۆیە نموونەیەکی کۆن بوو لە پێوەرە دووفاقیەکانی ڕۆژئاوا. وەك هاوپەیمانێك، چاوەڕوانییان لەمن هەبوو وەفاداربم بە ڕوانگەکانی ڕۆژئاوا سەبارەت بە دیموکراسی بێ سەرنجدان بەتوانایی جێبەجێ بوونی لە وڵاتێکی وەك ئێراندا. بەلأم لەم بەناو کۆماری ئیسلامییەی کە گاڵتە بە هەموو ڕوانگەکانی ڕۆژئاوا دەکات لە ناخی دڵیانەوە داوادەکەن هەتابێت بۆ ناو هۆڵی ڕێکخراوی نەتەوەکان و " ناوەڕۆکی" نوێی بەناو کۆماری ئیسلامی فێری نوێنەرانی بکات.

سەرەنجی یاری سەرسووڕهێنەری پارسونزم دەداو بەرەبەرە تووشی سەرسامی هاتم کەئایا هەرگیز لە سیاسەتی ڕۆژئاوا لە پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا هیچ یەککگرتن و شێلگیرییێك زیاتر لەو هەوڵە سەرکەوتووانەی کە بۆ لەناوبردنی من کێشایان هەبووە. لەبەشی زۆری ئەم سەدەیەدا ئێران ژێرچەپۆکەی بریتانیابووەو پاش هاتنی ئەمریکییەکانیش ئەم بارودۆخە نەگۆڕا. ڕۆژئاوا پشتیوانی کردن لە دەسەلأتدارێتی منیان هەمیشە بە گوێرەی بەتەواوەتی کۆنترۆڵ کردنی کردەوەکانی من ڕێکدەخست. گەرچی پێناسەی " بە تەواوەتی کۆنترۆل کردن" بە گوێرەی گۆڕانکاری لە مەیدانی نێونەتەوەییدا جیاوازبووە، بەلأم هەوڵدانی ڕۆژئاوا بۆ پەرپۆکردنی من هەڵدەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی موسەدیق. هەرکات کە دەمویست ئیشێك بکەم ئەم هەولأنە دەستی پێدەکردەوە.

کۆمپانیا نێونەتەوەییەکانی نەوت دوژمنانێکی کۆن بوون. پاش هەرەسهێنانی موسەدێق، بەهۆی مامەڵەیەکەوە کەلە گەل ئەنریکۆماتەئی ئیتالیایی کردم تووڕەیی ئەوانم بەرامبەر بە خۆم زیاتر وروژاند.

ئەو کۆمپانیای نەوتی ئیتالیا (ئێنی) کرد بە هەڤڕکێکی گەورەی کۆمپانیا زەبەلاحە نێونەتەوەییەکان. مامەڵەکە بۆخۆی قەبارەیەکی ئەوتۆی نەبوو بەلام هەلومەرجەکەی گرنگ بوو. لە جیاتی بەشکردنی قازانجی پەنجابەپەنجا کەتا ئەوکاتە پێوەری کارکردن بوو، ماتەئی رازی بوو کەتەنیا لە سەدا بیستوپێنجی قازانجەکە هەڵبگرێت و ئێرانیش لەسەدا هەفتاوپێنجی. ماوەیەك دواتر لەگەڵ ستاندارد ئۆیل ئیندیانایش هەر ئەم کارەم کرد. نەریتی پەنجابە پەنجاشکاو کۆمپانیاگەورەکانی نەوت هیچکات منیان نەبەخشی. لە ساڵی ١٩٥٩دا، دووساڵ پاش رێکەوتنی لەگەڵ ئێنی، یەکەمین خۆپیشاندانی خوێندکاری دژی شایان لەناو هەموو شوێنەکانی تردا، تەنیا لە ئەمریکاوە رێخست. پێم وایە باری ئابووری خۆپیشاندانەکە لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانی نەتەوەدابین کراو سیا بەرێی خست. رەنگە ئەمە ناکۆکییێکی تێدا بێت لەبەر ئەوەی کەهەردووی خاوەن بەرژەوەندی پشتیوانیان لە دەسەلاتدارێتی من دەکرد.

بەلام هەنووکە باوڕی تەاوم هەیە کە رۆژئاوا بەرەیەکی رێکخراوی لەدژی من پێکهێنا هەتا هەرکات ئەو رێگایانەی کەمن دەیگرمەبەر لە سیاسەتەکانی ئەوان دووربکەوێتەوە، ئەوا ئەو بەرەیە وەگەڕبخەن. بیست ساڵ بەر لەئێستا کاتێکە سەرۆکی وەزیرانم، شەریف ئیمامی، هۆشداری بەمن دا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پشتی دنەدانی خوێندکارانەوەیەو دەیەوێت سەرئێشە لە ناوەوەو دەرەوەی ئێران دا دروست بکات دەبوو باوڕم بە قسەکەی دەکرد.

لەوکاتەدا شەریف ئیمامی بە گوێرەی بەرپرسایەتیە یاساییەکەی زەبری گورچك بڕی ئەم دوژمنایەتیەی بەرکەوت. ئەمریکا خوازیاری ئەوەبوو کەئەو لابرێت و لایەنگرێکی خۆی بکرێت بە سەرۆکی وەزیران، ئەم کەسەش عەلی ئەمینی بوو و لەوکاتەشدا، بەتایبەت لەوکاتەی جان ئێف کەندی بووبەسەرۆك کۆمار کەوتمە ژێر

پاڵە پەستۆیەکی وەها کەنەمدەتوانی خۆم بگرم. سەرۆك کەندی هەرگیز لەگەڵ من دژایەتی نەکرد. ئەوم بەدۆستی خۆم دەزانی، هەرچەند کەپەیوەندی راستەوخۆی زۆرمان نەبوو. یەکەم چاوپێکەوتنمان لەگەڵ خێزانی کەندی و لەکۆشکی سپیدا باش لەبیرە: ژاکلین کەندی کە لەدرەوشانەوەی سەرسوورهێنەری چاوانی ئەمینی قسەی کرد و هیوای خواست کە من ئەو وەك سەرۆکی وەزیران دەست نیشان بکەم. سەرئەنجام ئەم پۆستەم سپارد بە ئەمینی. دەنگۆیەك هەیە کە کەندی بۆهاندانی من یارمەتییەکی ٣٥ ملیۆن دۆلاری پێشنیار کردبوو بەمن. ئەم دەنگۆیە بەتەواوەتی بێ بنەمایە چوونکە ئەوە ئەمینی بوو کەپاش گەیشتنی بەسەرۆکایەتی وەزیران ئەم پارەی لە ئەمریکا وەرگرت. بەڵام ئەو ئەوەندە کارەکانی خراپ بەڕێوە برد کەزۆری پێنەچوو ناچاربوو بۆ ٦٠ ملیۆن دۆلاری دیکە دەست بۆ ئەمریکا درێژ بکاتەوە، بەڵام ئەوان نەیاندا.

پاش سەرنەکەوتنی ئەمینی، زنجیرەیەك چاکسازیم جێبەجێ کرد کەبە" شۆرشی سپی " ناسراو بۆ ماوەی دەساڵ رۆژئاوا دەستی لە دنەدانی دژی شا هەڵگرت. بەم حاڵەش، پاش گەمارۆ خستنە سەر هەناردەکردنی نەوت لە ئێراندا لە ساڵی ١٩٧٣داو بڕیاری من بۆ بردنەسەرەوەی نرخی نەوت لە جیهاندا، ئەم دنەدانانە بە شێوەیەکی چڕوپڕتر دەستی پێکردەوە. لە سەرانسەری ساڵانی حەفتادا دژایەتی زیادی کردو لە کۆتاییدا گەیشت بە یەکگرتنێکی شووم کە پێکهاتبوون لە : کۆنسێرسیومی نێونەتەوەیی نەوت، دەوڵەتانی بریتانیا و ئەمریکا، دەزگاکانی راگەیاندنی نێونەتەوەیی، کۆروکۆمەڵی کۆنەپەرستی مەزهەبی لە وڵاتەکەی خۆمدا، پاڵەپەستۆی بەردەوامی کۆمۆنیستەکان کە خزابونە ناو هەندێ لەدامەزراوەکانی ئێران. من باوەڕم وانییە کە یەکگرتنی ئەم هێزانە نیشانەی پیلانێکی دارێژراو بوو بەدژی من کەلەودا هەرکام لە بەشداران هاوکاری ئەوی تری دەکرد.

بەڵام بەئاشکرا دەبینرا کەهەر کام لەم هێزانە بۆ وەدەرنانی من لە گۆڕەپانەکە هۆکارێکی بۆ خۆی هەبوو. لە ماوەی ساڵی ١٩٧٨دا، کۆنسێرسیوم ئامادە نەبوو

ڕێکەوتننامەی کڕینی نەوت لە ئێران واژۆبکات. یەکدەنگی ئەوان لەم کارەدا گرنگییێکی لە رادەبەدەری هەبوو. من باوڕم وایە ئەوان پێشتر دەیانزانی کە بڕیارە لە کۆتاییەکانی ئەو ساڵەدا چی ڕووبدات. هەروەها باوڕم وایە کە ئەندامانی دەزگای کارتێر – بەتایبەتی لایەنگرانی مەك گاورن لە ئاستی دووەمی وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا– حەزیان دەکرد من لەگەڵ ئەم بەناو "کۆماری ئیسلامییە" نوێیە رازیو هاوڕا ببینن. ستراتیجی ئەوان، ئەگەر بەراستی وەها ستراتیجێکیان هەبێت، بە ڕواڵەت پشتی بەم گریمانە بەستووە کە ئیسلام دەتوانێت پێش بەفراوانخوازی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا بگرێت. سەرم سووڕدەمێنێت کە بە چ شتێك؟ دەزگاکانی راگەیاندنیش بەش بەحاڵی خۆیان لایان لەو کۆمەڵە لە چالاکانی ماڤ مرۆڤ کردەوە کە هەستی بەداخ بوونیان لە دەسەڵاتدارێتی من دەردەبڕیو پێداگرییان لە سەر ئەو چاکسازییانەی دەکرد کە دواتر دیتمان چ بەڵاو گرفتارییێکی لەگەڵ خۆی هێنا.

ئەگەر لە پشتی ئەم سەر لێ شێواویو کردەوە دژبەیەکانەی کە دۆستانو هاوپەیمانانم ئەنجامیان دا سیاسەتێکی تا ڕادەیەك یەکدەنگ دەبوو، بەڕای من، ئاسانتردەکرا لە هەمووی ئەمانە تێپەریت. تاچەند مانگێك باورم وابوو کە وەها نەخشەیەك لە گۆڕێدابووە.

زۆرجار، هەم پێش لە یاری تەلەفیزیونی بەرێز پارسونز و هەم کەمێك پاش ئەوەش، سەبارەت بە پرسی ئامانجو ئەو رێگای کە رۆژئاوا دەیگرێتە بەر بیرم کردوەتەوە بێ ئەوەی کە بە ئەنجامێکی ژیرانەو گونجاو وپەسەند بگەم. بە پێچەوانەی ئەم نیشانانە، بە ئاسانی ناتوانم باوڕبکەم کە بەڵاو گرفتاری ئێران تەنیا ئەنجامی بیرنەکردنەوە لە دوارۆژو سەرلێ شێواویو ناکۆکییەچارەسەر نەکراوەکانی ناودەوڵەتی ئەمریکا بووە. سەرەرای ئەمەش، شرۆڤەو لێکدانەوەی رابردوو و ئەو ڕووداوانەی کە پاش لە گرتنی بارمتەکان ڕوویان داوە، وای کردووەکە نەتوانم بیر لەئەنجامێکی دیکە بکەمەوە. چارەنووسی خۆم لەبەرچاو بگرن!

لە کۆتایی نۆڤامبری ١٩٧٩دا، ئەمریکا خوازیاری ئەوەبوو کەبە هەر نرخێك بووە ئەوێ بە جێ بێڵم‌و منیش زۆر حەزم دەکرد بڕۆم. لە بیست‌وحەوتی نۆڤامبردا پزیشکانی تیمارکەرم رایانگەیاند کەهەرچەند رواڵەتم نیشان دەدات کە پێویستە لە ژێر چاودێریدا بم، بەلام باری تەندروستیم بەرەوباشی دەچێت. دەمویست هەرچی زووتر بگەرێمەوە بۆ مەکزیك.

دوو رۆژدواتر، لە ٢٩ی نۆڤامبردا، مەکزیکییەکان رێگایەکی دیکەیان گرتەبەر: ڤیزایەکی نوێیان بەمن نەدا کەبتوانم بچمەوە بۆ ئەو وڵاتە. چەند کاتژمێر دواتر خورخەکاستنا دا وەزیری دەرەوە لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانی دا لە مەکزیکوسیتی بەفەرمی رایگەیاند کە گەڕانەوەی من دژ بەرژەوەندی بالای مەکزیکە. ئەو باسی ناوەرۆکی ئەم بەرژەوەندییە بالایەی نەکرد.

نووسراوەی ناو رۆژنامەکان دواتر ئاماژەیان بەوەدا کە کاربەدەستانی مەکزیکی لەوەی دەترسن کە هێرش بکرێتە سەر باڵوێزخانەکانیان لە رۆژهەلاتی ناڤین‌و ئەورووپادا.

ئەم پاساوهێنانەوە ئەوەندە جێگای پەسەند نەبوو. تا ئێستاش نازانم بۆچی مەکزیك وەها سیاسەتێکی گرتەبەر. ئەو نەوتە زۆرەی کە ئەوان هەیان بوو بەشی پێویستیەکانیانی دەکردو ئیتر پێویستی نەدەکرد ترسێك لە بەرهەمهێنەرانی رۆژهەلاتی ناڤین هەبێت. رەنگە ئەم دەولەتە هیوای وابووبێت کەلە کۆڕی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا دەورێکی سیاسی گرنگتر بگێڕێت‌و بوونی منیش لەوێ زیانی بە بەدیهاتنی ئەم هیوایە دەگەیاند. (بیستوومە کە کووبا پێشنیاری مامەڵەیەکی کردبوو لە سەرئەوەی کە مەکزیك پێش بە شا بگرێت تا کاسترۆ واز لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی کورسی ئەنجومەنی ئاسایش بهێنێت‌و لە بەرامبەردا لە چوونی مەکزیك بۆ ناو ئەنجومەنی ئاسایش پشتیوانی بکات. ئەم بیرۆکەیە ژیرییێکی پێوەدیارە. چونکە دواتر کووبا وازی لەم کێبڕکێیە هێناو مەکزیك هەڵبژێرا.)

دواتر چی رووی دا؟ سەبارەت بە رۆشتنم لە ئەمریکا شەڕێکم لەگەڵ دەزگای کارتێردا نەبوو، بەلام نەمدەتوانی جیا لە چەند شوێنێك نەبێت شوێنێکی دیکە

هەڵبژێرم. جگە لەو دوودڵییەی کەلە گەرانەوە بۆ میسر هەمبوو، ئەمریکاش حەزی بەم هەڵبژارنە نەدەکردو دەترسا کە بوونی من لەوێ زیان بە پەیوەندییەکانی سەرۆك ساداتو وڵاتانی عەرەب بگەیەنێت کەبێگومان رووداوەکانی دواتر نیشانی دا کەئەم ترسە لە جێی خۆیدانەبووە. دەمانتوانی بڕۆین بۆ پاناما یان بگەرینەوە بۆ باهاما، بەڵام هیچکامیان سەرەنج ڕاکێش نەبوون.

کاتمان کوشت. داوامان لە سویسو نەمسا کرد کە قبووڵمان بکەن، هەر دوو وڵامی رەتیان دایەوە، گەرچی پەیوەندیم لە گەل برۆنۆکرایسکی، راوێژکاری نەمسادا بەبەردەوامی زۆرباش بووو هەروەها لە مێژبوو کە لەسویسیشدا خانوویەکم هەبوو. سەبارەت بە ئەفریقای باشوورو بریتانیاش باسمان کرد. ماوەیەك پاش رۆشتنم لە ئێران ئاگادارکرام کە مارگارێت تاچێر دڵنیایی داوە کەئەگەر لە هەڵبژاردنی بەم نزیکانەی بریتانیادا سەر بکەوێت، ئەوا پەنابەری سیاسیمان پێدەدات. بەڵام پاش ئەوەی کەبوو بە سەرۆکی وەزیران، بە ئێمەیان گوت کە بۆ ئەو جوانو شایستە نییە رێگابدات ئێمە بڕۆین بۆ ئەو وڵاتە. دواتریش ئەم هەڵویستە هەرگیز گۆڕانی بەسەردانەهات.

بەداخەوە کۆشکی سپی رێگەچارەیەکی لە پێش دانایـن کە پێشتریش هەم بوو — بانگهێشتێك بۆ پاناما. ئەم پێشنیارەم لەگەڵ ناوەندی کاروبارەکانمدا باسکردو بڕیارمدا رۆبێت ئارمائو، وتەبێژی ئەمریکیم لەگەڵ بەرپرسی پاراستنم کە ئێرانی بوو بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر بنێرم بۆ پاناما. ئەوان سەردانی شوێنی حەوانەوەیەکیان کرد لە دوورگەی کونتادورا کەلەو کاتەدا شوێنێکی گونجاوبوو. ئارمائو بەنامەیەکی ژەنـڕاڵ توریخوسەوە گەڕایەوە کەلەودا بەڵێنی پێشوازیکردنێکی گەرمو گوڕی بە ئێمەدابوو.

پاش ئەوەی کەلە گەل کۆشکی سپی رێکەوتین، سەرۆك کارتێر تەلەفوونی کردو بەگەرمی هیوای بەختەوەری بۆ من خواست. ئەو بەڵێنی یاریدەدەرانی دووپات کردەوەو گوتی کە هەرکات بارودۆخێکی نائاسایی پێش بێت دیسان دەتوانم سەردانی ئەمریکا بکەم. ئەمە یەکەم جاربوو کە پاش ماڵاوایی کردن لە سەرۆك

کۆمار لە کۆتایی سەردانەکەیدا بۆ تاران لە سەرەتای ساڵی نوێی ١٩٧٨دا، لەگەڵی قسەم دەکرد.

بۆ کۆکردنەوەی کەل و پەلەکانمان تەنیا رۆژێك دەرفەتمان هەبوو. رۆژی هەینی ١٥ی دیسامبر پێش هەڵاتنی خۆر لە لایەن دەستەیەکی بچووك لە پاسەوانانەوە لە لەك لەند- ەوە بەرەو فرۆکەخانەی کیلی فیلد بەرێکراین. لەوێدا فرۆکەیەکی بارهەڵگری C٩ی هێزی ئاسمانی ئەمریکا چاوەڕێ بوو تا ئێمە بگەیەنێتە پاناما. کەمێك لە ٧ی بەیانی لای دابوو کە بەرێکەوتین. بەڵێنەکانی ئەمریکییەکان هێشتا لەگوێمدا دەزرنگایەوە.

حەوتووی یەکەمی مانەوەمان لە کونتادورا بە خۆشی تێپەری. ئەم شوێنە تۆزێك لە دوورگەی بەهەشت دەچوو. ماڵێکی چوار ژووری کەنارییان بۆمان تەرخان کردبوو کە هی لوئیسی باڵوێز بوو. ئەم دوورگەیە لە سی مایلی کەناری پاناما لە زەریای هێمن دا هەڵکەوتبوو. لە ماڵەکەی ئێمەوە دیمەنێکی جوانی کەناری زەریاکە سەرەنجی رادەکێشا. گەرما و شێی ئەوێ بۆ گەرووم کەلە ئاکامی دەرمانکردنی بە رادیۆم ئازاری هەبوو، زۆرباش بوو. لەگەڵ چەند کەس لەسەرکردەکانی پانامادا چاوپێکەوتنم هەبوو: سەرۆك روویۆ هات بۆ سەردانم و بە زۆریش ژەنراڵ توریخوس بۆ خواردنی نیوە رۆژە لەو دوورگەیە دا دەبووە میوانمان.

دیڤیدفراست شاندێکی تەلەفیزیۆنی هێنا بۆ دوورگەکە بۆ وتووێژێك کە چەند مانگ پێشتر لە مەکزیك دا لە سەری رێکەوتبووین. لە ململانێ و وورووژاندنێکی هزری کەلەم وتووێژەدا هەبوو چێژم وەرگرت. لەماوەی ئە ساڵانەدا هەمیشە لە مشتومڕی دۆستانە لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندندا چێژم وەرگرتووە. زۆر کەم بوون ئەو هەواڵنێرانەی دەزگاگەورەکانی راگەیاندن کەماوەیەك لەتاران دا بوو بێتن و نەیان توانی بێت لەگەڵ من وتووێژێك بکەن. وتووێژ لەگەڵ رۆژنامەنووسانی دەرەکی، بەدەر لەوەی کە پرسیارەکانیان چەندە ناحەزانەو نەیارانە بوو، هەمیشە

ئـەو دەرفەتـەی بـۆ مـن دەڕەخـساند کـە بۆچـوونەکانی خـۆم سـەبارەت بـە پرسەگرنگەکان بخەمەڕوو.

هـەروەها، چـاوپێکەوتن و مـشتومڕ بـیری مـرۆڤ تیـژدەکات و یارمـەتی دەدات تـا ڕوانگەو بۆچوونە کانی خۆی پوختەبکات. فراست وتوویژکارێکی کارامەیە. زۆر بەباشـی خـۆی ئامـادە کردبـوو، زانیـاری زۆری دەربـارەی ئێـران هـەبوو وتوویژکردنەکەیشی چێژی بەخشی بەمن.

زۆربەی ئەوکەسانەی کەلەدەزگاکانی ڕاگەیاندنـەوە دەهـاتن، سـەبارەت بەو شتەی کە ئێران دەبێت ببێت، نـە ئەوشتەی کە بووەو دەیویست ببێـت، کۆمـەلێك شتی داڕێژراویان لـە مێشکدا بوو. ئێران لـە ناکاو لـەناخی سـەدەکانی ناوەڕاستەوە بـۆ ناودونیـای تـەکنۆلوجیای ئـەمڕۆیی پـاڵی پێوەنرابـوو. بـەراوردکردنی میللـەتێکی بـەمجۆرە لەگـەڵ ئـەو وڵاتانـەی کـە چـەند سـەدە نـەریتی دیمۆکراسـیات ئـەزموون کردوەومێـژوویان لێـوان لێـوە لـە زانـست و خویندن ونووسـین، وەك بـەراوردکردنی سـێوو پرتەقاڵـە. بـەهیچ جـۆر بـۆ بـەراوردکردنی ناشـێن. وڵام نەدانـەوە بـە پرسەئاڵۆزەکان باشترە لە وڵامە فریو کارانەکان.

مێژووی پاش شەڕی ئەمریکا دەربڕی داخوازی بەردەوام بووە لە باقی دانیشتوانی جیهـان بـۆ لاسـایی کردنـەوەی ئـەو وڵاتـە، بـێ ئـەوەی کـە هەلومـەرجی مێـژوویی و رامیـاری و ئـابووری و جڤـاکی هـەر میللـەتێك لەبەرچـاوبگیرێت. نموونـەی ڤیتنـام هێـشتا بیرمـی مـژولکردوە. بـە پێـچەوانەی فەرەنـسیەکان، کەبـە پێـی ئـەقڵ لـە پرسـەکانیان دەڕوانـی، ئـەمریکا ویستی لـە ڤیتنـام دا میللـەتێکی نـوێ لـە بیـچمی خـۆی دروسـت بکـات. کاتێـك نگـودین دیـم ئامادەنـەبوو ڕێبـازی خـۆی بـە پێـی ئـارەزوویکی نـاروون بگۆڕێـت، کـە ڕۆژنامەنووسـانێکی گـەنج و دەمـارگیری وەك دیڤیدهاسترام بانگەشەیان بۆدەکرد، دەسەڵاتی ئەمریکا بڕیاری کوشتنی دیمی دا.

پێویـستە بوترێـت کـە ئـەو لـەو ڕۆژەی دا کـە مـرد، دەورێکـی سـەرەکی هـەبوو لـە هێـرش کـردن بۆسـەر کۆمۆنیـستەکان، بـەڵام ڕۆژی دواتـر دەسـت پێـشکەری چالاکییەکان کەوتەدەست ویت کۆنگ و ڤیتنامی باکوور. بە درێژایی پازدەساڵی

پاش بەسەرهاتەکە، ئەمریکییەکان و باشوورییەکانی ڤیتنام هەرگیز نەیان توانی لە چالاکییەکاندا دەست پێشخەری بکەن.

لە رۆژی ١٢ی جەنیوەری دا، کاربەدەستانی نوێی ئێران قۆناغی دوەمی شەڕی بێ بەزەییانەیان لە دژی من و مێژوو دەسپێکردو داوایان لە دەوڵەتی پاناماکرد کەمن دەسبەسەربکات ئەم رەفتارە منی سەرسام نەکرد بەلاّم دوودڵی خانەخوێکانم تووشی سەرسووڕمانی کردم. بەرپرسانی پانامایی لە جیاتی ئەوەی کە وەلاّمێکی نەرێنی شیاو بەم داواکارییە بدەنەوە، پەرەیان بەم دەنگۆیە داکە لەگەڵ تاران لە پەیوەندیدان و وتوویژ دەکەن تا رێوشوێنێکی باشتر بگرنەبەر لەوەی کە رێکخراوی نەتەوەکان پێشنیاری کردوە. دەیان ویست من لە گەل بارمتەکان بگۆڕنەوە. ئەمە سەرەتای یارییێکی دوولایەنەی شووم و سەرسووڕهێنەر بوو. چونکە هاوکات لەگەڵ بلاّوبوونەوەی ئەم چیرۆکانە، پانامایییەکان گورج ئێمەیان دڵنیاکردەوە — بەنهێنی— کە هیچ رێگایەك بۆ ناردنەوەی من نییە، لەبەر ئەوەی وەها ناردنەوەیەك پێشێل کردنی یاساکانی پانامایە. حەوتوویەك پاش وتووێژی من و فراست، قوتب زادە درۆیەکی دیکەی بلاّوکردەوە. ئەو رایگەیاند کەمن لەماڵەوە لە پاناما لەژێرچاودێری دام. لە ٢٤ی جەنیوەری دا دەوڵەتی پاناما بە فەرمی ئەم شتەی بە درۆخستەوە، بەلاّم لە ماوەی رۆژانی دواتردا سەبارەت بەم درۆخستنەوە بە دوودڵی و ناروون قسەی کرد. لە رۆژنامەکاندا باسێك لە بارەی "ئەگەری تەکنیکی" ناردنەوەی من نووسرا، بەلاّم دیسان بە شێوەی تایبەتی ئێمەیان دڵنیاکردەوە کە بایەخێك بەم نووسراوانە نەدەین.

لە مانگی فیبریوەریشدا ئەم یارییە بێ بەزەییانە بەردەوام بوو. لە ٧ی فیبریوەریدا وەزیری کاروباری دەرەوەی پاناما گوتی کە : من "بەکردەوە" لە زیندان دام، لەبەر ئەوە بێ رەزامەندی پاناما ناتوانم لە دوورگەی کونتادورا بچمەدەرەوە. بەرەبەرە راستەوخۆو ناراستەخۆ پاڵەپەستۆی دەوڵەت زیاددەبوو. وادیار بوو ئەو نزیکەی ٢٥ کەسەی ئاسایشی پاناما کە پانتۆڵی جین و تیشێرتی رەنگاورەنگیان لەبەردابوو وچەکی ئێم-١٦و یووزی یان پێبوو، لە جیاتی ئەوەی پارێزگارو

ئاگادار بن، چاودێری ئێمەن. کەسانی دەوروبەرم بۆیان دەرکەوت کە هاوکات لەگەڵ بیّ شەرمانە گوێگرتن لە تەلەفوونەکانمان، چاودێری کردنی پاراستنی ئێمەش کەم دەبێتەوە.

جارێك، لە کاتێکدا کە یەکێك لە ئەفسەرەکان بە تەلەفوون سەبارەت بە تێچووی گرانی مانەوەمان قسەی دەکرد دەنگێکی نەناسراو قسەکەی پێبڕی‌و ناڕەزایەتی نیشان دا کەنابێت زیاد لە پێویست وردەکارییەکانی تایبەت بە پارە لە تەلەفوونەوە ئاشکرا بکرێت. سەرئەنجام دەنگ تۆمارکەرێکی شەش سەد دۆلارییان- کەناچارکراین پارەکەیشی بدەین- لە ماڵەکەماندا دانا بۆئەوەی وتووێژە تەلەفوونیەکانمان تۆماربکات. پاڵەپەستۆئابوورییەکانیش ئەوەندە ڕێك‌وپێکییان تێدا نەبوو. ئەندامانی ناوەندەکەم لە بەرزبوونی ئەو تێچوو و خەرجیانەی کە داوایان دەکرد سکاڵایان بوو و دۆستانی ژەنڕاڵ توریخوسیش بەمنیان دەگوت کە فلان دوورگە بۆ فرۆشتنەو نرخەکەی دەملیۆن دۆلارە. ڕاست وەك ئەوکاتەی کە لە باهامادا بووین، ماڵ‌و سامانێك یان بە ئێمە نیشان دەدا بەنرخێکی چەندقات، بەڵام شتێك کەبۆ ئێمە باش‌و گونجاو بێت نەبوو بۆ فرۆش.

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هەستم بەو هەوڵانەی دەکرد کەلە گۆڕێدابوون بۆ ئەوەی من لە باقیی دونیا دابڕێن. هەم کۆشکی سپی‌و هەم توریخۆس دڵنیاییان بە ناوەندەکەم دابوو کە ئێمە ناخەنە داوی فریوکاران. توریخوس بە بۆنەی پێڕاگەیشتن بە سکاڵاکانی ئێمە کەوتبووە زەحمەت. کاتێك هامڕاکانم لە بەرزبوونی نرخەکان سکاڵایان کرد، کۆشکی سپی بە ڵێنی دا لەم کێشەیە بکۆڵێتەوە بەڵام هیچکات جێبەجیّ نەکرد.

جارێك بۆچاوپێکەوتنێکی نهێنی لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا ڕۆشتم بۆ پاناماسیتی بۆ ئەوەی پەیامی سەرۆك کارتێرم پێڕابگەیەنێت. ڕاوێژکارەکەم، ڕۆبێرت ئارمائۆ دەیویست لەگەڵ مندا بێت بۆ پایتەخت، بەڵام کاربەدەستانی پانامایی نەیانهێشت. پەیامە کەی کارتێر دەتوانین بڵێین مانایەکی نەبوو. بەمنی وتبوو کەخەمم نەبێت، ئیشەکان بەباشی دەروات‌و دروست دەبێت.

بەڵام هیچ شتێك دروست نەبوو. پاڵەپەستۆ بۆ سەرکارگێڕانی ئەمریکیم زیادی کرد. کاربەدەستانی پانامائەوانیان تۆمەتبارکرد کە هەواڵی ناراستیان داوە بە ڕۆژنامە کانی ئەمریکا. بەڵام ئەوان شتێکیان بۆ وتن نەبوو. هەرچەشنە چیرۆکێك لە بارەی منەوە پێدەچوو لەلایەن بەرپرسانی فەرمی دەوڵەتی ئەمریکاوە بڵاوبکرێتەوە. بەمجۆرە بوو کە کاتێك سکاڵامان لە بەرزبوونی نرخەکان کرد، لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا چیرۆکێکی دوورو درێژ سەبارەت بە ئۆگری من بۆ گەڕانەوە بۆ ئەمریکا بڵاوکرایەوە. بێگومان من وەها بەرنامەیەکم نەبوو، ئەویش پاش ئەم ئەزموونانەی دوایم لە ئەمریکا. بەڵام ڕۆژنامەکان بەردەوام بوون لە سەر بڵاوکردنەوەی درۆو دەلەسەکانیان‌و خانەخۆییانی پانامایش هێدی هێدی تەنگیان پێمان هەڵدەچنی. بەرەبەرە ڕوون دەبووەوە کە ئیتر پاناما ناتوانێت پەناگەیەکی هەمیشەیی بێت.

دەوڵەتی پاناما بەردەوام بوو لە سەر یاریی ناردنەوەی ئێمە بۆ ئێران. دووپارێزەری دانیشتووی پاریس، یەکیان فەرەنسی‌و ئەوی تریان ئەرجەنتینی لە لایەن ڕژیمی تازەوە بە کرێگیرابوون تا کاروباری یاسایی ناردنەوەی من جێبەجێی بکەن. ئەوان نووسراوێکی ٤٥٠ لاپەڕەییان ئامادەکردو چواردەوری دونیا گەڕان هەتا بۆ بەڵگە نامەیەك کەمایەی پێکەنین بوو لە دادگای هەر وڵاتێکی پێشکەوتوودا، پشتیوانی خەڵکانی تر ڕاکێشن. بەم حاڵەش، ڕوون نەبوو کە پانامابییەکان ئەم تۆمەتانە بە ئاسانی ڕەت بکەنەوە. پارێزەرەپانامابییەکەی ئێران بەڵگەی دەهێنایەوە کە ئەگەر دەوڵەتی تاران بەڵێن بدات من ئێعدام نەکات ناردنەوەی من کێشەیەك نییە.

لە سەرەتای مارس دا، یەکێك لە ئەفسەرانی ئەمریکیم بە هۆی کاربەدەستانی پانامابییەوە دەسبەرکرا و چەند کاتژمێرێك لە زینداندا مایەوە، سەرئەنجام بە هۆی پاڵەپەستۆی باڵوێزخانە ئەمریکاوە ئازادکرا.

ئەویان بە دەستێوەردان لە کاروباری هێزی ئاسایشی پاناما تۆمەتبارکردبوو. لە ڕاستیدا کاربەدەستان لە پێداگری مورس لەسەرسکاڵاکانی دژی گرانی‌و خەرجی

زیاتر نووسین تووڕەبوون. بەمجۆرە، پاش دەسبەسەرکرانی مورس، نیگەرانی ئەوەبووم کە نەوەک نەتوانم لە کاتی خۆیدالە پاناما بڕۆم.
نەخۆشییەکەم چارەنووسی گۆڕی. لە مانگی فیبریوەریدا شێرپەنجە دیسان سەری هەڵدایەوەو سپڵمی گرتەبەر. دوکتورکین بۆ پشکنینی منو راوێژکردن لەگەڵ دوکتور فلاندێرن، پزیشکی فەرەنسیم، چەندجار لە نیویورکەوە هات بۆ پاناما. هەردووکیان نەشتەرگەرییان بەباش زانیو پێشنیاریان کرد کە پزیشکی بەناوبانگ دوکتورمایکل دوبیگی نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانەی گورگاس لە پێگەیی سەربازیی ئەمریکا لە ناوچەی کانالْ ئەنجام بدات. پێویستە بڵێم کە پێشتر لە دانشتنێکدا کە لەنێوان ئەندامانی ناوەندەکەم لەگەڵ کاتلێرو جۆردەن لە لەک لەندا بەرێوەچوو، باسی نەشتەرگەری کردن بۆمن لەم شوێنەدا کرابوو. دیسان هەرایەکی دیکە سازبوو. وادیار بوو ئەمریکا دەیهەوێت نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانەی ئەمریکی پای تی یا ئەنجام بدرێت.
هەنگاوی دواتری ئەم شانۆسەرسوورهێنەرە لە زنجیرەیەکی تەلەفیزیونی پزیشکی دەچوو. لە سەرەتای مانگی مارس دا، دوکتور کینو ئارمائو لەگەڵ دوکتورگارسیا (پزیشکی تایبەتی ژەنراڵ توریخوسو پشکداری نەخۆشخانەی پای تی یا)و بەرپرسانی ناوەندی پزیشکی پای تی یا لە پاناماسیتی دا دانیشتنیان کرد. گارسیا پێداگربوو کە نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانەی پای تی یا ئەنجام بدرێت. دوکتورکین باوڕی وابوو کە کەلو پەلی پزیشکی ئەو نەخۆشخانەیە وەک پێویست نییەو ئێمە ئامێرێکی زۆرگرانبەهای جیاکەرەوەی خڕۆکەسوورەکانمان لە ئای بی ئێم کڕیوەو لە نەخۆشخانەی گورگاس دامان مەزراندووە.
پێویستە بە پەلە خوێن لە پای تی یاوە ببەین بۆ گورگاس بۆ ئەوەی خڕۆکەکانی جیابکەینەوە. دەنگی مشتومڕ بەرزبووەوە. پزیشکانی پانامایی بەدخوو بوونو زوو هەڵدەچوون. پیاوەکانم تێنەدە گەیشتن کە بۆچی پزیشکێک ڕێگا دەدات لە خۆبایی بوونی دڕۆینی نەتەوەپەرەستی لە سەروی لە بەرچاوگرتنی حاڵی نەخۆشەوە بێت. لێرەدا بوو کە دوکتور گارسیا بە راشکاوی رایگەیاند کە " ئێمە

لە فەرمانەکانی کارتێر پەیڕەوی دەکەین"، لە کاتێکدا کە ئەوان گرنگییێک بەوەنادەن ئێمەبیر لەچی دەکەینەوەو دەیانەوێت هەرچی کە دەڵێن ملکەچیان بین.
یەکێك لە ئەفسەرەکانم دواتر بە منی گوت کەلەکاتی باسکردن لە سەر یەکێك لە خاڵەکان، پێی وابوو کە پاسەوانانی پانامایی دەیانەوێت دەست بۆ چەك ببەن.
سەرئەنجام دوکتورگارسیا بەبڕیارێکی یەکجاری کۆتایی بەم باسە هێنا:" هەر ئەمەیە، رێگایەکی دیکەتان نییە. یان دەڕۆن بۆ پای تی یا، یان بۆ فڕۆکەخانە. پێویستە لە نەخۆشخانەکەی ئێمە کەڵك وەربگرن."
دەور وبەرەکەم لەم قسەیە تووڕەبوون بەڵام لەوکاتەدا هیچمان پێنەدەکرا. ئاشکرا بوو کەئەمریکا دەیهەوێت ئێمە لە پانامادا بهێڵێتەوە تا بەردەوام بێت لە سەر یارییەکەی لەگەڵ ئێراندا و لەمن وەك چەشتەیەك بۆ ئازادکردنی بارمتەکان کەڵك وەربگرێت. دەبوو وەك" زیندانییێکی خۆشەویستی ئەمریکا" لە دوورگەی جوانی کونتادورا دا بمێنمەوە.
لە ١١ی مارس دا بڕیارماندا ئەم نەشتەرگەرییە پێویستە ئەنجام بدەین. دوکتور دوبیکی رازی ببوو کە نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانەی پای تی یا ئەنجام بدات. رێوشوێنی پێویست بۆ گواستنەوەی هامڕاکانم لە کونتادوراوە بۆ پاناماسیتی گیرایەبەر. سێ کەس لە خوشکەکانم رۆشتن بۆ پاناما تالەگەڵم بن. رۆژی ١٤ی مارس لە نەخۆشخانەدا خەواندمیان.
کەمێك دواتر، دوکتور دوبیکی و دوکتور کین و تیمی پزیشکی ئەمریکییان هاتن. پاسەوانانی ئاسایش لە هاتنەناوەوەیان رێگرییان کرد. یەکێك لە پاسەوانەکان وتبووی :" ژەنڕاڵ توریخوس فەرمانی داوە کە هیچ پزیشکێکی ئەمریکی مافی نییە شا ببینێت. فەرمانیان بە ئێمە داوە." پزیشکانی سەرسووڕماوی ئەمریکی کەوتنە مشت ومڕ لەگەڵ سەربازەکان کەلە سەرەتادا بێ ئەنجام بوو.
سەرئەنجام سەرهەنگی بەرپرس رازی بوو کەلەگەڵ ژەنڕاڵ توریخوس دا قسەبکات. ئەم وتووێژە سپێردرا بە دوکتور گارسیا و ئەویش فەرمانی بە سەرهەنگ کرد رێگا بە ئەمریکییەکان بدات. قسەو باسێکی پڕ لەناکۆکی و

دوژمنانە بەڕپوەچوو. گارسیا لاساری دەکرد بێ ڕەوشت بوو. دەیگوت " هیچ پێویستییێکی " بەدەستەی پزیشکی ئەمریکی نییەو پزیشکانی پانامایی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییێك کەبە قسەی ئەو نەشتەرگەرییێکی سادە بوو،" بەتەواوەتی شیاو "ن. ئەوان دەیان گوت کە لابردنی سپڵ تەنیا چل خولەك ئیشی دەوێت، ئەمە نەشتەرگەرییێکی "ئاسایییە"و تەواوی ئەو پزیشکانەی کەلە نەخۆشخانەکەی ئەودا ئیش دەکەن" لە ئەمریکا فێرکراون"و زۆرێك لەوان لەناوەندی پزیشکی کورنێل کەلە ئۆکتوبەری ساڵی رابردوودا لەوێ چارەسەرم بۆ دەکرا، خولیان بینیوە. بە دوبیکی یان دەوت " نەشتەرگەری گەرۆك " کە "چەقۆ بەدەستیەوەیەو ئەم وڵاتو ئەو وڵات دەکات."

دوکتور دوبیکی تەنیا وڵامی دایەوە کە بێگومان لە زۆر وڵاتدا نەشتەرگەری کردووە بەڵام لە هیچ شوێنێك وەها رەفتارێکی دوژمنکارنەی بێ هۆی لە هاوکارانی پزیشکی نەبینیوە.

گارسیا و هاوکارەکانی ملیان نەدا. خۆهەڵکێشانو بەخۆنازینیان کەوتبووە مەترسییەوە. دەستیان هەڵنەدەگرت لە قسەیەك کە کردبوویان. نەشتەرگەری کردن بۆ من بەدەستی نەشتەرگەرانی ئەمریکی مەیسەر نەبوو، ئەمە دوا قسەیان بوو. گەرچی پزیشکانی پانامایی تا ئێرەی یارییەکە سەرنەکەوتبوونو راستە کە هەڵوێستی ئەوان بە شێتانە دەزانم، بەڵام رەفتارەکانیان سەرئەنجام بەقازانجی من تەواوبوو. تێگەیشتم کە ژیانم لێرە لە مەترسی دایەو ئامادەنەبووم بە هۆی پزیشکانێکی متمانە پێنەکراو و مام ناوەندەوە لە دەستی بدەم. دوکتوردوبیکیو دوکتور کین پاش راوێژکردن، بەئەنجام دانی نەشتەرگەری لە نەخۆشخانەی پای تی یا رازی نەبوونو گوتیان تۆزێك دواخستنی مەترسییێکی نییە. بەیانی رۆژی دواتر، نەخۆشخانەم بە جێ هێشتو گەڕامەوە بۆ کونتادورا.

باوڕم وایە کە ژەنراڵ توریخوس ئەم بڕیارەی منی بە شکستێکی گەورە بۆ خۆی زانیبوو هەستی خۆیشی بەو کەسانە نیشان دابوو کەببوونە هۆکاری ئەو شتە. لە ماوەی ٢٤کاتژمێردا زۆر پزیشکی پانامایی سەردانی دوبیکی یان کرد

لەهوتێلەکەی و لێی پاڕانەوە تا ڕاکەی بگۆڕێت. بەڵام ئیتر زۆر درەنگ بوو. ئامادە نەبووم ژیان و تەندروستیم بدەم بەدەست کەسانێکەوە کە خۆپەرستیان لە سەرویی ئاسوودەیی نەخۆشەوە دانابوو.

دوو ڕۆژ دواتر، لە ١٦ی مارس دا، لە شوێنێکەوە کە چاوەڕێ نەدەکرا دەروویەك کرایەوە: ڕۆژنامەی واشنگتۆن پۆست لەتەنیشت سەروتارەکەیەوە بابەتێکی هەبوو لە جۆرج ویڵ کەلەودا بە شێوەیەکی چڕدار باسی هەڵسوکەوتی پانامایییەکانی لەگەڵ هاوپەیمانێکی ئەمریکا کردبوو. چەند ڕۆژدواتر، دەسبەجێ پاش گەیشتنم بەمیسر، واڵستریت جۆرناڵیش وەك واشینگتۆن پۆست لەسەر وتارێکی دا بە پێنووسی سەر نووسەرەکەی - کەخەڵاتی پۆلیتزێری بە دەست هێنا- ڕێکەوتنەکانی لەك لەندی شیکردەوە. سەرئەنجام ئەمریکییەکان بە هەمووشتێکیان زانی.

پاشان بڕیارمدا بەخشینی پەنابەری لەلایەن سەرۆك ساداتەوە قبوول بکەم. بانگهێشتەکەی ئەو لەکاتی هاتنەدەرەوەم لە نیشتمانەوە وەك خۆی مابووەوە. ساڵانێکی زۆر بوو کەمن و سەرۆك سادات پێکەوە دۆست بووین. هەمیشە ئەوم بە دۆستێکی نەجیم و پیاوێکی بەشەرەف دەزانی. لەو ڕۆژە ناخۆشانەی دا کەبەسەر من و بنەماڵەکەمدا تێدەپەڕی، ئەو سیفەتەمرۆییانەی ئەو لەناخم دا بەتەواوەتی چەسپا. لەوماوەیدا کە لە پاناما بووم ئەوو هاوسەرەکەی دەتوانم بڵێم هەموو ڕۆژێك تەلەفوونیان دەکرد. پەیامەکەیان هەمیشە ئەمەبوو: کەنگێ دێن؟

لە ٢١ی مارس دا هامیلتۆن جۆردەن هات بۆ پاناما. هەر کە گەیشتە پاناما تەلەفوونی کرد و گوتی کە دەیهەوێت من ببینێت. ڕۆبێرت ئارمائۆی ڕاوێژکارم، بەناوبراوی گوت ئیتر زۆر درەنگەو ئێمە دەمانەوێت لە پاناما بڕوین. سەرئەنجام جۆردەن ڕۆشت بۆ ئەوێ چاوی بە ژەنڕاڵ توریخوس بکەوێت. هەر لەو کاتەدا تەلەفوونیش بۆ لویدکاتلێر دەکات و ئەویش لەگەڵ ئارنۆڵدرافێل، یەکێك لە یاریدەدەرانی پلەبەرزی وێنس (وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا) دێت بۆ پاناما. کاتلێر هەر کە گەیشتە پاناما تەلەفوونی کرد و پرسی کەئایا دەتوانێت بۆ

گەیاندنی پەیامی سەرۆك كارتێر سەردانی كونتادورا بكات. ئێمە رازی بووین، هەرچەند كەدەمزانی شابانوو لەگەڵ خانمی سادات دا قسەی كردووەو دوایین بانگهێشتی ئەویَ بۆ پەنابەری قبووڵ كردووە.

كاتێك كاتلێر گەیشت پێداگری كرد كەمن بەتەنیا ببینێت. هەرچەند حەزم نەدەكرد سەرئەنجام رازی بووم بە مەرجێكە رۆبێرت ئارمائۆ لە شوێنێكدا بمێنێتەوە كە دەگی ئێمە ببیسێت. پێشتر لەكاتی دانیشتنی لەك لەند دا كاتلێرم لە نزیكەوە دیبوو.

ئەوم بە پیاوێكی لە سەرخۆو پەسەندو بەتواناو پشت ئەستور بە خۆی لە رێگای دژواری وتووێژە دیپلۆماتیكەكاندا زانی. هەنووكە ئەو لە كونتادورا بە كارامەییو بەبیَ خۆشەویستیو رِق باروودۆخی ئەمریكای بۆمن شیدەكردەوە . دەیگوت كە رۆشتنی من بۆ میسر پێدەچێت باروودۆخی سەرۆك ساداتو لەگەڵ ئەویشدا تەواوی رەوتی ئاشتی لە رۆژهەلاتی ناڤیندا بخاتە مەترسییەوە. هەڵبەت لەهۆستون دا دەكرێت نەشتەرگەریم بۆ بكرێت. لەبەر ئەوە هەلومەرجی رێكەوتنی لەك لەند لەم بارەوە زۆر روونە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەمانە، وەها كارێك لەم باروودۆخەدا كە دانوستانی هەستیاری چارەسەركردنی قەیرانی بارمتەكان لە گۆڕێدایە دەتوانێت دانوستانەكان تووشی مەترسی بكات. لە روانگەی كارتێرەوە، باشترین رێگەچارە بۆمن، ئەوەیە كە هەر لەپانامادا بمێنمەوە. ئەو قانانەی كەدەیان دا خێرا روون دەبووەوە: نەشتەرگەرییە كە بێگومان لە نەخۆشخانەی ئەمریكی گورگاس دا ئەنجام دەدرێتو پزیشكانی پانامایش زۆر حەزدەكەن داوای لێبوردن لە دوكتور دوبیكی بكەن. قسەكانی كاتلێر هاندانێكی پێوەدیاربوو، بەڵام من بڕیاری خۆم دابوو. بەم حاڵەش رازی بووم لە پێشنیارەكانی كاتلێر بكۆڵمەوەو بەیانی رۆژی دواتر ناوبراو ببینم.

پێویست نەبوو زۆر بیربكەمەوە. لەماوەی یەك ساڵونیوی رابردوودا بەڵێنەكانی ئەمریكییەكان بایەخێكی ئەوتۆی نەبوو. تائێرە لەبەر پەیمانو بەڵێنەكانی ئەوان،

تاج و تەختەکەم لەدەست دابوو و ئەگەری ئەوە هەبوو بەردەوام بوونی ئەم متمانەیە بە قیمەتی گیانم تەواو بێت. بەیانی رۆژی دواتر، کاتێ کاتلێر گەڕایەوە بۆماڵەکەم بە دیتنی کەل وپەلی پێچراوەمان وڵامەکەی وەرگرتەوە. ئیتر هەوڵی نەدا ڕای من بگۆڕێت. لە بەرامبەردا لەگەڵ کۆشکی سپی قسەی کرد تائامادەکاری بۆ ڕۆشتنی ئێمە بکات. ئەو گوتی بە سەرەنجدان بەگرفتی سووتەمەنی گرتن و یاسا و ڕێسای فڕۆکە خانەکان، ئاقڵانەتر ئەوەیە کەلە فڕۆکەیەکی ئەمریکی دەربەست کەڵك وەرگیرێت و چاوەڕێی ئەو فڕۆکەی نەکەین کە سادات دەینێرێت. تەلەفوونی دیکەش کرا. کاتلێرو هاوکارانی توانییان فڕۆکەیەکی DC.١٠ بەکرێ بگرن. بڕیاربوو فڕۆکەکە ئێمە لە فڕۆکەخانەی نێونەتەوەیی پاناماسیتیەوە سواربکات.

هەر ئەوەی کە بڕیاری خۆم دا ڕەفتاری پاناماییەکانیش گۆڕا. زۆر زۆر یارمەتیان دا. ئێستا ئیتر پاسەوانانی پاراستن حەزیان دەکرد خزمەت بکەن. لە ڕوانگەی پزیشکییەوە کات بەنرخ بوو: تا– م کردبوو، ژمارەی خڕۆکە سوورەکانی خوێنم زۆر دابەزیبوو. ژمارەی گەردەکانی خوێنم لە سەدا دە لە ئاستی ئاسایی کەمتر ببووەوە. لەم ڕووەوە فڕین بە ئاسمانی زەریای ئەتڵەس دا دەیتوانی مەترسی دار بێت. چونکە ئەگەر لەو بەرزاییە زۆرەدا شوێنێکی لەشم بریندار ببوایێت پێدەچوو بەهۆی خوێنڕێژییەوە بمرم.

لەپاناماسیتی دا سواری فڕۆکەیەکی کۆنی DC.١٠بووین. گەشتێکی دوورو درێژو بەئازاربوو. لەگەڵ هەڵاتنی خۆر دا لە دوورگەکانی ئازوردا نیشتینەوە، ژەنراڵێکی پورتوگالی و کونسولی ئەمریکا لە فڕۆکەخانە ئامادەبوون. هەرچەند نەخۆش و تاو لەرزم هەبوو، لە شوێنەکەم هەستام و بۆ پێشوازی کردنیان خۆم ئامادەکرد. سەرئەنجام لەقاهیرەدا نیشتینەوە. سەرۆك سادات و خاتوون لە ژێرگەرمای هەتاودا چاوەڕێی پێشوازیکردن لە ئێمە بوون. گاردی ڕێزلێنان لە پشت سەری سادات دا ریزیان بەستبوو، دەمزانی کەبە چ ڕێزلێنانێکی سەربازییەوە پێشوازیم لێدەکەن.

وەك لە خۆبایی بووان بەرەو سادات و خاتون رۆشتم و بەگەرمی لە ئامێزیانم گرت.

سادات بە ئینگلیزی گوتی:" سوپاس بۆ خواکەلە ئاسایش دایت."و منیش بەڕاستی هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. لە فڕۆکەخانەوە بە هێلیکۆپتێر ڕۆشتین بەرەو نەخۆشخانەی سەربازیی معادی هەڵکەوتوو لە کەناری نیل لە دەور و بەری قاهیرە. پزیشکان خێرادەست بەکاربوون بۆ ئەوەی تاکەم دابەزێنن و ژمارەی خرۆکەکانی خوێنم زیادبکەن. چەند رۆژدواتر دوکتوردوبیکی و تیمی پزیشکانی خۆی بە کەل و پەلی پێشکەوتووەوە گەیشتنە قاهیرە. پێویست بوو خێرا نەشتەرگەرییەکە ئەنجام بدرێت. ئەو وێنانەی کەبە تیشك گیران نیشانیدا کە سپڵم بەشێوەیەکی ترسناك گەورە بووەتەوە.

لە ٢٨ ی مارس دا نەشتەرگەرییەکە کرا. سپڵی شێرپەنجەلێدراو کێشەکەی گەیشتبووە چوار پۆند ونیو و بەقەی تۆپێکی گەورەی فوت بۆڵی لێهاتبوو. سپڵ لە باری سرۆشتی دا بەقەی مشتی مرۆڤێك دەبێت.

کاتێك وەك پێویست حاڵم هاتەوە سەرخۆم و توانیم لە نەخۆشخانە بێمە دەرەوە، گەڕامەوە بۆ ناو بنەماڵەکەم بۆ کۆشکی قوبە لە شەش مایلی باکووری قاهیرەدا. ئەم کۆشکە شوێنی پێشوازیکردن لە سەرکردەی ئەو وڵاتانەیە کەسەردانی میسر دەکەن. کۆشکەکە لەناو پارکێکی گەورە و چوارلاگیراوی پڕ لە باخچەو داری میوەدا هەڵکەوتووە و بەتەواوەتی پارێزراوە.

ئێستا بۆ یەکەم جار لەو کاتەی کە لە ئێرانەوە رۆشتووم، ئەم خانووەجوانە، ئارامی و ئاسایش بۆ ئێمە دابین دەکات. جوانیی ئارامییەکەی لە سەردەمی بەرەو چاکە چوونمدا توانایی پێم بەخشیوە. پاش ئەو ماوەیەی کەلە مەکزیکدا بووم، وەها دەرفەتێکم بۆ بیرکردنەوەو تێفکرین دەست نەکەوتووە.

بێگومان بیرم بەلای ڕووداوەکانی ئێستا و رابردووی نیشتمانەکەمەوەیە. تا ئێستاش باوڕم وایە کە ئێران دەبێت بە خێرایی لەو گەندەڵی و زەبوونییەی کە بەهۆی پێکهاتەیەکی سەرەتایی جڤاکی و ئابوورییەوە پەیدابووە بەرەو ریزی

پێشەوەی پێشکەوتنی پیشەسازی هەنگاو هەڵبگرێت. پێویستە وڵاتەکەی من تا کۆتایی ئەم سەدەیە ئەم پلەیە بەدەست بێنێت. چونکە تا ساڵی ٢٠٠٠ سەرچاوەنەوتییەکانمان چۆڕی لێدەبڕێت. پێدەچێت زۆر بە خێرایی بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەنگاوم هەڵگرتبێت. بەلاّم چارەیەکی ئەوتۆم نەبوو. بێ گومان لەم ڕێگەدا هەلەگەلێك ڕووی داوە بەلاّم ناتوانم خۆم رازی بکەم کەئەم هەلاّنە بوونەتە هۆکاری ڕووخاندنم. ئەگەر هاوپەیمانەکانم تۆزێك پشوودرێژیو پشتیوانیان نیشان دەدا. دەمتوانی ئەم هەلاّنە ڕاست بکەمەوە. نیشتمانەکەم لە بەرەبەری گەیشتن بە شارستانیەتێکی مەزن دابوو، بەلاّم دەرکەوت کە هێزەنەیارەکانم بەهێزترن. پێدەچێت شکستی هەوڵەکانی ئێران بۆ چوونە ناو سەدەی بیست نیشانەی شکستی گەورەتر بۆ ئەو وڵاتانەی بێت کەمن ئەوانم بە دۆستو هاوپەیمانی خۆم دەزانی .

*********



# پاسخ به تاریخ

ئێستا زیاتر لەساڵێك بەسەر بڵاوبوونەوەی دوایین کتێبم دا لەتاران تێدەپەڕێت. کتێبێك لێوان لێو لەهیوا، کەلەودا بڕواوبۆچوون وئامانجەکانی خۆم دەربارەی داهاتووی خەڵکی ئێران دەربڕی بوو. داهاتووێك کە هیوادار بووم تائەو جێگای کەدەکرێ بەختەوەرو دوارۆژ روون و پرشنگداربێت و شیاوی وڵاتێك بێت کەبە رابردووی چەند هەزارساڵەیەوە،بەردەوام یەکێك لەبنیاتنەرانی سەرەکی شارستانیەتی جیهانی بووە.

لە "پێشەکی کتێبەکەوە"




نرخ(٧٠٠٠) دینار

چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر